ناوی کتێب: هایدیگەر و شۆڕشێکی فەلسەفی

نووسینی:  د. محەمەد کەمال

بابەت: لێکۆڵینەوەی فەلسەفی

تیراژ:  ١٥٠٠ دانە

نرخ: ٤٠٠٠ دینار

ژمارەی سپاردن: ٥٢٥ ی ٢٠٠٧

چاپخانەی: دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپی : یەکەم ساڵی ٢٠٠٧

کوردستان -سلێمانی

www.sardamco.com

# Heidegger and the Philosophical Revolt

# هایدیگەر و شۆڕشێکی فەلسەفی

د. محەمەد کەمال

# هایدیگەر و
# شۆڕشێکی فەلسەفی

**Heidegger and the Philosophical Revolt**

سلێمانی ٢٠٠٧

**زنجیرەی کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم**
**کتێبی سەردەم ژمارە ( ٣٩٩ )**

**سەرپەرشتیاری گشتیی زنجیرە**
ئازاد بەرزنجی

پێشکەشە بە باوکم،
ئەو مامۆستایەی یەکەمجار پەنجەکانمی
فێری قەڵەم گرتن کرد.

دکتۆر محەمەد کەمال پسپۆری فەلسەفەی (هیگڵ) ە. ئێستا مامۆستای فەلسەفەی ڕۆژهەڵاتە لەبەشی خوێندنی ئاسیایی لەزانکۆی مالبۆرن. بە زمانی کوردی و ئینگلیزی دەنوسێت. محەمەد کەمال چوار پەڕتووکی بە زمانی ئینگلیزی و ئەم پەرتووکانەشی بەکوردی لەسەر فەلسەفە نوسیوە.

- ئۆنتۆلۆجی بنەرەتی و بوونی مرۆڤ (٢٠٠١)
- فەلسەفەی هیگڵ (٢٠٠١ )
- کێشەی بوون لەمێژووی فەلسەفەدا(٢٠٠٣)
- فەلسەفەی سارتەر و خوێندنەوەیەکی نوێ(٢٠٠٣)
- بوون و داهێنان (٢٠٠٤ )
- گفتوگۆیەک لەگەڵ مارتن هایدیگەر0.– وەرگێڕان(٢٠٠٥)
- نیهێلیزم و ڕەهەندەکانی بیرکردنەوە (٢٠٠٥ )
- نیتشە و پاش تازەگەری (٢٠٠٦ )



# سەرەتا

ئاوڕدانەوەیەک لە گەشەکردن و پەرەسەندنی بیرکردنەوەی فەلسەفی سەردەمەکەمان ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکات، کە مارتن هایدیگەر کاریگەرێتی بەسەرەوە هەیە و گۆڕانکاری بنەڕەتی تێدا دروستکردووە. لەپڕۆژەی ئەم نوسراوەدا لەسەر ئەو کاریگەرێتی و گۆڕانکارییە بنەڕەتیانە دواوم و بەشۆڕشێکی فەلسەفی دامناون. مەبەست لەشۆڕش، بەگشتی و لە فەلسەفەشدا بەتایبەتی، گۆڕانکاری بنەڕەتییە، کە لەگەڵ خۆیدا ناوەڕۆکی بیرکردنەوە فەلسەفیەکە دەگۆڕێ و مێژووی بیر بە قۆناخێکی نوێتر و پێشکەوتوتر دەگەیەنێت. ئەگەر بیرکردنەوەیەکی فەلسەفی نوێ گۆرانکارییە بنەڕەتیەکانی نەهێنابە کایەوە، هەرچەندە نوێش بێت، ئەوا نەیتوانیوە شۆڕشێک بەسەر نەریتی زاڵبوی بیرکردنەوەدا بکات و سەرەتای قۆناخێکی نوێترمان بۆ دیاریبکات. شۆڕشی فەلسەفیانە لەسەردەمەکەماندا پێویستیەکی مێژووییە. لەلایەکەوە ڕاستی بوون لەبیرچۆتەوەو مێتافیزیکی هیچگەرایەتی لەئەفلاتونەوە تاکو ئەمڕۆ(بوون) ی بە(هیچ) داناوەو پەنای بۆ(هەبوو) یەک بردووە، کە ئەم هەبووەش ئۆنتۆلۆجیانە لەسەر (بوون) ڕادەوەستێت و نابێت بە بنەڕەتێکی مێتافیزیکی. لەلایەکی دیکەوە، دەستەڵاتی توێژینەوە و گەڕان بەدوای واتای بووندا دراوەتە دەست زانستەکان و ڕۆڵی گرنگی فەلسەفە نەماوە. ئەم دوو هەڵوێستەی بیرکردنەوەی سەردەم، کە مێتافیزیکی

هیچگەرایەتی(کلاسیکی) وەریگرتوە و دوایش سەرهەڵدانی تەکنەلۆجیا لەئاکامی دەستەڵات وەرگرتن لەلایەن زانستەکانەوە، هۆکارن بۆ نامۆبوونی بیرکردنەوە لەراستی بوون و خزاندنی بوون و مرۆڤیش لەنێو چوارچێوەی وەبەرهێناندا. مرۆڤی سەردەم، لەنێو تۆڕی کایەکانی مێتافیزیکی هیچگەرایەتی و تەکنەلۆجیادا نامۆ کراوە و بووە بەکەلوپەل و سامان بۆ وەبەرهێنان. ئەمەش دەبێتە زاگەی پێویستی بۆ شۆڕشێکی فەلسەفی و کۆتاییهێنان بە تازەگەرایەتی و کردنەوەی بوارەکانی بیرکردنەوە و خۆئامادەکردن بۆ قۆناخیکی نوێ. بەبیروڕای من، بیرکردنەوەی فەلسەفی هایدیگەر شۆڕشێکی فەلسەفیە بۆ ڕەتدانەوە و ڕەتکردنی قۆناخی نامۆبوون و گە ڕانەوە بەرەو مزڵگەی ڕەسەنایەتی و بیرکردنەوەی داهێنەرانە. ڕێگەچارەیە بۆ لەناوبردنی دەستەڵاتی چەوسێنەرانەی تەکنەلۆجیا و هەڵوەشاندنەوەی بنەما مێتافیزیکیەکەی.

مارتن هایدیگەر ڕۆژی ٢٦ ی مانگی نۆ ی ١٨٨٩ لەشاری مێسکرش Messkirch لە ئەڵمانیا لەدایکبووە. لەتەمەنی چواردەساڵیدا خراوەتە بەر خوێندنی ئایینی و پەروەردەکراوە تاکو ببێت بە کەشیش. بەڕێکەوت پەرتووکەکەی فرانز برینتانۆ لەسەرکێشەی بوون لە فەلسەفەی ئەریستۆدا دەبینێ و پاش خوێندنەوەی بەرەوجیهانی فەلسەفە ڕێدەکات. لەزانکۆی فرایبۆرگ لەساڵی ١٩١٣ دا لەژێر سەرپەرشتیکردنی ئارتەر شنایدەر، سەرۆکی بەشی فەلسەفەی زانکۆی فرایبۆرگ دکتۆراکەی



وەردەگرێت و لەزانکۆی ماربۆرگ دادەمەزریت و پاش خانەنشینکردنی ئەدمۆند هوسرڵی فەیلەسوف و هاوڕێی هایدیگەر، لە فرایبۆرگ، هوسرڵ داوا لەزانکۆ دەکات هایدیگەر بخەنە جێگەی. لەساڵی ١٩٢٩ تاکو ئەو ڕۆژەی خانەنشین دەکرێت لەم زانکۆیە دادەمەزرێت. هایدیگەر زۆری نوسیوە و کەمی بڵاوکردۆتەوە. یەکێک لەونوسراوانەی لەساڵی ١٩٢٧ دا بڵاویکردەوە و ئەمڕۆ بە شاکارێکی فەلسەفی دادەنرێت و یارو نایاری بۆ هایدیگەر پەیداکردوە پەڕتووکەکەیەتی بە ناوی (بوون و کات). من لەنیوەی یەکەمی ئەم پرۆژەیەدا بەدرێژی بۆچوونەکانی هایدیگەرم لەم پەڕتووکەیدا باسکردووە و مامەڵەم لەگەڵ کێشە فەلسەفیەکانیدا کردووە. لێرەوە ئاماژەم بۆ ئەو خاڵە کردووە، کە ئەمڕۆ هایدیگەر ناسەکان باسی دوو هایدیگەر دەکەن و لەگەڵ چاپدانی (بوون وکات) دا جۆرێک بیرکردنەوەی فەلسەفی و قۆناخی دوای (بوون و کات) جۆرێکی دیکەی بیری هایدیگەر دەردەخات. گۆڕانکارییەکەش بە(وەرگێڕان) ناوزەدە کراوە و لەنیوەی دووەمی ئەم پرۆژەیەدا ڕوونمکردۆتەوە. نوسراوەکانی هایدیگەر، ئەمڕۆ، ئەوانەی لەچاپدراون لە (٦٦) بەرگدا کۆکراونەتەوە. زۆریشیان وەرگێڕاون بۆ سەر زمانەکانی دیکە. نامەکانیشی بۆ کارڵ یاسپەرز و هانا ئارنت لەچاپدراون. ساڵێکیش لەمەوبەر نامەکانی نێوان هایدیگەر و هاوسەرەکەی (ئەلفریدە پێتری) بڵاوکرانەوە، کە گەلێک لایەنی ژیانی هایدیگەر، بەتایبەتی پەیوەندییەکەی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا ڕووندەکەنەوە.

لەم توێژینەوەیەدا سودم لە نوسراوەکانی هایدیگەر و نوسراویش لەسەرهایدیگەر وەرگرتوە. هەوڵمداوە بیرکردنەوە و زمانی فەلسەفی هایدیگەر، کە زۆر لەتوێژەرەکان بەدژواری دادەنێن، بەجۆرێک روونیانبکەمەوە خوێنەری کورد بتوانێت تێیانبگات. هایدیگەر، ئەم بلیمەتە فەیلەسوفە، لەتەمەنی ٨٦ ساڵیدا رۆژی ٢٦ ی مایسی ١٩٧٦ لەنێو جێگا بە ئەسپایی و لەبەرخۆیەوە دەیوت: (سوپاس) و مرد. لەشارەکەی خۆیدا نێژرا. چەندلقی دارو گەڵاشیان خستە نێو تابوتەکەیەوە و کورە بچوکەکەشی بۆ رێزلێنان لەباوکی پارچەیەک هۆنراوەی(هۆڵدەرلن)ی لەسەر تەرمەکەی خوێندەوە. (*)

**د. محەمەد کەمال**
**زانکۆی ماڵبۆرن**
**The University of Melbourne**
**2007**

(*) هایدیگەر دوو کوڕی هەیە (یۆرگ) لەساڵی ١٩١٩ و (هێرمەن) لەساڵی ١٩٢٠ لەدایکبووە.



# بەشی یەکەم
## لە کۆتاییەوە بۆ سەرەتایەکی نوێ

بیرکردنەوەی فەلسەفی، بۆ ماوەیەکی درێژخایەن، لە ژێر کاریگەرێتی جۆرێک بۆچوونی مێتافیزیکیانەدا گیریخواردووە. خۆی لەسەر زەمینەی دووەلیستی لە نیوان خۆو بابەت، ناوەرۆک و دیاردە، هەستەکی و ژوورهەستەکیدا ڕاگرتووە. یەکێک لەم لایەنانەشی لەویدیکە بە بەرزتر داناوەو لایەنی دووەمی کردووە بە پاشکۆو خزانوێتیەتە نێو پەراوێزەوە. ئەمەش بووە بە هۆی کەمکردنەوەی نرخ و گرنگیدان بە لایەنی دووەم و داگیرکردن و دەستگرین بەسەریدا. پەیوەندییەکانی نێوان دوولایەنەکان، لەبەرڕۆشنایی ئەم جۆرە مێتافیزیکەدا، بۆ نموونە( خۆو بابەت) لەسەر دژوەستان لە نێوانیاندا و سەپاندنی خۆ بە سەر بابەتدادامەزراون. ئەمەش لە ئاکامی ئەو لێکدانەوەیە سەریهەڵداوە، کە جیاوازییەکی بنەڕەتی لە نێوان خۆو بابەتدا دادەمەزرێنێت. بۆ نزیکبوونەوە لەم بابەتە دوورو بێگانەیە، (خۆ) هەڵوێستێکی شەڕەنگێزانە هەڵدەبژێرێت و لە ڕێگای داگیر کردنی بابەتەکە و ڕاماڵینی بەرەو جیهانی (خۆ) جیاوازییەکان دەڕوخێنێت و بابەتەکە دەکات بە بەشێک لە بوونی خۆی. ئەگەر ئاوڕێک لە مێژووی بیرکردنەوەی فەلسەفی بدەینەوە دەبینین سەرهەڵدانی میتافیزیکی دووەلیستی لە بۆ چوونە

فەلسەفیەکەی ئەفلاتونەوە دەستپێدەکات و بە نیتشە کۆتایی دێت. ئەفلاتون بۆ یەکەمجار جیاوازییەکی بنەڕەتی لە نێوان دوو جۆر ڕاستەقینەدا دیاریکردوە، ئاماژەی بۆ دوو جیهان کردوە: جیهانی بەرز و نزم، ژوور هەستەکان و هەستەکی، ئایدیا( فۆرمە هەمەکییەکان) و ئەستویی (ماتەر) یان جیهانی بابەتە هەستەکییەکان. جیهانی بەرزیشی بە نەبڕاوە و نەگۆڕو پڕو هەمەکی داناوە. جیهانی نزمیش، بە پێچەوانەی جیهانە بەرزەکەوە، بڕاوە و ساختە یەو وەرگیراوی جیهانە بەرزەکە یە و لە شێوازێکی ئەستویی و ناتەواودایە. جیهانێکە، وەکو کەرەسە و بابەت بەکاردەهێنرێت. لێرەدا کێشەی بەکارهێنانی جیهانی نزم لە ئاکامی ئەو ڕوانینە میتافیزیکیەوە سەریهەڵداوە، کە (بوون) بە کەرەسەیەکی خاو بۆ بەرهەمهێنان و وە بەرهێنان ڕێگەی داگیرکردن و دەستبەسەردا گرتنی بۆ خۆشدەکات. بەو ڕاستیەی دادەنێت، کە لە (خۆ) وە دوورە و دابڕاوە و بێگانە یە. (خۆ) هەوڵدەدات (بێگانەیی) بوون بە داگیرکردن و بە (خۆ کردنی) ئەو ڕاستە قینە دەرەکییە لە ناو بەرێت. میتافیزیکی دووەلیستی، پاش گەڕانی بە دوای ڕاستی و بنەڕەتی بووندا و هەڵبەستنی پەرژینێکی بەرز لە نێوان دوو جۆر ڕاستەقینەدا، یەکێک لەم ڕاستەقینانەش لەویدی بە سەرچاوە و بنەڕەت دادەنێت و بوونی هەمووشتێک بۆ ئەو سەرچاوە تاکە دەگەڕێنێتەوە. ئەمەش، بە بیروڕای من، کەمکردنەوەو پەلکێشکردنی هەموو شتەکانە بەرەو(یەک) ێک لە ئەوان و تەسککردنەوەی بواری مێتافیزیکە. دامەزراندنی زەمینەیەکە بۆ(باوەڕ) و



پەنابردنە بەر لایەنێکی بوون، کە لە سەرو یان لە ژوور هەموو شتێکەوە، مەبەست و بەهاکان بۆ بوون لە پێشتر ئامادە دەکات و چارەنووس دیاریدەکات. ئەم هەڵوێستە دوو فاقیەی بیرکردنەوەی فەلسەفی دیسانەوە سەرچاوەکەی بۆ فەلسەفەی ئەفلاتون دەگەڕێتەوە. مەبەست لە هەڵویستی دووفاقیش لەوەدایە، کە لە سەر بنەڕەتی (بوون) بدوێین و هاوکات لایەنێکی ئەو بنەڕەتە لە هەموو لایەنەکانی دیکە بۆ هەڵسوڕانی جیهان بە دەستەڵاترین و بەرزترین دابنێین. ئەفلاتون بنەڕەتی بوونی بە فۆرمە هەمەکی و نەگۆڕەکانی جیهانی بەرز داناوە. لەسەر ئەم فرە فۆرمانەشەوە، فۆرمی (چاکە) ی لە هەموویان بەرزتر ڕیز کردوە. پاش ئەفلاتون، ئەریستۆش، لە پەیڕەویکردنی هەڵوێستە دووفاقیەکەدا، هەرچەندە بیردۆزی ئایدیای ئەفلاتون ڕەتدەکاتەوە، (جوڵێنەری یەکەم) ی لە شوێن فۆرمی (چاکە) ی ئەفلاتون داناوە، کە لە ژوور هەموو شتێکەوە خۆی سەقامگیر کردوە و جیهان بەڕێوە دەبات. ئەم بۆ چوونەش لە هەندێ ڕووەوە لەگەڵ بۆچوونی ئاینییدا تێهەڵکێش بووە، کاریگەرێتی بەسەر گەشەکردنی فەلسەفی سەدەکانی ناوەڕاستدا، لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دا تۆمارکردوە.[1] لەم بیرکردنەوەیەدا

[1] یەکێک لە جیاوازییە سەرەکییەکانی نێوان هەڵوێستی دووفاقی مێتافیزیکی ئەریستۆ و ئاینخوازەکان لە گەڵ کێشەی ئافەریدکردنی جیهان سەرهەڵدەدات. بۆ ئەریستۆ (جوڵێنەری یەکەم) جیهانی ئافەرید نەکردووە، چونکە مەحاڵە بوونێک لە نەبوونەوە، بەرەو بوون پەلکیش بکرێت. جوڵێنەری یەکەم، بۆ ئافەرید کردنی جیهان، ئەستوی هێناوە، کە کەرەسەیەکی خاوی هەمیشەیی یە، فۆرمەکەی گۆڕیوە و

مێتافیزیک بە تەنیا (ئۆنتۆلۆجی) نیە و لەگەڵ دۆزینەوەی بنەڕەتی بووندا کۆتایی بە گەشتەکەی ناهێنێت. دەیەوێت لەگەڵ ناسینی ئەو بنەڕەتەدا لایەنێکیشی لە هەمووشتێک بە دەستەڵاتتر و ژوورتر دابنێت. ئەمەش، کە ئێمە بە هەڵوێستی دووفاقی ناو زەدمانکرد، مێتافیزیک دەکات بە( ئۆنتۆ- تیۆلۆجی). [٢] مێتافیزیکی ئۆنتۆ- تیۆلۆجی، یان دووفاقی نەریتێکی ئەفلاتونیە.

لەسەردەمی نوێدا ئەم نەریتە لەگەڵ گۆڕانی شێوازی بیرکردنەوەی فەلسەفیدا ناوەکەی بۆ نەریتی مێتافیزیکی دێکارتی گۆڕا. بەڵام سەرنجدانێکی ورد لە نەریتی دێکارتی ئەوەمان بۆ دیاریدەکات، کە ئەمیش سەربەنەریتە ئەفلاتونیەکەیە و نەیتوانیوە شۆڕشێکی فەلسەفی ڕادیکاڵانە بەسەر نەریتی ئەفلاتونیدا بکات. لە هەردوو نەریتە مێتافیزیکییە کەدا، کە تەواوکەری یەکدین و دووەمیان بەردەوام بوونی یەکەمیانە (بوون) بەشتێکی دیکە

ئەم جیهانەی لێ پێکهێناوە. بۆ ئاینخوازەکان ئافەرید کردنی جیهان لە (هیچ) ە وە. ئەم کێشەیەش، بە درێژی لە لایەن فەیلەسوفە مەسیحیەکان و موسوڵمانەکان مشتومڕی لە سەر کراوە.

[2] بڕوانە:

Martin Heidegger. "The Onto-Theo-Logical Constitution of Metaphysics", in *Identity and Difference*, translated with an introduction by Joan Stambaugh,Chicago: Chicago University Press, 2002. P. 59



دانراوەو بە تەواوی وەکوخۆی نە ناسراوە و ئاماژە بۆ واتاکەی نەکراوە لە سەرو ئەمانەشەوە، هەڵوێستی دووفاقی یان ئۆنتۆ- تیۆلۆجی مێتافیزیکی ئەفلاتونی لەگەڵ جیاکردنەوەی دوو لایەنەکە پەیوەندی شەڕەنگێزانەی لە نێوانیاندا دامەزراندوە و بە دووشتی ناکۆک و دژوەستا و بەرانبەر یەکدی قوتیکردوونەتەوە. هەندێک جار لایەنە بەرزەکە، کە بووە بە پرنسیپاڵی لایەنە نزمەکە خراوەتە بەر ڕۆشنایی زانینەوە و بەڕادەیەک ناسراوە. هەندێک جاری دیکەش نەناسراوە و بە نادیار و شاراوە ماوەتەوە. دەبینین لە سەردەمی نوێدا، پاش دێکارت، ئەم کێشەیە لە بیروباوەڕی فەلسەفی کانتدا بە زەقی و لە نیو کاڵای پارادۆکسێکی لە چارەبەدەردا خۆی دەرخست. بیریارانی پاش- کانت کاتی خۆیان بۆ دۆزینەوەی ڕێگەچارەی ئەم پارادۆکسە تەرخانکردوە. لە نێو ئەم بیریارانەدا هیگڵ لە هەموویان زیاتر بە پەرۆشەوە مامەڵەی لەگەڵدا کردووە. بەڵام ئەم بیریارە سەرەتای پارادۆکسەکە بۆ ئەفلاتون ناگەڕێنێتەوە. مامەڵە کردنەکەی لەگەڵ کێشەکەدا وابەستە بە بۆ چوونەکانی کانتەوە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت هیگڵ لە ئەفلاتون بێئاگابووبێت. ئەوەی بۆ ئەم بیریارە گرنگە کردنەوەی ئەو گرێکوێرانە یە، کە کانت نەیتوانیوە بیانکاتەوە و لە ئاکامدا گەیشتۆتە کۆڵانێکی دەرنەچووی بیرکردنەوەی فەلسەفی و لایەنە بەرز و پرنسیپاڵی بۆچوونە ئۆنتۆ- تیۆلۆجیەکەی خۆی نەناسیوە. بەڵام خاڵێکی سەرەکی هاوبەش لە نێوان مێتافیزیکی ئەفلاتون و هیگڵدا هەیە. بێجگە لەوەی مێتافیزیکی هەردووکیان دووفاقی یان ئۆنتۆ-

تیولۆجی یە، ئەم دوو بیریارە بنەڕەتی بوون بە (ئایدیا) یان (بیرەکان) دادەنێن. فۆرمە هەمەکییەکانی جیهانی بەرز بۆ ئەفلاتون ئایدیان بۆ هیگڵیش هەموو شتێک بیر و دیاردەی بیرە. جیهانیش سیستەمی بیرەکانە و بەڕێگەی لۆجیکی دیالێکتیکییەوە دەخرێتە گەڕ. فۆرمە هەمەکیەکان بۆ ئەفلاتون و بیرەکان بۆ هیگڵ ناوەڕۆک و ڕاستی هەموو شتێکن. بوونی هەموو شتێک لە سەر بیرەکان یان ناوەڕۆک ڕادەوەستێ و (بوون) هیچە. ئەوەی هەیە بیرەکانە یان ناوەڕۆکە.[٣] ئەم بیریارانە، کە جێگەی تایبەتیان لە مێژووی گەشەکردنی بیرکردنەوەی فەلسەفیدا هەیە و گۆڕانیان لە

[3] لێرەدا ئاماژەش بۆ شەهاب ئەلدین سوهرەوەردی (١١٥٣-١١٩١) فەیلەسوفی ئیشراقی دەکەم. ئەم فەیلەسوفە، کە بە ئێرانی ناسراوە، کورد بووە و لە گوندی( سورەبەرد) ی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە دایکبووە. بۆ چوونە فەلسەفیەکەی، کە لە ئەفلاتونەوە نزیکە (ناوەڕۆک) نەک (بوون) بە بنەڕەتی هەموو شتێک دادەنێت و بە ناوەڕۆکگەرایەتی ناسراوە. فەلسەفەی سوهرەوەردی بە تایبەتی لە سەردەمی سەفەویەکاندا لە ئێران جێگایەکی تایبەت و گرنگی بۆ دانرا. یەکێک لەوانەی دژی ناوەڕۆکگەرایەتی وەستاو بانگەشەی بۆ بنەڕەتی (بوون) کرد و فەلسەفەی بوونگەرایەتی لەو سەردەمەدا هێنایە کایەوە سەدرئەلدینی شیرازی (١٥٧١-١٦٤٠) بوو، کە بە مەلا سەدرە ناسرا. من لە پەڕتووکە کەمدا، لە سەر مەلا سەدرە بەدرێژی لەم کێشەیە دواوم. بڕوانە :

Muhammad Kamal. *Mulla Sadra's Transcendent Philosophy*, London: Ashgate Publisher, 2006. Pp. 42-43



نێو ئەم مێژوویەدا هێناوەتە کایەوە نەیانتوانیوە خۆیان لە نەریتی ئەفلاتونی ڕزگار بکەن و شۆڕشێکی بنەڕەتی لە فەلسەفەدا بکەن. شۆڕشێک، کە زەمینەو بناخەیەکی نوێ بۆ بیرکردنەوەی فەلسەفی دابهێنێت. دواجاریش، نیتشە لەگەڵ ئەو هەنگاوە مەزنانەیدا، بۆ ڕووخاندنی بناخەی بەها هەمەکییەکان و مێتا- گۆتارەکاندا، ڕەتدانەوەی مێتافیزیک، وەکو ئۆنتۆ- تیولۆجی پەیڕەوی نەریتی ئەفلاتونی لەو لایەنەدا کردووە، کە ڕاستی بوونی بۆ شتێکی دیکە بێجگە لە (بوون) گەراندۆتەوە. لەم ڕووەوە ئەم بیرکردنەوە فەلسەفیە لە ئەفلاتونەوە بۆ نیتشە لەسەر ئەو خاڵەی دەڵێت (بوون) هیچە و خۆی بە جۆرێکی دیکە لە (ڕاستی) یەوە ماندوو کردووە بۆچوونێکی هیچگەرایەتی یان نەهێڵیستی مێتافیزیکیە.[٤] تێگەیشتن لەم حوکمدانە و ڕیزکردنی نیتشە لەگەڵ شوێنکەوتوانی میتافیزیکی ئەفلاتونیدا لە سەرەتاوە سەختە و جێگەی باوەڕ نیە. بە تایبەتی ئەگەر ئێمە زیاتر، لە ڕوانگەی بەرنامە ڕادیکاڵە هیچگەرایەتیەکەی نیتشە و سارتەرە وە بڕوانینە کێشەکە.

مەبەست لەم حوکمدانە ئەوە نیە، کە ئەفلاتون ، وەکو نیتشە باوەڕی بە دەستەڵاتیکی هۆشەکی مێتافیزیکی نیە

[4] بڕوانە :

Martin Heidegger. *Contributions to Philosophy (From Enowning)*, translated by Parvis Emad and Kenneth Maly, Bloomington: Indiana University Press, 1999. P. 97

نەخشە و پلانی لە پێشتری بۆ جیهان کێشابێت. هەروەها ئەوەش ناگەیەنێت، کە نیتشە پەیڕەوی مێتافیزیکی دووەلیستی ئەفلاتون دەکات و باوەڕی بەو جیهانە بەرزە هەیە، کە فۆرمە هەمەکی و نەگۆڕەکانی تێدایە. ئێمە دەزانین هایدیگەریش لەگەڵ نیتشە و سارتەردا لەو خاڵەدا هاوڕایە، کە مێتافیزیک بە ئۆنتۆلۆجی نەک ئۆنتۆ- تیۆلۆجی دادەنێت و بنەڕەتی بوون بە سەدەمێکی (هۆ) هۆشەکی بەرزەوە گرێنادات. بەڵام تێڕوانینمان لە مامەڵە کردنی ئەفلاتون و شوێنکەوتوانی نەریتی ئەفلاتونی و دواجاریش نیتشە لەگەڵ کێشەی واتای بووندا ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە، کە هەموو ئەم بیریارانە، لە سەردەمی ئەفلاتونەوە بۆ نیتشە، هەر جارە ئاماژەیان بۆ لایەنێکی بوون یان شێوازێکی (بوون) کردوە. ئەگەر ئەو بنەڕەتە لای ئەفلاتون(ئایدیا) یان فۆرمە هەمەکیەکان بێت و لای ئەریستۆ (جوڵێنەری یەکەم) و لای دێکارت (بوونی تەواو کۆ و ڕەها) و لای کانت (نۆمینە) و لای هیگڵ (هۆشی ڕەها) ئەوا بۆ نیتشە (ویستی هێزە) نەک (بوون). بۆ هایدگەر هیچگەرایەتی تەنیا لەگەڵ ڕەتدانەوەی فۆرمە هەمەکییەکان یان جوڵێنەری یەکەمدا سەر هەڵنادات. هیچگەرایەتی ئەو باوەڕە فەلسەفیەیە، کە (بوون) بە (هیچ) دادەنێت و پوچەڵی دەکاتەوە و لە جێگەی بوون شتێکی دیکە بە بنەڕەت دادەنێت و بوون لە بیردەکات.[5]

[5] Martin Heidegger. *An Introduction to Metaphysics*, translated by Ralf Manheim, New York: Yale University



ئەم هەڵوێستە مێتافیزیکیە، یان لە بیرچوونی (بوون) و توێژینەوە، لە سەر شێوازێکی بوون خسڵەتێکی زەق و دیاردەیەکی فەلسەفی بیرکردنەوەی ڕۆژئاوایە لە سەردەمی ئەفلاتونەوە بیرکردنەوەی فەلسەفی تێدا گیریخواردوەو لە (بوون)، کە بنەڕەت و سەرچاوەی هەموو شتێکە نامۆ بووە. بیرکردنەوەی فەلسەفی ڕۆژئاوا لە ئەفلاتونەوە بۆ نیتشە مێژووی نامۆبوونی بیرکردنەوەیە لە سەرچاوەی خۆی. چونکە هیچ شتێک، یان هەرشتێک هەبێت و لە بارەیەوە زانیاریمان هەبێت، ئەو شتە دەبێ هەبێت. کەوابوو(بوون) پێش هەموو  شتێک دەکەوێت و مەرجێکی زەرورییە بۆی. بناخەی هەموو هەبوویەکە، تەنانەت لە ڕێگەی بوونەوە لە واتای نەبوونیش تێدەگەین. سەرەتای ئەو شۆڕشەی لەم توێژینەوەیەدا باسیدەکەین بە کۆتاییهێنان بە نەریتی مێتافیزیکی ئەفلاتونی دەستپێدەکات، کە نیتشە دوا فەیلەسوف و نوێنەریەتی.  بیرکردنەوەی فەلسەفی هایدیگەریش لەگەڵ هەنگاوە ئۆنتۆلۆجیەکەیدا و گەڕانەوەی مێتافیزیک بۆ ئۆنتۆلۆجی و ئۆنتۆلۆجیش بۆ توێژینەوە لە سەر واتای (بوون) سەرەتای سەردەمێکی نوێی بیرکردنەوەی فەلسەفیمانە.  توێژینەوە ئۆنتۆلۆجیەکەمان ڕاستەو خۆ لە بەردەم واتای (بوون) دا ڕاماندەگرێت و ئەو پرسیارە هەرە گرنگ و گەورە فەلسەفیەمان لە بەردەمدا قوتدەکاتەوە،  ئایا واتای بوون چیە؟ لە وەڵامدانەوەی ئەم

Press, 1987. P. 203

پرسیارەدا پێویستە خۆمان بە هیچ شێوازێکی بوونەوە (فۆرمە هەمەکییەکان، جوڵێنەری یەکەم یان ویستی هێزەوە) نە بەستنەوە و ڕووی تێنەکەین. بۆ ڕزگاربوون لەو هیچگەرایەتیەی هایدیگەر پێناسی کردووە، بیرکردنەوەی فەلسەفیش لەو نامۆ بوونەی لە سەردەمی ئەفلاتونەوە توشی بووە دەربکەین، دەبێت لە واتای بوون بە گشتی بکۆڵینەوە. ئەو بوونەی، کە ئەم و ئەو شتە نیە وهاوکات بنەڕەتی هەموو شتێکیشە. بوونی هەموو هەبوو یەکە و هیچ شتێک بەبێ ئەو نیە و نابێت و بنەڕەتێکی لە بنەڕەت بەدەرە و لە هەموو شتێک زیاترلە پێشترە. شتەکانی دەوروبەرمان گەورە و بچوکن، ڕەش و سپین، ڕەق و نەرمن. ئەوانەی گەورەن بچوک نین، ڕەشن سپی نین، ڕەقن نەرم نین. لەگەڵ ڕەتدانەوەی یەکێک یان چەند خسڵەتێکی ئەم شتانەدا ناوەڕۆکیان ناگۆڕێت. بۆ نموونە: درەختێک گەورە بێت یان بچوک، سەوز بێت یان ڕووتەڵە هێشتا درەختە. کەسێک مامۆستابێت یان کرێکار هەر مرۆڤە. ڕاماڵینی خسڵەتەکان بوونی ئەو شتە ناسڕێتەوە. هەموو ئەم شتانە باسیاندەکەین و لە نێو ئەزمونی ئێمەدان شتێکنهەن. هەیە یان (بوون) بنەڕەتیانە و بەبێ ئەو نابن. هەرشتێک بوونی نەبێت (لە دەرەوە و ناوەوەی بیرکردنەوەدا) ئەو شتە نیە یان هیچە.

پرۆژە ئۆنتۆلۆجیەکەی هایدیگەر، لەم بەستێنەوە بە دوو شێوە شۆڕشێکی فەلسەفی بەرپاکردووە: یەکەم، زیندووکردنەوەی پرسیارە هەرە گەورە فەلسەفیەکەیە



سەبارەت بە واتای بوون و گەڕانەوەی بوونە بۆ جێگە سەرەکی و ناوەندییەی خۆی لە بیرکردنەوەی فەلسەفیدا، کە لە سەردەمی ئەفلاتونەوە لەو جێگەیەدا هەڵکەنراوە. ڕزگاریکردنی بیرکردنەوەی فەلسەفیە لە نامۆ بوونی لە بنەڕەت. دووەم، لەم پێگەیەوە و لە هەوڵداندا بۆ تێگەیشتن لە واتای بوون، هایدیگەر توژینەوەکەی لە بوونی مرۆڤەوە (دازاین) دەخاتەگەر. ئەم توێژینەوەیەش بە (شیکردنەوەی بوونگەرانەی دازاین) ناسراوە و تەفسیرێکی نوێیە بۆ ئەم بوونە. ئەم شۆڕشە فەلسەفیە لە دوو قۆناخی بیرکردنەوەی هایدیگەردا دەستیپێکردووە. قۆناخی یەکەم بەو سەردەمە دەناسرێت، کە (بوون و کات) ی تێدا نوسراوە.[٦] من هەوڵدەدەم لەم توێژینەوەیەدا ئەو خاڵەش ڕوونبکەمەوە،

---

[6] پەڕتووکی بوون و کات *Sein und Zeit* بۆ یەکەمجار بە ئەڵمانی لە ساڵی ١٩٢٧ دا بڵاوکرایەوە. تاکو ئێستا دووجار وەرگێڕاوەتە سەر زمانی ئینگلیزی. یەکەمجار جۆن ماکوێری و ئێدوارد ڕۆنبسن لە ساڵی ١٩٦٢ بە ناوی( *Being and Time*) ە وە لە چاپیاندا. لەم دواییەشدا جۆوان ستەمبۆ وەریگێڕایەوە بۆ زمانی ئینگلیزی و لە سالی ١٩٩٦ لە چاپیداوە. هەرچەندە وەرگێڕاوەکەی جۆوان ستەمبۆ سەرنجی زۆرینەی مامۆستای ئەکادیمی و هایدیگەر ناسەکانی ڕانەکێشاوە، بەڵام لە گەڵیک ڕووەوە ئەم مامۆستاژنە زمانێکی ڕەوان و سادەی بەکارهێناوە، کە بەبیروڕای من خوێندکاران زۆرتر سودیلێوەردەگرن. لە پێشتریش بەرهەمێکی دیکەی هایدیگەری (پێشەکی بۆ مێتافیزیک) لە سالی ١٩٨٧ وەرگێڕاوە بۆ ئینگلیزی. من لەم توێژینەوەیەمدا، هەرچەندە زیاتر وەرگیرانی یەکەم بە سەرچاوە دادەنێم، هاوکات سودم لە وەرگێڕانی دووەمیش کردووە. لە جارێک زیاتر بەرهەردووکیانا چوومەتەوە.

که ئەم قۆناخە پێش نووسینی ئەو بەرهەمەی هایدیگەر دەکەوێت. پێش نووسینی (بوون وکات) هایدیگەر لە وانەکانیدا لە زانکۆکانی ماربۆرگ و فرایبۆرگدا گەلێک لەو بیرۆکە فەلسەفیانەی باسکردووە، کە لە پەڕتووکی (بوون و کات) دا بەرجەستە بوون.

قۆناخی دووەم بە پاش (بوون و کات) یان (وەرگەڕان *die Kehre*) ناسراوە و هایدیگەریش لەم قۆناخەدا بە (هایدیگەری دوا) ناوزەد کراوە. ئایا هایدیگەر لەم قۆناخەدا لە چی بابەت و کێشەیەکی فەلسەفی دەکۆڵێتەوە؟ بۆچی بە وەرگەڕان دادەنرێت ؟ کێ ئەم خسڵەتەی بە بۆچوونە فەلسەفیەکانی هایدیگەر داوە؟ ئەم پرسیارانە و گەلێکی دیکە یەخەمان دەگرن. بەڵام من دەمەوێت بیسە لمێنم، کە هەردوو هایدیگەر، ئەو فەیلەسوفەی (بوون و کات) ی نوسیوە و هایدیگەری پاش ئەم قۆناخە یەک بیریارن و پەیوەندییەکی بنەڕەتی و بەردەوامی لە نێوان هەردوو قۆناخەکەشدا هەیە. هایدیگەری قۆناخی دووەم لە بۆچوونە فەلسەفیەکانی قۆناخی یەکەمی پەشیمان نیە. جیاوازی نێوان ئەم دوو قۆناخە لە وێدایە، کە هایدیگەر قۆناخی یەکەمی بڕیوە. بەشی یەکەمی پڕۆژە فەلسەفیەکەی بە ئاکامی خۆی گەیاندوە و لەو ئاکامەوە، جارێکی دیکە دەگەڕێتەوە بۆ پرسیارە گەورە فەلسەفیەکە سەبارەت واتای بوون و هەوڵی روونکردنەوەی دەدات. هایدیگەر بە درێژایی تەمەنی لەگەڵ وەڵامی ئەو پرسیارەدا مامەڵەدەکات، کە بە



پرسیاری (سەبارەت بە بوون) *Seinfrage* ناسراوە. جیاوازی نێوان دوو قۆناخەکەشی لە وەڵامدانەوەی پرسیارەکەدا لە لادان و دابڕینی قۆناخێک لەوی دیکەوە نیە. قۆناخی یەکەم دۆزینەوەی سەرە ڕێگەیەکە بۆ توێژینەوەکە سەبارەت بە واتای بوون. سەرەڕێگەکەش لە بوونی مرۆڤەوە دەستپێدەکات. شیکردنەوەیەکی بوونگەرانەی بوونی مرۆڤە لە پێناوی گەیشتن بە ویستگەیەکی ئۆنتۆلۆجی گرنگ، کە لە قۆناخی دووەمدا خۆی سەپاندووە. ئەم ڕەوتەش لە شیکردنەوەی بوونگەرانە لە واتای بوونی مرۆڤەوە بۆ واتای بوون بەگشتی بە خولە لە نێو بازنەی هێرمینۆتیکی دادەنرێت. بەم جۆرە، تێگەیشتن لە پرۆژە فەلسەفیەکەی هایدیگەر دژوارە ئەگەر بەتەنیا ئاوەڕ لە یەکێک لەم قۆناخانە بدرێتەوەو ئەوی دیکە ڕەچاو نەکرێت.

هایدیگەر یەکێک بووە لەو مامۆستایانەی بەرهەمەکانی کەم بەچاپ گەیاندوە. بەڵام وانەکانی لە ڕووی بیرکردنەوەی فەلسەفیەوە دەوڵەمەند و ڕادیکاڵ بوون. ناوی هایدیگەری بە زانکۆ و گروپە فەلسەفیەکانی دیکەی ئەڵمانیا گەیاندووە .[7] هەرچەندە قۆناخی یەکەمی

[7] چەند خوێندکارێکی هایدیگەر، وەکو هانس جۆرج گادامەر و هانا ئارەندت ئاماژەیان بۆ ئەم لایەنەی وانەکانی هایدیگەر کردووە. کونۆ لۆرانس، مامۆستای فەلسەفە لە زانکۆی زارلاند لە ئەڵمانیا، کە مامۆستا و هاوڕێی منە، گێڕایەوە هایدیگەر بۆ زانکۆکەیان بانگکرا و کۆڕێکی لەسەر ئەفلاتون گرت. ئەوکاتە بابەتی کۆڕەکە بۆ خوێندکاران گرنگ نەبوو. تەنانەت زۆر لەو خوێندکارانە

بیرکردنەوەی هایدیگەر بە دەرچوونی پەرتووکی (بوون و کات) دەستپێدەکات و بەو بەرهەمەشدا ناسراوە و لە پێش ئەم پەرتووکەدا بەرهەمێکی بلاوکراوەی سەرکەوتوی هایدیگەر نادۆزرێتەوە، کە ئەم فەیلەسوفەی بە خوێنەر ناساندبێت، هێشتا، ئەوە ناگەیەنێت لە پێش دەرچوونی (بوون و کات) دا بیرکردنەوەی فەلسەفی هایدیگەر سەریهەڵنەدابێت و گەشەی نەکردبێت. لە پێش دەرچوونی ئەم پەرتووکەدا هایدیگەر لەوانەکانیدا ناڕاستەوخۆ، هەندێک جاریش ڕاستەوخۆ لەو کێشانە دواوە، کە لەم پەرتووکەدا بوون بە بنچینەکانی بیرکردنەوەی فەلسەفی و پرۆژە ئۆنتۆلۆجیەکەی. سەردەمی پێش (بوون و کات) کە سەردەمی سەرهەڵدان و گەشەکردنی بیروباوەڕەکانیەتی، سەردەمێکی دەوڵەمەند و گرنگە لە ژیانی هایدیگەردا. لەو ڕۆژەوە دەستپێدەکات هایدیگەر لە زانکۆی ماربۆرگ و فرایبۆرگ، دوای جەنگی جیهانی یەکەم لە ١٩١٩ دەکرێت بە مامۆستا و هاوڕێیەتی لەگەڵ ئەدمۆند هوسرڵ دەستپێدەکات و دەبێت بە یەکێک لە شوێنکەوتوانی میتۆدی فینۆمینۆلۆجی هوسرڵ. هەرچەندە هایدیگەر لە نێو گروپی هوسرڵدا چالاک بووە و سودی لە میتۆدی فینۆمینۆلۆجی بۆ توێژینەوە ئۆنتۆلۆجیەکەی وەرگرتووە، شوێن فەلسەفەی

فەلسەفەی ئەفلاتونیان بە کلاسیک و بێسود دادەنا. بەڵام پاش کۆڕەکەی هایدیگەر و بەو جۆرەی هایدیگەر توێژینەوەکەی لە سەر ئەفلاتون پێشکەش کرد خوێندکاران، ڕوویانکردۆتە پەرتووکخانەی زانکۆ و دایەلۆگەکانی ئەفلاتونیان خوێندۆتەوە و مشتو مڕیان لەسەر بۆ چوونەکانی کردووە.



فینۆمینۆلۆجی نەکەوتووە. هەوڵیداوە نەیاریی خۆی لەگەڵ هوسرڵدا ڕوونبکاتەوە. هوسرڵیش بەم نەیارییەی هایدیگەر نیگەران بووە. کاتێک پەرتووکی (بوون و کات) یش لە چاپدرا، کە هایدیگەر پێشەکەشی کردووە بە هوسرڵ، هوسرڵ دەگاتە ئەو باوەڕەی، کە هایدیگەر لە نەریتی فینۆمینۆلۆجی لایداوە و هوسرڵیانە بیرناکاتەوە. سەرنجدان لە وانەکانی هایدیگەر لەو سەردەمەوە، کە ئێستا هەموویان لە چاپدراون، ئەو خاڵەمان بۆ ڕووندەکاتەوە، کە هایدیگەر لەگەڵ بیرکردنەوەی مێتافیزیکی هوسرڵدا، یان فینۆمینۆلۆجی بەرزدا، نایار بووە. ئەو تەنیا میتۆدی فینۆمینۆلۆجی بۆ ناسینی ڕاستی بەکارهێناوە. فینۆمینۆلۆجی بەرز Transcendental phenomenology، کە لە ئاکامی سەپاندنی میتۆدی فینۆمینۆلۆجی بەسەر بابەتەکانی ژوور ئەزمونی هەستەکییەوە هاتۆتەپێش، لەژێر کاریگەرێتی نەریتی فەلسەفی دێکارتدا ماوەتەوە. فینۆمینۆلۆجی، وەکو میتۆدێکی نوێ، ڕادیکاڵە بەڵام هوسرڵ میتۆدەکەی بۆ کێشە مێتافیزیکییە دێکارتیەکان بەکارهێناوە. بۆ نموونە کێشەی (خۆی بەرز) ، کە ڕەگوڕیشەی لە نێو بیردۆزی ناوەڕۆکی گیانەکی دێکارتدا داکوتاوە، لە فینۆمینۆلۆجی بەرزدا بووە بە ڕاستیەکی بنەڕەتی. بەڵام هایدیگەر ئەم ڕاستیە ڕەتدەداتەوە.[8]

[8] هوسرڵ لە پەرتووکی *Logical Investigations* دا فینۆمینۆلۆجی وەکو میتۆد دەبینێت. لە دواییدا لە پەرتووکی *Ideas* دا ئەم میتۆدەی بە سیستەمێکی فەلسەفیەوە گرێدا و بە فینۆمینۆلۆجی

میتۆدی فینۆمینۆلۆجی دەستکەوتێکی گەورە بوو. هایدیگەر، بە ڕێگەی ئەم میتۆدە توانی تەفسیرێکی نوێ بۆ بوونی مرۆڤ و جیهان بکات. لەوانەکانی ساڵی ١٩١٩، کە بە فاکتۆرەکانی بوونی مرۆڤ و بە جیهانکردنی جیهان دەستیانپێکرد، گۆڕانکارییەتی ڕادیکاڵ بەسەر بیرکردنەوەی هایدیگەرەوە دەردەخات. بەتایبەتی کێشەی (بەجیهانکردنی جیهان) و تێگەیشتنی هایدیگەر لە واتای جیهان بۆ خوێندکارەکان (دۆزینەوەی کیشوەرێکی نوێ) بوو.[٩] لەم کیشوەرە نوێیەدا، مرۆڤ شەڕەنگێزانە بەرانبەر جیهان ڕاناوەستێت. بوونی ئەو جیهانییە وجیهانیش نیشتمانی ئەوە. پەیوەندییەکانی لەگەڵ جیهاندا فرەلایەنە و بەتەنیا لە سەر (زانین) دانەمەزراون. لە هەموویان گرنگتر و لە پێشتر لە نێو ئەم پەیوەندییە فرە لایەنانەدا، پەیوەندی کردەگی (پراکتیکی) یە. بۆ هایدیگەر، بە پێچەوانەی

بەرز Transcendental Phenomenology ناوزەدیکرد. هایدیگەر و سارتەر، وەکو دوو شوێنکەوتووی میتۆدی فینۆمینۆلۆجی، لەگەڵ ئەم گۆڕانکارییەی هوسرڵدا ناگونجێن. سارتەر لە پەڕتووکە کەیدا *The Transcendence of the Ego* ڕەخنەی لە هوسرڵ گرتووە وکێشەی (منی بەرز) ڕەتدەداتەوە.

[9] Theodore Kisiel. *The Genesis of Heidegger’s Being and Time*, Los Angeles: University of California Press, 1995. P. 16



دێکارت و هوسرڵەوە، بیردۆزە لە پێشترنیە. لە ژیانی ڕۆژانەدا مرۆڤ ڕاستەو خۆ بەبێ پشتبەستن بە بیردۆزە مامەڵە لەگەڵ دەوروبەریدەکات. ئەم مامەڵە کردنەش کردەگییە، یان نا- بیردۆزەیی و نا- زانستانەیە. لەم ڕووەوە بیردۆزە، لە هەموو حالەتێکدا پێش کردەوە ناکەوێت. بۆ نموونە من هەمووڕۆژێک چەند جارێک دەرگای ژوورەکەم بە کلیل دەکەمەوە. بەڵام لە خۆم ناپرسم کلیل چیە؟ ئەم پرسیارە لە ئاستی گەڕان بە شوێن بیردۆزە و شیکردنەوەی زانستانەدا ڕاماندەگرێت. لە بەستێنێکی کردەگییەوە بۆ ئەپستمۆلۆجی دەمانگوێزێتەوە. من پێش قووتکردنەوەی پرسیارەکە، چەند جارێک کلیلم بۆ داخستن و کردنەوەی دەرگاکە بەکارهێناوە. تێگەیشتنم لە چیەتی کلیلەکەش هەڵوێستی کردەگی من ناگۆڕێت.  پێشخستنی پەیوەندی کردەگی لە نێوان مرۆڤ و جیهاندا و دانانی جیهان بە نیشتمانی مرۆڤ، گۆڕانکاری و لادانێکی بنەڕەتیە لە نەریتی دێکارتیەوە، کە فینۆمینۆلۆجی بەرزی هوسرڵیش خۆی بە شوێنکەوتووی ئەو نەریتە دادەنا. لەگەڵ ئەم جیاوازییانەی بیرکردنەوەی فەلسەفیدا لە نێوان هوسرڵ و هایدیگەردا، هوسرڵ هایدیگەری بە نوێنەری فینۆمینۆلۆجی دادەنا و زۆر لە خوێنکارانی دەنارد بۆ لای هایدیگەر. لەو ساڵەدا ژمارەی خوێندکاران لە وانەکانی هایدیگەردا سێ جار گەورەتر بوو، تەنانەت زۆر کەس، کە خوێندکاری زانکۆش نەبوون، دەچوون لە وانەکاندا دادەنیشتن و گوێیان

لە هایدیگەر دەگرت.[10]

لادان لەو ڕێگە فەلسەفیەی هوسرڵ و گوێنەدان بە فینۆمینۆلۆجی بەرز، بنەڕەتی و گۆڕانکارییەکی زەرورییە لە بیرکردنەوەی فەلسەفی هایدیگەردا. هەروەها، سەرەتای سەردەمێکی نوێ لەگەڵ خۆیدا دیاریدەکات. ئاماژەی ئەو لایەنە فەلسەفیە دەکات، کە دەیەوێت لە نەریتی فەلسەفی دێکارتی دوور کەوێتەوە و زەمینەیەکی نوێ بۆ بیرکردنەوە بدۆزێتەوە. بە پێچەوانەی هەندێک لە ڕەخنەگران، ئەوانەی دەیانەوێت ساردبوونەوەی پەیوەندی و هاوڕێیەتی هوسرڵ و هایدیگەر بە هۆکارێکی ڕامیارییەوە ببەستنەوە، ئەم لادانە و دەرچوونە لە نێو بازنەی فێرگە فەلسەفیەکەی هوسرڵدا، بۆ پێش خانەنشینی هوسرڵ لە زانکۆ و سەرهەڵدانی ڕژێمی نازییەکان لە ئەڵمانیا دەگەڕێتەوە. هوسرڵ و شاگردەکانی لە نێو فێرگە فینۆمینۆلۆجیەکەیاندا دێکارتیانە دەیانڕوانیە جیهان و لە بەر ڕۆشنایی ئەو نەریتە فەلسەفیەدا لە واتای بوونیان دەکۆڵییەوە. ئەمەش بۆ هایدیگەر هەلوێستێکی ڕادیکاڵ نەبوو. ئەو دەیویست میتۆدی فینۆمینۆلۆجی نەبێتە زەمینە بۆ فینۆمینۆلۆجی بەرز و سەربەنەریتی دێکارتی نەبێت. بەدیدی ئەو نەریتی دیکارتی و مێتافیزیکە ئایدیالیستەکەی سەربە سەردەمێکی کۆن و نامۆبوونی

10 هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٥٩



بیرکردنەوەی فەلسەفیانەیە لە ڕاستی بوون، کە کاتی (هەڵوەشاندنەوە) ی هاتووە. مشتومڕی هایدیگەر لەگەڵ هوسرڵدا لەسەر مەسەلەی جولەکە و جولەکایەتی هوسرڵ نەبوو، بەڵکو کێشەیەکی فەلسەفیە و پێویستە لەم ڕوانگەیەوە تەماشابکرێت.[11] هایدیگەر لە چاوپێکەوتنەکەیدا لە گۆڤاری *Der Spiegel* بەم جۆرە باسی هوسرڵ دەکات.

دێرشپیگل : تۆ خوێندکاری (ئەدمۆند هوسرڵ) بوویت. ئەو مامۆستا(جوو) ە ی لە پێش تۆدا لە فرایبۆرگ مامۆستای فەلسەفە بوو. داوای لە زانکۆ کرد تۆ لە جێگاکەی ئەو دابمەزرێنن. پەیوەندیت لەگەڵیا پێویستی بە سوپاسکردن و ڕێزلێنانە.

هایدیگەر : دڵنیام لەوە. پەرتووکی (بوون و کات) م پێشکەش بەو کردووە.

دێرشپیگل : بێگومان. بەڵام پەیوەندییەکەتان لە دواییدا شێوا. ئایا دەتوانیت هۆکەی ڕوونبکەیتەوە ؟

11 ئەدمۆند هوسرڵ (١٨٥٩-١٩٣٨) فەیلەسوفی ئەڵمانی و دامەزرێنەری فێرگەی فینۆمینۆلۆجیە. لە زانکۆی فرایبۆرگ مامۆستای فەلسەفە بوو. لەو زانکۆیە مارتن هایدیگەری ناسی و بوون بەهاوڕێ. کاتێک نازییەکان دەستەڵاتیان گرتە دەست، هوسرڵ لە بەر ئەوەی جولەکە بوو، لەوەوپێش خانەنشین کرابوو، ڕێگەی پێنەدرا لە کۆڕەکاندا بەشدارییکات و سود لە پەرتووکخانەی زانکۆ وەرگرێت.

هایدیگەر : جیاوازی نێوانمان لە سەر کێشە فەلسەفیەکان سەریهەڵدا. لە سەرەتای ساڵەکانی سییەوە(هوسرڵ) بەئاشکرا خۆی لە من و (ماکس شیلەر) دوو دەخستەوە. من نەمدەزانی بۆ چی هوسرڵ لەگەڵ بۆ چوونە فەلسەفیەکانی مندا ناکۆک بوو، یان خۆی لە من دووربخاتەوە.[12]

لە دوو بەرهەمی پێش (بوون و کات) دا، کە ئەمانەش ڕیزێک لە وانەکانی هایدیگەر بوون گەلێک کێشە و زاراوەی فەلسەفی باسکراون و بەکارهێنراون، کە لە دواییدا بوون بە هەوێنی بیرکردنەوەی فەلسەفی قۆناخی یەکەمی هایدیگەر. لە ساڵی ١٩٢٢ ڕیزێک وانەی بە ناوی (تەفسیری فینۆمینۆلۆجیانەی ئەریستۆ) *Phenomenological Interpretation of Aristotle* پێشکەشکرد و لە سالی ١٩٢٣ دا چەند وانەیەکی لە ژێر ناوی (ئۆنتۆلۆجی : هێرمینۆتیکی فاکتۆر) *Ontology: Hermeneutics of Facticity* گوتەوە. هەروەها لە ساڵی ١٩٢٤ کۆڕێکی لە زانکۆی ماربۆرگ بە ناوی (چەمکی کات) *The Concept of Time* گرت و لەساڵی ١٩٢٦ پێش دەرچوونی (بوون و کات) لە کۆڕێکدا نوسراوێکی (لەسەر ناوەڕۆکی

[12] محەمەد کەمال (لە ئینگلیزییەوە وەریگێڕاوە) گفتوگۆیەک لەگەڵ هایدیگەردا، کتێبی گیرفان ٧١ ، دەزگای سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٥، لاپەڕە ٣٢



ڕاستی) *On the Essence of Truth* خوێندەوە .[13] لەم بەرهەمانەدا، هایدیگەر هەوڵیداوە بە شێوازێکی جیاواز تر و لە بەر ڕۆشنایی میتۆدی فینۆمینۆلۆجیدا، لە بوونی مرۆڤ و جیهان و ڕاستی بکۆڵێتەوە. لە دوو بەرهەمەکەی پێشەوەدا بوونی مرۆڤ بە زاراوەی فاکتۆری ئەزموونی ژیان ناوزەد دەکات. بە پێچەوانەی دێکارت و شوێنکەوتوانی نەریتەکەی زاراوی ناوەڕۆکی گیانەکی و (خۆ) بەکارناهێنێت. بوونی مرۆڤ، ئەگەر فینۆمینۆلۆجیانە تەماشابیکرێت، خۆی وەکو ناوەڕۆکی گیانەکی و خۆی بەرز دەرناخات. کڵافەیەک چالاکییە لە نێو مێژوو دا، کە دەبێت بە ئەزموونی ژیانی تاکەکەس. ئەزموونی ژیانیش، مادامەکی ڕوداوێکی نێو مێژووە، ئەوا لە جیهان دانابڕێت و ئەو بوونەش بە شتێکی ئەودیو مێژوو دانانرێت. بوونی مرۆڤ، بێجگە لەم ئەزموونە، کە فاکتۆرێکی فینۆمینۆلۆجیانە یە، چی دیکە نیە. جیهانیش بۆ ئەو ژینگە و سەرچاوەی ئەزموونەکانە.[1]

تێگەیشتن لەواتای جیهان بە ژینگە و نیشتمان

[13] Theodore Kisiel. *The Genesis of Heidegger's Being and Time*, pp. 472-473

[14] Martin Heidegger. *Phenomenological Interpretation of Aristotle*, translated by Richard Rojcewicz, Bloomington: Indiana University Press, 2001. P. 68

پەیوەندییەکی هەرەگرنگ لە نێوان مرۆڤ و جیهاندا دیاریدەکات. لەم پەیوەندییەدا، کە بە نیگەرانیەوە Care مرۆڤ مامەڵە لەگەڵ جیهاندا دەکات، خۆی بە بەشێک لەو جیهانە دادەنێت. نیگەرانی دەبێت بە پەیوەندییەکی گرنگ و سەرەکی لە نێواندا. نیگەرانی، کە ناتوانین بە کاتیگۆری دابنێین، هایدیگەریش نایەوێت کاتیگۆری بە بوونی مرۆڤەوە بلکێنێت، لە پەرتووکی (بوون و کات) دا بووە بە پیشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی بۆ ئەم بوونەو بەبێ ئەم بیر لە بوونی مرۆڤ ناکرێتەوە. لە پەڕتووکی دووەمدا *Ontology: The Hermeneutics of Facticity* ئەو کێشانەی باسکراون لە مەڕ بوون و مرۆڤ و جیهان، بوون بە بنەما سەرەکیەکانی توێژینەوەی هایدیگەر لە(بوون وکات) دا.

تەنانەت لەم پەڕتووکەدا، زاراوەی (دازاین *Dasein*) بۆ یەکەمجار بۆ بوونی مرۆڤ بەکار دەهێنێت و ئاماژەی جۆرێک لە توێژینەوەش (هێرمنیۆتیک) بۆ ئەم بوونە دەکات. زاراوەیFacticity کە بە داخەوە، لە زمانی کوردییدا، زاراوەیەکمان بۆ دانەناوە، لە فاکتۆر یانFactual ی جیادەکاتەوە. یەکەمیان سەبارەت بە بوونی مرۆڤە. ئەو فاکتۆرانەن لەم بوونەدا هەن و لە فاکتوری (هەبوو) یەکەوە جیاوازن. جیاوازییەکەش لە وێدا سەرهەڵدەدات، کە بوونی مرۆڤ ئاگامەندە و دەتوانێت بڕیار لەسەر فاکتۆرێک بدات. دروستە بوون بە مرۆڤ لە ئاکامی بڕیاردانی ئەو بوونەدا پەیدا نەبووە و تاکێک ئەو فاکتۆرە هەڵنابژێرێت، بەڵام ئەو تاکە تەوانای هەڵبژاردنی هەیە. دەتوانێت خۆی بڕیار



لەسەر پرۆژەیەکی بوونی بدات، کە پاش ئەنجامدانی دەبێت بە فاکتۆرێکی بوونی.

> فاکتەستی Facticity خسڵە تێکە ئێمە بۆ ئەو بوونەی بەکاردەهێنین، کە (دازاین) یان خۆمانین. ئەمەش ئەو واتایە دەبەخشێت، کە لە هەموو حاڵە تێکدا (دازاین) لە بوونی (لەوێدا) لە کات و شوێنێکی دیاریکراودا... هەتا ئەو کاتەی هەیە، خۆی خەریکدەکات و (لێرە) هەڵسوکەوت دەکات.[15]

دەبینین هایدیگەر زاراوی فاکتۆری ئەزمونی ژیانی لێرەدا گۆڕیوە بۆ دازاین(بوون- لێرە). ئەم زاراوەیەش پاش ئەم قۆناخە جێگەی خۆی لە بیروباوەڕی فەلسەفی هایدیگەردا دەگرێت و هاوکات جیاوازییەکی بنەڕەتی لە توێژینەوەی هایدیگەر بۆ بوونی مرۆڤ و بۆچوونی دێکارتدا دادەمەزرێنێت. ئەو خاڵەش دیاریدەکات، کە دازاین تاکێکی دوورە پەریز و خۆبژێو نیە. بوونیکەدینامیکی و ناتەواو دەژی و بوونێکی جیهانی هەیە. بوونێکە، لە نێو جیهاندا ڕاستەوخۆ مامەڵە لەگەڵ بووندا دەکات و دوورەپەرێز ڕانەوەستاوە. نموونەش بۆ ئەم جۆرە وەستانە لە نێو چەقی جیهان و ڕووداوەکاندا شێوەی ژیانی هونەرمەندایە. ڤان

---

15 Martin Heidegger. *Ontology: The Hermeneutics of Facticity*, translated by John van Buren, Bloomington: Indiana University Press, 1999. P.5

کوخ لە نامەیەکیدا بۆ براکەی ئەم ڕاستیەی سەرکەوتوانە دەربڕیوە و دەنوسێت،(حەزدەکەم بمرم و لە زانکۆ هونەر نەخوێنم).[16]

خوێندنگا زاگەی هونەرمەند نیە. ئەزموونەکانی ژیان دەبن بە هەوێنی هونەر. (دازاین) یش، کە هەریەکێک لەئێمەیە هونەرمەندانە دەژی، یان ژیانێکی فەلسەفیانە هەڵدەبژێرێت. ئەمەش لێکچونێکی بنەڕەتییە لە نێوان فەلسەفە و هونەردا، کە هایدیگەر لە قۆناخی دووەمی بیرکردنەوەیدا زیاتر جەختی لە سەرکردووە. هەروەها لێرەدا، لە قۆناخی یەکەمدا لە باتی زاراوەی (فەلسەفە)، فەلسەفەکاری philosophizing بەکاردەهێنێت.[17]

ژیان و ئەزموونەکانی ژیان خوێندنگای مەزنی بیرکردنەوەی فەلسەفین. فەیلەسوف لە خوێندگای ژیاندا فێری فەلسەفە دەبێت و خۆی بە فەلسەفەکارییەوە ماندوو دەکات. ئەم بۆ چوونەش ئاماژە بۆ ئەو خاڵە دەکات، کە دازاین(بەتایبەتی دازاینێک فەلسەفەکار و هونەرمەند) بێت دوورەپەریز، وەکو (بینەر) لە ئاستی ڕووداوەکاندا ڕاناوەستێت، چونکە ئەو (بکەر) ی ڕووداوەکانە. ڕووداوەکان بۆ ئەو ئەزموونەکانی

[16] بڕوانە نامەی ڤان کوخ لە ١٥ ی ئۆکتۆبەری ١٨٧٩ بۆ براکەی، لە بەرگی یەکەمی نامەکانی ڤان کوخ بە ئینگلیزی بلاوکراوەتەوە.

[17] Martin Heidegger. *Phenomenological Interpretation of Aristotle*, pp. 33-34



ژیانن، کە دەبن بە بەشێک لە ناوەڕۆکی بوونی. ئەو پرۆژانەن بە بەردەوامی دایاندەهێنێت و لە ڕێگەیانەوە دەگات بەوەی هێشتا پێینەگەیشتوە. بەم جۆرە تێگەیشتن لە بوونی دازاین جیاوازییەکی گرنگ لە نێوان بۆچوونی هایدیگەر و میتافیزیکی دیکارتیدا دیاریدەکات، کە لەم سەرەتایەوە سەریهەڵداوەو لە دواییدا لە پەرتووکی (بوون و کات) دا گۆڕانیکی بنەڕەتی هێناوەتەکایەوە. ئەم گۆڕانە بنەڕەتیە، هەرچەندە میتۆدی فینۆمینۆلۆجی هوسرڵ ڕێگە خۆشکەرێتی، کاریگەرێتی هوسرڵ بەسەر بیروباوەڕی هایدیگەرەوە دەردەخات، بەڵام لە فینۆمینۆلۆجی بەرزەوە جیاوازە. ئاشکرایە فەلسەفەی هوسرڵ لە نێو بازنەی بۆچوونەکانی (برینتانۆ) دا نەماوەتەوە. هوسرڵ توانیویەتی، ئەم مامۆستایەی ڕەتبکات و کاڵایەکی فەلسەفی بەبەری میتۆدی فینۆمینۆلۆجیدا بکات. ئەمەش گۆڕانکارییەکە لە بەکارهێنانی میتۆدەکەدا. ئەوەی هوسرڵ نەیتوانیوە دایهێنی و هایدیگەر ڕەخنەی لێدەگرێت گۆڕانکارییە بنەڕەتیە مێتافیزیکیەکەیە.[18]

میتۆدی فینۆمینۆلۆجی دەستکەوتێکی گەورەیە، فەلسەفەی ڕاستەوخۆ بە بوونەوە(بیر بە بوونەوە) گرێداوە. فەلسەفەی لە ژوورە نسرمەکانی خوێندنگاکانەوە بۆ نێو ڕووداوەکانی ژیان گواستۆتەوە. گلەیی هایدیگەر لە هوسرڵ (داهێنەری

[18] Martin Heidegger. *Ontology: The Hermeneutics of Facticity*, p. 55

ئەم میتۆدە ڕادیکاڵە) لەوێدایە، کە هوسرڵ لەگەڵ نەریتە فەلسەفیە زاڵەبوەکەی دێکارتدا ماوەتەوە و بەڵگەی ناپێویست بۆ مانەوەی ئەو نەریتە نا پێویستە دەهێنێتەوە. گۆڕانکاری بنەڕەتی لە بیرکردنەوەی فە لسەفیدا لەو کاتەدا سەرهەڵدەدات، کە نەریتی زاڵبووی سەردەم ڕەتبدرێتەوە. بیرکردنەوە فەلسەفیە نوێکە تێگەیشتنێکی نوێی لە زەمینەیەکی نوێترەوە بۆ (بوون) هەبێت. قۆناخی دووەم لە بیرکردنەوەی فەلسەفی هایدیگەردا بە قۆناخی پاش(بوون و کات) یان (هایدیگەری دوایی) ناسراوە. لەم قۆناخەدا هایدیگەر هەوڵدەدات ئەو پرۆژە ئۆنتۆلۆجیە تەواو بکات، کە لە قۆناخی یەکەمەوە دەستیپێکردووە. گۆڕانکارییەکان لە شێوازی توێژینەوە و بەکارهێنانی زاراوە فەلسەفیەکاندا پەیوەندییان بەناوەڕۆکی پرۆژەکەیەوە هەیە. لە کاتیکدا هایدیگەر زیاتر جەخت لەسەر واتای (بوون) نەک بوونی مرۆڤ لەم قۆناخەدا دەکات، وابەستە بە گەشەکردنی ئەو قۆناخەی لە توێژینەوەکەیدا پێیگەیشتوە. توێژینەوەکەی لە نێو بازنە هێرمنیۆتیکیەکەیدا لە بوونی مرۆڤەوە بۆ (بوون) بەگشتی خراوەتە گەڕ. گۆڕانکاریەکانیش لە بەکارهێنانی زاراوەدا، لە ڕاستی بوونەوە بۆ واتای بوون، لە (*Sein*) وە بۆ (*Syen*) و جەختکردن لە سەر هونەر و ژیانی هونەرمەندانە بۆ دازاین لەسەر تێگەیشتن بۆ (بوون) ڕاگیراون. لێرەدا، لەم قۆناخەی شارستانیەتدا، کە بە قۆناخی تەکنەلۆجی دەناسرێت، هایدیگەر بۆچوون و لێکدانەوەی خۆی بۆ شارستانیەت و بیرکردنەوەی فەلسەفی ئەمڕۆ هەیە. هونەر بەهێزی ڕزگارکەر و بەرەنگاری دژی دەستەڵاتی تەکنەلۆجیا



دادەنێت، کە لە دواییدا باسیدەکەین و لەمەڕ واتای بوون و چیەتی تەکنەلۆجیا و هونەر دەکۆڵینەوە.

# بەشی دووەم
# بیرکردنەوەی فەلسەفی و کێشەی بنەڕەتی بوون

یەکێک لە کێشە گرنگەکانی بیرکردنەوەی فەلسەفی بنەڕەتی بوونە. ئەم کێشەیە لەگەڵ سەرهەلدانی ئەم شێوە بیرکردنەوەیەدا، کە بە (فەلسەفە) ناوزەددەکرێت، لە سەرەتای سەرهەڵدانیەوە خۆی لەگەڵدا ماندوو کردووە. لەو سەرەتایەوە شوێنکەوتوانی بیرکردنەوەی فەلسەفی هەوڵیان داوە دوورترین و لە هەموو شتێکیش بنەڕەتی تر بدۆزنەوە. بنەڕەتەکەشیان لە ژوور هەموو شتێکەوە بە بنەڕەتێکی لە بنەڕەتبەدەر داناوە. هاوکات، بەتایبەتی لە پاش ئەریستۆوە گەڕان بە دوای بنەڕەتی لە بنەڕەتبەدەردا بە (مێتافیزیک) ناسراوە، بەڵام ئێمە بۆ ئەوەی، مێتافیزیکی هایدیگەر لە شێوەمێتافیزیکەکانی دیکە جیا بکەینەوە زۆرجار زاراوەی(ئۆنتۆلۆجی) بۆ ئەم گەڕان و توێژینەوەیە دادەنێین. ئەمەش بێهۆنیە و بۆ ئەو خاڵە دەگەرێتەوە، کە مێتافیزیکی هایدیگەر کالآی (تیۆلۆجی) لەبەردانیە و تیۆ- ئۆنتۆلۆجی نیە. بۆ ئەم بیریارە مێتافیزیک گەرانە بە دوای بنەرەتی لە بنەڕەتبەدەر، بەبێ ئەوەی ئەوبنەڕەتە بە پرنسیپاڵێکی بەرز، وەکو جوڵێنەری یەکەمی ئەریستۆیی، لە داکەوتی بەردەستەوە دوور و جیاواز بێت دادەنرێت. لە میتافیزیکی هایدیگەردا بنەڕەتی لە بنەڕەت بەدەر



زەمینەی هەموو شتێکە. بوونی هەموو شتێک لەسەر ئەو زەمینە ڕادەوەستێت و لە زەمینەکەی دانابڕێت، یان زەمینەکە ڕاستەقینە و بوونێکی بەرزو ژوورتری نیە. بێبنەڕەتی ئەم بنەڕەتەش، سەرەنجامێکی زەروریيە. ئەگەر بنەڕەت بەبێ بنەڕەت دانەنریت و بوونیکی دیکە لە پێش ئەم بنەڕەتەوە هەبێت، ئەوا ئەم بنەڕەتە بە ڕاستیەکی لە پێشتر و لە بنەڕەتبەدەر دانانرێت. لە بنەڕەتبەدەری پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجیە بۆ بوونی ئەو بنەڕەتە. ئاماژەکردنیش بۆ بنەڕەتەکە لە هەرچ شێوازێکی بووندابێت ئەستویی یان گیانەکی وابەستە بە گرنگێتی بنەڕەتەکەو چۆنیەتی توێژینەوە فەلسەفیەکەوە. ناگونجێت بیریارێکی ماتەریالیست پەنا بۆ ڕاستیەکی گیانەکی بەرێت و بە بنەڕەتی دابنێت. چۆنیەتی توێژینەوە و باوەڕە مێتافیزیکیەکەی ڕێگەنادات بەو ئاکامە بگات. هەروەها ئەو بیریارە دەروانێتە چیەتی بنەڕەتەکە و دەیەوێت بزانێت، کە چۆن ئەو بنەڕەتە خۆی لەسەر زەمینەی بنەڕەتێکی دیکە دانەکۆتاوە. ئەم کارەش، بە پێچەوانەی باوەڕە مێتافیزیکیەکەی ئەریستۆ، بۆ جوڵێنەری یەکەم وەکو بنەڕەتی لە بنەڕەتبەدەر بە ستێنیکی پتەو و لۆجیکمەندانەی هەیە. دەبێت بگەینە ئەو باوەڕەی، کە هیچ ڕاستییەکی دیکە لە ژوور ئەم بنەڕەتەوە نیە، چونکە بنەڕەتەکەمان زەمینەیەکی ئۆنتۆلۆجی و لە پێشترە بۆ هەموو هەبوویەک. ئەریستۆ، لەم بۆچوونەیدا، لە دوو ڕووەوە کێشەیەکی ئاڵۆز و بناخە لەقی قووتکردۆتەوە. لەلایەکەوە جوڵێنەری یەکەم، کە بەو بنەڕەتە لە

بنەڕەتبەدەری داناوە، بوونێکی هەمەکی و گشتگر نیە بەڵکو جۆرێکە یان شێوەیەکی بوونە. جۆرێکیش لە بوون بە خسڵەتە ناوەڕۆکییە تایبەتیەکانەوە، نابێت بە بنەڕەتی هەبووە فرەجۆر و خسڵەتە جیاکان. لەلاکەی دیکەوە، ڕێگەی گەیشتن بەو ئاکامەی جولێنەری یەکەم بە بنەڕەت دادەنێت ناکۆک و خۆبەزێنە. لەو باوەڕەدایە، کە هەموو هەبوویەک هۆیەکی هەبێت. مادامەکی جیهانیش هەیە ئەوا پێویستە هۆیەک هەبێت جیهانی پەیداکردبێت. ئێمە دەتوانین هەمان بەڵگە بۆ بوونی ئەو هۆیەش (جولێنەری یەکەم) بەکاربهێنین. جولێنەری یەکەمیش، مادامەکی هەیە، دەبێت هۆیەک بۆ بوونی هەبێت، یان هیزێکی دیکە هەبێت بوونی ئەوی ئافەرید کردبێت. بەم جۆرە توێژینەوەکەمان و گەڕان بە دوای بنەڕەتتدا دەبێت بەگەڕانێک نەبڕاوە و لە کۆتایی بەدەر. بۆ ئەوەی خۆمان لەم گەشتە نەبڕاوەیە ڕزگاربکەین باشترەجولێنەری یەکەم، یان هۆی بوونی ئەم جیهانە، بە یەکەم هۆ و هۆیەکی بێهۆ دابنێین.[19]

بنەڕەتی لە بنەڕەتبەدەر بێجگە لەوەی نابێت بنەڕەتێکی لە پێشتری هەبێت، پێویستە بنەڕەتی هەموو هەبوویەک بێت. هەبووەکان بەبێ ئەم بنەڕەتە نابن و بیریشیان لێناکرێتەوە. تەنانەت نەبوونی ئەوانیش لە بەر ڕۆشنایی

[19] Aristotle. “Metaphysics”, in *Complete Works of Aristotle*, vol. 2, (ed.) Jonathan Barnes, Princeton: Princeton University Press, 1995. Book II, 994b 1- 15, p. 1571



ئەم بنەڕەتەدا دەناسرێت. لەم ڕووەوە بنەڕەتی لە بنەڕەتبەدەر لە هەموو شتێک زیاتر گشتگرە و بناخەی هەمووشیانە. ئەگەر هەبوویەکی گیانەکی بەبنەڕەت دابنرێت، ئەوا پێویستە بزانین، کە جۆرێکی دیکەی هەبووەکان هەیە گیانەکی نیەو ئەستویی (ماتەر) ییە. هەروەها هەبوویەکی ماتەریش بەو بنەڕەتە دانانرێت چونکە لە وانەیە هەبوویە ک هەبێت لە ماتەر بەدەربێت و بۆ بنەڕەتێکی ئەستویی نە گەڕێتەوە. ئەوەی لە هەمووشتێک گشتگرترە تەنیا(بوون) ە، کە هەموو شتێک لە سەری ڕادەوەستێت و لەبەر ئەو هەیە. (بوون) ی هەمووشتێک ڕاستەقینەیەکی لە پێشتر و بنەڕەتی ئەو شتەیە. لە مێژووی بیرکردنەوەی فەلسەفیدا، بەو جۆرەی هایدیگەر ئاماژەی بۆ کردووە، تێگەیشتن لە (بوون) و ڕاستی بوون بە پێنج قۆناخدا تێپەڕیوە : قۆناخی پێش سوکرات، سەردەمی ئەفلاتون، سەدەکانی ناوەڕاست، سەردەمی تازەگەرایەتی و سەردەمی ئەمڕۆ.[20] لە قۆناخی یەکەمدا یۆنانیەکان لەمەڕ ئەو بنەڕەتە دواون و(بوون) یان بە هیچ شتێک و هەبوویەک دانەناوە. بوون بۆ ئەوان ئەو ڕاستیە بووە، کە لە هەموو شوێنێکدا خۆی دەرخستەوە و بەرجەستە بووە [21]. ئەم بۆچوون و تێگەیشتنە، لە واتای بووی بەتایبەتی لای پارمەنیدس و فیرگە فەلسەفیەکەی

[20] هایدیگەر ئەم قۆناخانە بە (مێژووی بوون) ناوزەد دەکات.

[21] Martin Heidegger. *An Introduction to Metaphysics*, p. 14

کێشەیەکی هەرە گرنگی فەلسەفە بووە. پاش ئەم قۆناخە لەگەڵ سەرهەڵدانی نەریتی مێتافیزیکی ئەفلاتون و سەرهەڵدانی شارستانیەت و ڕۆشنبیری ڕۆماندا ڕاستی و واتای ئەو بوونە خرایە پەراوێزەوە و لەبیرچووەوە. لە بری بوون هەبوویەک، کە خۆی پێویستی بە بوونە بۆ ئەوەی هەبێت، بەو ڕاستیە و بنەڕەتە لە ژوور هەبووەکانی دیکەوە دانراوە. ڕۆمانیەکانیش لەبەر کاریگەرێتی ئەم شێوە مێتافیزیکەدا زمانی فەلسەفی یۆنانیان وەرگێرایە سەر زمانەکەی خۆیان و زۆر زاراوەی گرنگ بە جیاواز تر واتاکانیان لێکدرایەوە. بۆ نموونە زاراوەی فیزیک Physics یان *Physis* بە یۆنانی، کە واتای سەرهەڵدان، خۆ-دەرخستن، خۆ ڕاگرتن و بەردەوامبوون دەبەخشێت وەرگێڕا بۆ سروشت *natura*.[٢٢] ئەمەش تەسککردنەوەی ئاسۆی فراوانی زاراوە فەلسەفیەکە و ڕاستی بوونە بۆ جۆرێک یان لایەنێکی بوون. سروشت بەشێکە لە بوون و لایەنێکی ڕاستیە کە یەو هەمووی نیە. تەماشاکردنی ئاسمانی پان و بەرین لە کلاورۆژنەیەکی تەسکەوە بەشێکی پانتایی ئاسمان دەردەخات. ناتوانرێت ئەو بەشە بکرێت بە چیەتی ڕاستی و لە ژوور هەموو بەشەکانی دیکەوە ڕیزبکرێت. هەڵسان بەم کارە و تیڕوانین لە و کلاورۆژنەیەوە توشی کێشەی گوێنەدان بە ڕاستی بوون و فەرامۆشکردنی، یان لە بیرچوونی ئەو ڕاستیەمان دەکات. بیرکردنەوەی فەلسەفی لە قۆناخی دووەمەوە و لە سەردەمی ئەفلاتونەوە هەوڵیداوە

[22] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ١٥



لەو کلاورۆژنەیەوە بڕوانێتە ڕاستی بوون. بەشێک لە بوونی بە بنەڕەت و بەرز داناوە. هاوکات، ئەم بنەڕەتەی لە کاریگەرێتی کات و گۆڕانکارییەکان دوورخستۆتەوە و بە ڕاستیەکی چەقوەستاو و هەمیشە نەگۆڕی داناوە. پاش ئەفلاتون ئەم نەریتە بە بەردەوامی ماوەتەوە و هەرجارە بەبێ گۆڕانکاری بنەڕەتی لە بۆ چوونە مێتافیزیکیەکەیدا دەستکاریکراوە. ئەریستۆ (بیری چاکەی ڕەها) ی ئەفلاتونی بۆ (سەدەمی هۆشەکی) یان (جوڵێنەری یەکەم) گۆڕیوە و لە کەلتووری ئایینی ڕۆژئاوادا لەسەدەکانی ناوەڕاست ئەم لایەنە بەرزەی بوون بووە بە (خوا). لەسەردەمی تازەگەریشدا ئەم نەریتە بەردەوام مایەوە و بوو بە نەریتی دێکارتی و دوا فەیلەسوفیش نوێنەرایەتی ئەم شێوازە مێتافیزیکە بکات و ئاوەڕ لە (بوون) نەداتەوە و ڕاستی بوون بۆ لایەنێک نەک هەموو بگەڕێنێتەوە (نیتشە) یە. هایدیگەر لە بیرچوون و دەستهەڵگرتن لە بوون بە هیچگەرایەتی *Nihilism* دادەنێت. لە هیچگەرایەتیدا (بوون) بە (هیچ) دادەنرێت و ئاوەڕ لە لایەنێکی بوون دەدرێتەوە و ئەو لایەنە بە (ڕاستی) دەخوێنرێتەوە.[٢٣] بە دیدی من، لەبەر

[23] هایدیگەر لە سێ بەرهەمدا واتای هیچگەرایەتی ڕوونکردۆتەوە و بەم شێوەیە باسیدەکات. لەبەر ئەمەشە، لەوانەکانی لەسەر نیتشە، ئەم فەیلەسوفە بەدوا ڕابەری هیچگەرایەتی دادەنێت. بڕوانە:

Martin Heidegger. *Nietzsche*, vol.4, David Farrell Krell (ed.), New York: Harper Collins, 1982. Pp. 198- 203

بەستنەوەی بیرکردنەوەی مێتافیزیکی نیتشە بە ئەفلاتونەوە هایدیگەر هیچگەرایەتی نیتشە بە کلاسیکی دادەنێت .[٢] لەو کاتەوە لەگەڵ سەرهەڵدانی نەریتی مێتافیزیکی ئەفلاتونی تاکو ئەمڕۆ، کە سەردەمی تەکنەلۆجیایە، ڕاستی بوون لە بیرچۆتەوە. بە درێژایی ئەم سەردەمانە بیرکردنەوەی فەلسەفی لە ڕاستی بوون و بنەڕەتی لە بنەڕەتبەدەری هەبووەکان و خۆمان نامۆ کراوەو نەیتوانیوە بیناسێتەوە. سەردەمی ئەمڕۆش لە ژێر کاریگەرێتی هەمان نەریتی هیچگەرایەتیدا بە دەزگای تەکنەلۆجیا و بیرکردنەوەی ماتماتیکی خۆی سەقامگیرکردووە. لە نێو ئەم بارودۆخەدا، کە (جیهانێکی تاریک) ی پیکهێناوە، جیهانێک تێدا هەموو (ئازادی و داهێنانێک بە ناشرین دەبینرێت )[٢٥] ، بیرکردنەوەی

---

هەروەها: Martin Heidegger. *Contributions to Philosophy* *(From Enowning)*, pp. 96-97

[24] هیچگەرایەتی کلاسیکی زاراوەیەکە هایدیگەر بۆ هیچگەرایەتی نیتشە بەکاریهیناوە. لە زاراوەی هیچگەرایەتی بەرنامەگەرییەوە دوورە، کەمن لە پەڕتووکەکەمدا(نیتشە و پاش تازەگەری) بۆ تیگەیشتن لە فەلسەفەی نیتشە ئاماژەم بۆ کردووە. بروانە : محەمەد کەمال، نیتشە و پاش تازەگەری، سلێمانی، دەزگای سەردەم، ٢٠٠٦. لاپەرە ٢٢٠

[25] Martin Heidegger. *An Introduction to Metaphysics*, p. 38



فەلسەفی و بوونی مرۆڤیش خراونە تە پەراوێزەوە. سەرهەڵدانی ئەم جیهانە تاریکە ئاکامی لە بیرچوون و وازهێنانە لە ڕاستی بوون. نامۆ بوونە لە ڕاستی، کە مرۆڤ توشی بارو دۆخێکی خنکێنەر دەکات و ڕێگەی نادات (پرسیاری مەزن) بکات و ڕەسەنانە لە واتای بوون بکۆڵێتەوە. دۆڕاندنی دەستەڵاتی پرسیارکردن خسڵەتێکی گرنگی نامۆ بوونە. لە بەرئەوەی بیرکردنەوەی فەلسەفیانە بە بەردەوامی خۆی بە پرسیارە مەزنەکانەوە ماندوو دەکات هیچگەرایەتی و دەزگای تەکنەلۆجیای هیچگەرایەتی و نامۆیی نابن بە سەرچاوەی سەرهەڵدانی پرسیارەکان.[٢٦]

سەردەمی تەکنەلۆجیا نامۆییە و سەردەمی پرسیار نەکردنە. دابڕانی بیرکردنەوەی فەلسەفەلە بابەتە بنەڕەتیەکەی، کە لێرەدا بووە بە لە بیرچوون و بە پەراوێز کردنی بوون یان بە (هیچ) دانانی بوون، بەشێوەیەکی ترلەلای هیگڵ باسکراوە. بۆ ئەم بیریارەش دابڕانەکە نامۆ بوونی ئاگامەندییە لە بابەتەکەوە، کە لە ئاکامی توێژینەوە ئەپستمۆلۆجیەکەی (کانت) ەوە سەریهەڵداوە. ئەم نامۆ بوونەش بۆتە هۆی شاردنەوەی ڕاستی. ئەگەر ئاگامەندی لە ڕاستی بوون دابڕێت و نەتوانێت بیناسێت ڕۆڵێکی کردەگی لە گۆڕانی خۆی و داکەوتەکەیدا نابێت. ئاگامەندییەکی نامۆ و راستی نەناس دەستەڵاتی گۆڕانکاری

---

[26] Martin Heidegger. *Contributions to Philosophy (From Enowning),* p. 86

ووندەکات و لە نێو بارودۆخی (ڕووخان) دا دەژی . کەوابوو، کاتی ئەوە هاتووە سەرەتایەکی نوێ بۆ بیرکردنەوەی فەلسەفی بدۆزینەوە و لە نامۆیی و ڕووخان ڕزگاربکرێت. سەرەتایەک، کە خۆی بە پرسیارە مەزنەکانەوە ماندووبکات و وەڵامیان بداتەوە. پرسیاری مەزنیش سنوورەکانی بیر کردنەوەی زانستیانە و نەریتی مێتافیزیکی ئەفلاتونی دەبڕیت و خۆی بە بنەڕەتێکی لە بنەڕەتبەدەری گشتگر دەگەیەنێت. بنەڕەتێک، کە ئەم یان ئەو شتە نیە، بەڵکو بناخەی هەموویانە.

بنەڕەتێکە هەبووەکان بەبێ ئەو نابن، هاوکات ئەویش نین. مەزنترین پرسیاریش لەم سەرەتا نوێیەدا سەبارەت بە واتای (بوون) ە *Seinfrage* ، چونکە بوون بنەڕەتی هەموو شتێکە بەڵام خۆی بێبنەڕەتە.[٢٧] پێش مامەڵە کردن لەگەڵ وەڵامی پرسیارەکە سەبارەت واتای بوون پێویستە بزانین هۆی ئاوەڕنەدانەوەی فەیلەسوفەکان لە ئەفلاتونەوە لە (بوون) چیە. لێرەدا ئەم پرسیارە خۆی دەسەپێنێت، بۆچی (بوون) لە مێژووی بیرکردنەوەی فەلسەفیدا لە ئەفلاتونەوە لە بیرچۆتەوە و ئەم فەیلەسوفانە ڕوویان لە (هەبوو) یەک

[27] Martin Heidegger. *Being and Time*, translated by John Macquarrie and Edward Robinson, Oxford: Blackwell, 1997. P. 1



کردووە [٢٨]؟ خۆ دوورخستنەوەی ئەم بیریارانە لە گەڕان بە دوای واتای بووندا لەسەر سێ بنەما ڕاوە ستاوە. ئە وان لەو باوەڕەدان، کە (بوون) هەمەکی ترین چەمکە، بەڵگەنەویستە و پیناسیشناکرێت.[٢٩] ئەم سێ بنەمایە بوون بە دۆگما و هاندەر بۆ لە بیرچوونی بوون. لە پێش هەموویانەوە ئەو خاڵە ڕووندەکەینەوە کە (بوون) بە چەمک دادەنێت. وە کو دە زانین چەمکەکان بوونیکی بابەتی و سەربەخۆیان لە دەرەوەی بیرکردنەوە دا نیە. بەڵام دەشێت نوێنەرایەتی بابەتێک لە دەرەوەی بیرکردنەوەدا بکەن. من دەڵێم (دەشێت) چونکە مەرج نیە بابەتی هەموو چەمکێک لە دەرەوەی بیرکردنەوەدا بدۆزرێتەوە. هەندێک چەمک نوێنەرایەتی بابەتێکی دەرەکی ناکەن و بیرکردنەوە دایهێناون. بۆ نموونە چەمکی (ئەسپی باڵدار) نوێنەرایەتی بابەتێکی دەرەکی ناکات. ئەگەر بوونیش بە چەمک دابنرێت پێویستە لە ڕیزی یەکێک لەم چەمکانە دابنرێت. ئەوەبسەلمێنرێت، کە چەمکی بوون نوێنەرایەتی بوونێکی دەرەکی دەکات یان، وەکو چەمکی (ئەسپی باڵدار) ئەو

[28] (بوون) و (هەبوو) دوو شتی جیاوازن. (بوون) بنەڕەتی (هەبوو) ە کانە و هایدیگەر بەزمانی ئەڵمانی زاراوەی (*Sein*) ی بۆ داناوە. (هەبوو) بوونێکی هەندەکییە و بە ئەڵمانی پێیدەوترێت *Seinden* لە زمانی ئینگلیزیدا جیاوازی نیوانیان بە نوسین دیاری کراوە Being بە پیتی گەورە B بۆ بوون و being بە پیتی بچوکی b بۆ هەبوو بەکاردێت.

[29] Martin Heidegger. *Being and Time*, pp. 22

نوێنەرایەتیەش دەدۆڕێنێت. لە حاڵەتی یەکەمدا، ئاماژە بۆ (بوون) وەکو داکەوتێکی بابەتی لە دەرەوەی بیرکردنەوەدا دەکەین. بەڵام ئایا بوون شتێکە پەنجەی بۆ ڕاکێشین و لە بەردەستدا مامەڵەی لەگەڵدا بکەین؟ نەخێر. (بوون)، کە بابەتی توێژینەوە فەلسەفیەکەمانە و پرسیارە هەرەمەزنە فەلسەفیەکە خۆی پێوەماندودەکات، شتێکی هەندەکی، وەکو ئەم مێزە و ئەو درەختە نیە لە دەرەوەی بیرکردنەوەدا ئاماژەی بۆ بکرێت. هاوکات ڕاستیەکە، کە مێز و درەختەکە بەبێ ئەو نابن. مێز و درەخت تاکو (بوون) یان نەبێت ناناسرێن. نە دۆزینەوەی (بوون) لە دەرەوەی بیرکردنەوەدا زۆر بیریاری گەیاندۆتە ئەو هەڵوێستەی (بوون) ڕەتبدەنەوە و بەشتێکی ڕاستی دانەنێن و پەنا بۆ( ناوەڕۆک) بەرن. ناوەڕۆک بەو بنەڕەتە دابنێن، کە بوونی هەموو شتێکی لەسەر رادەوەستێت. ئەفلاتون یەکێکە لەو بیریارانەی بەم باوەڕەگەیشتوە. ئایدیا، کە فۆرمی هەمەکی و ڕاستەقینەی هەموو شتێکە. هیچ شتێک بەبێ ئەو ناوەڕۆکە بەرزەنیە. سوهرەوەردیش، کە خۆی بە شوێنکەوتوی ئەفلاتون دادەنێت پێشەوای ئەم جۆرە بیرکردنەوە یەو مێتافیزیکی ناوەڕۆکگەرییەو لە پەرتووکەکەیدا (حکمة الاشراق) بە درێژی لەمەڕ ئەم خاڵەی نوسیوە. هەوڵیداوە بیسەلمێنێت، کە (بوون) چەمکێکە لە ڕیزی چەمکەکانی دووەم، وەکو چەمکی ئەسپی باڵدار نوێنەرایەتی بابەتێکی دەرەکی ناکات و بوونێکی ناوەکی و بیرەکی هەیە. ئێمە لە ناسینی



بابەتێکدا هەمیشە ئاماژە بۆ ناوەڕۆکی دەکەین و لە مەڕ(بوون) ی بابەتەکە نادوێین .[٣٠] ئەم شێوە مێتافیزیکە(ناوەڕۆکگەرێتی)یە لە سەردەمی سەفەوییەکاندا لە ئێران بوو بە بناخەی فێرگەی فەلسەفی لە ئەسفەهان و لە دواییدا لە تاران. بەڵام سەدرە ئەلدین شیرازی، کە بە (مەلاسەدرە) ناسراوە لەم نەریتە یاخیبوو. بەپێچەوانەی سوهرەوەردی و شوێنکەوتوانی فێرگەی ناوەڕۆکگەرایەتییەوە، کە خۆشی یەکێک بوو لەوان، (بوون) ی پێش (ناوەڕۆک) خست و فیرگەی بوونگەرایەتی دامەزراند.

من لێرەدا بۆ مەبەستی ڕوونکردنەوەی نزیکی ولێکچونی بیروباوەڕە فەلسەفیەکانی سوهرەوەردی ئەو نەریتە فەلسەفیە ڕۆژئاوایەی لە ئەفلاتونەوە بوونی خستۆتە پەراوێزەوە ئەم بەراوردەم کردوە. هایدیگەر ئاگاداری ئەم مشتومڕەی نێوان بیریارانی ناوەڕۆکگەرێتی و بوونگەرێتی لە ئەسفەهان و شیراز نەبووەو سەردەمەکەشی جیاوازە. بەڵام نکۆڵی لەوە ناکرێت، کە لە هەندێک ڕووەوە، ئەم دوو شێوە بیرکردنەوەیە لە دوو شارستانیەت و سەردەمی جیاوازدا لە یەکدی دەچن.

[30] شەهاب ئەلدین سوهرەوەردی (شیخ الاشراق) لە ساڵی ١١٥٣ لە گوندی سورەبەردی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە دایکبووە و ساڵی ١١٩١ بە تاوانی زەندیە، بە فەرمانی سەلاحەدینی ئەیوبی خراوەتە زیندان و کوژراوە.

بنەمای دووەمی دۆگماکە گوایە بوون بەڵگە نەویستە و ناتوانرێت باس لە شتێک بکرێت تاکو ئەو شتە بوونی نەبێت لە گەڕان بە دوای واتای بوونمان دوورناخاتەوە. مەبەست لە توێژینەوەکەمان سەلماندنی بوونی (بوون) نیە، بەڵکو لێکدانەوەی واتاکەیەتی. بنەمای سێیەمیش لەسەر زەمینەی ئەو باوەڕە دامەزراوە، کە مادامەکی (بوون) هەمەکیترین چەمکە و چەمکێکی لە خۆی بەرزتری نیە ئەوا بە گوێرەی لۆجیکی ئەریستۆ پێناسناکرێت. بۆ ئەریستۆ پێناسە(جنس) و (جیاوازیی) دەرخستنە. لە پێناسەکردنی مرۆڤدا، وەکو ئاژەڵێکی ژیر، ئاژەڵ (جنس)ە و ژیری جیاوازی ئەم ئاژەڵەیە لەگەڵ ئاژەڵەکانی دیکەدا. چەمکی بوون لە هەموو چەمکێکی دیکە بەرزترە و جیاوازیشی نیە. لەبەر ئەمە پێناسناکرێت. ئەم بنەمایەش زەمینەیەکی پتەوی نیە. لە لایەکەوە یاسای پێناسکردنی ئەریستۆ، کە دوایاساو تاکە یاسانیە، بەسەر چەمکێکدادەسەپێت، کە(جنس) و(جیاوازی) هەبێت. لە لایەکی دیکەوە، مەرج نیە چەمکێک نەخرێتە بەر ڕۆشنایی ئەم یاسایەی ئەریستۆ وازیلێبهێنریت. پێویستە ڕێگەیەکی دیکە بۆ تێگەیشتن لە واتای ئەو چەمکە بدۆزرێتەوە. هایدیگەر، بەم جۆرە، ئەو سێ بنەمای دۆگمایە هەڵدەوەشێنێتەوە. پێویستکردنی پرسیار وسەبارەت بە واتای (بوون) زیندوو دەکاتەوە.

تێگەیشتنمانلەبوون و واتای بوون لە نێو کاڵایەکی ڕەشدا پێچراوەتەوە. ئەمەش لە خۆیدا پێویستیەک بۆ



سەرهەڵدانی پرسیارکردن لە بارەی واتای بوونەوە فەرزدەکات.[٣١]

پرسیارکردن دەستەڵات و خسڵەتێکی مرۆڤانەیە. خولیای گەڕان و توێژینەوەو تێگەیشتن لە شتە نەناسراو و نەزانراوەکان دەردەخات و ئارەزووی هەڵوەشاندنەوەی دۆگما دامەزراوەکانیشە. ئاماژە بۆ دەستەڵاتی هەڵوەشاندنەوە و دامەزراندن لە بوونی تێگەیشتنمان لە بوون و واتای بوون لە نێو کاڵایەکی مرۆڤدادەکات. مرۆڤ لە پرسیارکردندا دەستەڵاتی خۆی بەرجەستە دەکات و لە پێناوی هەڵوەشاندنەوەی دۆگمایەکی باوو دۆزینەوەی نەزانراوێکدا دەیخاتەگەر. لەبەر دەرخستنی ئەم دەستەڵاتەشە، لە نێو کەلتوورە سەرکوتکەرەکاندا، ڕێگە بە پرسیارکردن نادرێت. ئەو دەستەڵاتە بۆ مانەوە و بەردەوامی نەریتە سەرکوتکەرەکە داگیردەکرێت. ئەگەر ئەو نەریتە سەرکوتکەرە ڕێگە بە سەرهەڵدانی پرسیاکردنیش بدات،دەبێت دڵنیابێت لەوەی پرسیارکردنەکە بۆ هەڵوەشاندنەوەی خۆی نیە و وەڵامەکانیش بەئامادەکراوی و لە پێشتر دادە نرێن. لەم حاڵەتەدا پرسیاکردن و پرسیارنەکردن وەکو یەکن، چونکە ئەم پرسیارکردنەی ڕێگەی پێدراوە دەستەڵاتی هەڵواشاندنەوەی نیە. پرسیارکردنێکە، کە وەڵامەکەی لە نێو خۆیدا هەڵگرتوە و ئەوەی ئاڕاستەشی دەکات ڕەسەنانە ناڕوانێتە کێشەی

[31] Martin Heidegger. *Being and Time*, p. 23

پرسیاکردنە کە. پرسیارکردنی ڕەسەن، کە لەو پرسیارکردنەی نێو نەریتە سەرکوتکەرە کە وە جیاوازە، لەگەڵ بوونێکی ڕەسەندا لەو نەزانینەوە سەرهەڵدەدات، کە خواستی زانینی هەیە. گەڕانیکی ڕاستەقینەیە، نەک باو یان چاولێکەرانە بە دوای ڕاستیدا. پرسیاکردنی ڕەسەنانە مەترسیەکی گەورەیە بۆ سەر هەموو نەریتێکی سەرکوتکەرو دۆگمایەکی دامەزرێنراو چونکە بە دەستەڵاتی هەڵوەشاندنەوەی مرۆڤ گۆڕانکارییەکان دەهێنێتە کایەوە. پرسیارکردن سێ لایەنی گرنگ و پێکەوەگرێدراوی هەیە: پرسیارکەر، پرسیارکردن و ئەو بابەتەی پرسیاری لە بارەوەکراوە. پرسیارکەر بوونێکی ئاگامەندانەی هەیە، کە بەپرسیارکردن ئاگامەندێتی خۆی دەسەپێنێت. دەسەڵاتی پرسیارکردنی بۆ هەڵوەشاندنەوە و دامەزراندن بەکاردەهێنێت. پرسیارکردن ئەوە دەردەخات، کە پرسیارکەر ویستی گۆڕانی هەیە، بە دوای واتای نوێدادەگەڕێت. دۆزینەوەی واتای نوێش ڕەتدانەوەی واتا باو و کۆنەکەیە، کە لەگەڵ دۆزینەوە و دامەزراندنی واتا نوێکەدا هەڵدەوەشێتەوە. لێرەدا مەرج نیە بابەتی پرسیاکردنەکە بە تەواوی نەزانراوبێت. دەگونجێت هەندێک زانیاری دامەزراوی لە بارەوە لە ئارادابێت، یان شتێکی ناسراو بێت، بەڵام کاتی گۆڕینی زانیارییە دامەزراوەکانی هاتوە، چونکە ڕاستەقینەی ئەو بوونە بە تەواوی دەرناخەن. لەهەمانکاتدا دەشێ پرسیار لە بابەتێکەوە بکرێت، کە زانیاری لە بارەوە دانەمەزرابێت. لە هەردوو حاڵەتەکەدا پرسیارکردنەکە لە نەزانینەوە سەرهەڵدەدات و بە میتۆدی



هەڵوەشاندنەوە خۆی بە وەڵامێک دەگەیەنێت، کە لە پێشتر نەزانراوە. پێویستە وەڵامی هەموو پرسیارێک، کە دەکرێت جیاوازتربێت لە زانیارییە دامەزراوە لە پێشترەکە. لەم جیاوازییەدا گۆڕانکارییەکان سەرهەڵدەدەن و بیرکردنەوە بەرەوپێشەوەدەڕوات. بابەتی پرسیارکردنیش، کە لایەنی سێیەمە، شتێکە بە تەواوی یان بە ناتەواوی نە ناسراوە، بۆیە پرسیاری لە بارەوە دەکرێت.

پرسیارەکەمان، لێرەدا، لە بارەی واتای(بوون) ە. بوونیش بابەتێکی بەردەست و هەندەکی نیە. (هەبوویەک) نیە لە شوێنێکدا دانرابێت و بە ئاسانی بدۆزرێتەوە. ئەمەش خسڵەتی نا- ئاسانی بە پرسیارەکە دەدات. هەروەها (بوون) بنەڕەتێکی لە بنەڕەتبەدەری هەموو هەبوویەکە، بوونی هەموو شتێکە. لەبەر ئەمە پرسیارکردنەکەمان خسڵەتێکی دیکە وەردەگرێت. دەبێت بەمەزنترین پرسیار، چونکە خۆی لە قەرەی مەزنترین کێشە دەدات. پرسیارکردن سەبارەت بوون گرانترین و مەزنترین پرسیارکردنە. پێویستە وەڵامدانەوەکەشی گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی لە بیرکردنەوەی فەلسەفیدا دروستبکات. تێگەیشتنی ئۆنتۆلۆجی (مێتافیزیکی) لە پێشتر دامەزرێنراومان سەبارەت بە بوون هەڵبوەشێنێتەوە.

پرسیارکردن لە بارەی واتای (بوون) زەرورەت و پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجیە بۆ هەموو شێوە پرسیارەکانی دیکە لە بیرکردنەوەی فەلسەفیدا. لە بەرئەوەی(بوون)

بنەڕەتی هەموو شتێکە ئەم زەرورەتە دەردەخات و پێشمەرجبوونی ئۆنتۆلۆجیانەی خۆی دەسەپێنێت .[32]
پێویستە بیرکردنەوەی فەلسەفیانە، کە لە سەردەمی ئەفلاتونەوە توشی نامۆیی بووە، بەم پرسیارە هەرەگران و مەزنەوە خۆی ماندوو بکات و بنەڕەتی خۆی بناسێتەوە. ئەو بوونەی پرسیاری لە بارەوە دەکەین بوونی هەموو شتێکە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە ئێمە بە دوای بنەڕەتی هەموو شتێکدا دەگەڕێین. بنەڕەتێک هەموو شتێکی لەسەر دامەزرابێت و ئەو بنەڕەتەش، هاوکات، هیچ کام لەو شتانە نەبێت. لەم پێگەیەوە، دەگەینە ئەو باوەڕەی، کە دەمانەوێت ئۆنتۆلۆجیەک سەبارەت بەو بنەڕەتە پێکبهێنین. لە بەرئەوەی بابەتی ئەم ئۆنتۆلۆجیە، بە پێچەوانەی بابەتەکانی دیکەوە بنەڕەتێکی لە بنەڕەتبەدەرە، ئەم ئەنتۆلۆجیەش دەبێت بە (ئۆنتۆلۆجی بنەڕەتی) Fundamental Ontology [33] حەزدەکەم ئەو خاڵەش ڕوونکەمەوە، کە ئەم بۆچوونەی هایدیگەر لە بۆچوونی ئەریستۆوە، سەبارەت بە (فەلسەفەی یەکەم) و (ئۆنتۆ تیۆلۆجی) یەوە جیاوازە. ئەریستۆ لە نێو هەبووەکاندا ئاماژە بۆ هەبوویەکی بەرز دەکات و (ئەو) هەبووە بەرزە بە بوونی یەکەم دادەنێت. توێژینەوەش لەو بوونە بە فەلسەفەی یەکەم ناوزەددەکات. هایدیگەر باوەڕی بە هەبوویەکی بەرز، وەکو بوونی یەکەمی

[32] هەمان سەرچاوەی پێشو، لاپەڕە ٢٩

[33] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٣٤



ئەریستۆ نیە. ئەو بەدوای ڕاستیەکدادەگەڕێت، کە بوونی هەمووشتێکی لەسەر ڕادەوەستێت. لە بەر ئەوەی ئەو ڕاستیە بوونی هەموو شتێکە ئەوا بەرز Transcendent نیە. بەڵام هاوکات ئەو یان ئەم شتەش نیە. بۆیە دەتوانین بە بەرزی دابنێین. بەرزێتی ئەم ڕاستیە، بە پێچەوانەی بەرزێتی بوونی یەکەمی ئەریستۆوە، نەکەوتۆتە ژوور کات و شوێن و دیاردەکانەوە. ئەو ڕاستی کات و شوێن و دیاردەکانە و ئەوانیش نیە. وەکو چۆن بەبێ(بوون) هیچ شتێک نابێت، بەم جۆرەش بەبێ ئۆنتۆلۆجی بنەڕەتی شێوە جیاوازەکانی دیکەی ئۆنتۆلۆجی، وەکو ئۆنتۆلۆجیە ناوچە گەرییەکانیش نابن . توێژینەوەکانمان لەسەر سروشت و میژوو بەم ڕاستیەوە بەستراون [34]. ئۆنتۆلۆجی ناوچەگەرێتی، لە هەرچ لایەنێکی بوون بکۆڵێتەوە، پێویستی بە ئۆنتۆلۆجی بنەڕەتیە. ئەمەش تەنیا پێویستیەکی لۆجیکمەندانە نیەو هەموو لایەنیکی بوون لەسەر ئەو بنەڕەتە ئۆنتۆلۆجییانە ڕاگیردەکرێت.

توێژینەوە ئۆنتۆلۆجیە بنەڕەتیەکەمان مامەڵە لەگەڵ واتای بووندادەکات. لە پێشتریش باسمانکرد، ئەم بوونە شتێکی هەبوو نیە، بەڵکو بوونی هەمووشتێکە و بنەڕەتی هەموو هەبوو یەکە. هاوکات دۆزینەوەی (سەرەتایەک) بۆ دەستپێکردنی توێژینەوەکەمان دەبێت بە کێشە و خۆی فەرزدەکات. ئێمە، بۆ لێکۆڵینەوە لەواتای بوون، دەبێت لە

[34] هەمان سەرچاوە.

سەرەتایەکەوە دەست بە لێکۆڵینەوەکەمان بکەین. بەڵام ئەو سەرەتایە چیە و چۆنە ؟ چۆن هەڵیبژێرین؟ چی شتێک بکەین بەخاڵی دەرچوونمان؟

دۆزینەوەی ئەم سەرەتایە بۆ لێکۆڵینەوەکەمان هەنگاونانێکی گرنگ و(جدی) یە، چونکە لەو سەرەتایەوە بەکۆتایی گەشتەکەمان دەگەین. لەوێوە ڕێگەدەگرین و کۆتایی گەشتەکەمان دەبینین و وێڵ نابین. بەکورتیەکەی، لێکۆڵینەوەکەمان لە لایەنێکی ئەم بوونەوە بەرەو بوونە (هەموو) ەکە دەستپێدەکەین. ئەم لایەنە لە لایەنەکانی دیکەی بوونە هەمووەکە گرنگترە، بۆیە ئێمە کردوومانە بە سەرەتا بۆ گەشتەکەمان. لە تێگەیشتنمان لەم لایەنەوە بەرەو هەمووەکە دەڕۆین. کەوابوو، لە سەرەتاوە دەبێت لەبوونی ئەم سەرەتایە بکۆڵینەوە. لە واتای سەرەتاکە تێبگەین. ئەم تێگەیشتنەش بکەین بە پێشمەرج بۆ تێگەیشتنمان لەواتای بوونە هەمووەکە.

ئەو سەرەتایەی لێرەداخۆی دەسەپێنێت **بوونی مرۆڤە.** بوونێکە، کە ئاگامەندانە دەژی. ئاگامەندی ئەم بوونە تایبەتمەندێتی مرۆڤە و جیاوازییەکی بنەڕەتی لەگەڵ هەبووەکانی دیکە و ئەم بوونەدا دیاریدەکات. لەلایەکەوە مرۆڤ، وەکو هەبووەکان بوونێکی هەندەکی و ئۆنتیکی (ontic) ی هەیە و لە نێو جیهاندایە و لەڕیزی هەبووەکانە. بەڵام، لە سەرو ئەم شێوەبوونەوە مرۆڤ تاکە بوونێکە هەوڵدەدات لە واتای بوون تێبگات وپرسیار



لەبارەیەوەبکات. ئەمەش مرۆڤ لەخانەیەکی ژوورتردادەنێت و بوونێکی ئۆنتۆلۆجییانەی دەداتێ. بەم جۆرە ئەم سەرەتایەی ئێمە (هەبوو) یەک نیە، کەلە چوارچێوەی چیەتی خۆیدادەرنەچێت. بوونێکە بەهەبوو دادەنرێت و دانانرێت، چونکە ئۆنتیک- ئۆنتۆلۆجیە، یان ئەوبوونەیە، کە بەردەوام خۆی ڕەتدەکات و هەوڵدەدات لەواتای بوون تێبگات.[٣٥] خسڵەتی ئۆنتیک- ئۆنتۆلۆجیانەی ئەم بوونە لە دەستەڵاتی پرسیارکردندایە. بوونێکە بەو دەستەڵاتەوە بەردەوام لە پرۆسەی هەڵوەشاندنەوەو دامەزراندنی واتاکاندایە. ئەو، وەکو هەموو هەبووەکانی دەوروبەری شتێکە، کە هەیە، بەڵام بوونی ئەو لە بوونی هەبووە ئۆنتیکیە کانەوە جیاوازە و ئۆنتۆلۆجیانە یە. بوونی مرۆڤ، یان ئەم بوونە ئۆنیتکە- ئۆنتۆلۆجیە ئاگامەندە و پرسیارکەرە و تایبەتمەندێتی خۆی هەیە. ئەم تایبەتمەندێتیە، لە پێشتر لە لایەن فێرگە فەلسەفیەکانەوە باسنەکراوە، بۆیە دەبێت بە زمانێکی فەلسەفی نوێ لە واتای بوونی بکۆڵینەوە و بەو زمان وکاتیگۆرییانەوە گرێبینەدەین، کە هەبووەکانی پێناسەدەکرێت. لەم رووەوە، هایدیگەر ڕادیکاڵانە زمانێکی فەلسەفی نوێ دادەهێنێت و ئەم بوونە بە (دازاین) *Dasein* (بوون لێرە) ناوزەددەکات و کاتیگۆرییەکانی ئەریستۆ بۆ توێژینەوەی ئەم بوونە

[35] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٣٢

ڕەتدەكات.[36]

## دازاین و دەرچوون لە نەرێتی دێکارتی

هایدیگەر لە هەلبژاردنی ئەم زاراوەیەدا بۆ بوونی مرۆڤ مەبەستی تایبەتی خۆی هەیە. ئەو دەیەوێت گۆرانکارییەکی فەلسەفی بهێنێتەکایەوە و سەرەتایەکی نوێ لە بیرکردنەوەی فەلسەفیدا بدۆزێتەوە. ئەم کارەش بە پرسیارە مەزنەکەوە سەبارەت واتای بوون و لیکۆلێنەوە لە بوونی مرۆڤ، وەکو یەکەم هەنگاونان بۆ وەلامدانەوەی پرسیارەکەوەبەستراوەو دۆزینەوەی زمانێکی نوێی فەلسەفیانەیە. تێگەیشتن لە بوونی مرۆڤیش لەم سەرەتا نوێیەوە پێویستە لە نەریتە مێتافیزیکیەکەی سەردەمەکەی یاخیبێت و تەفسیرێکی دیکە بۆ ئەم بوونە بکات. بۆ ئەوەی باشتر لە تەفسیرە نوێکەی هایدیگەر تێبگەین با ئاوەڕێک لەو نەریتە فەلسەفیە بدەینەوە، کە هایدیگەر شۆڕشی بەسەردا دەکات و بزانین بوونی مرۆڤ لەو نەریتەدا چۆن لێکدراوەتەوە.

[36] ئەریستۆ دە کاتیگۆری لە پەرتووکەکەیدا ڕیزکردووە، کە لەبەر ڕۆشناییاندا دەتوانرێت لە واتای هەموو شتێک تێبگەین. کاتیگۆرییەکان لەم پەرتووکەی ئەریستۆدا بەم جۆرە ڕیزکراون کاتیگۆرین: (جەوهەر، چۆنیەتی، چەندەکی، پەیوەندی، شوێن، کات، باریان دۆخ، حاڵەت، کردار، کارتێکردن) بڕوانە : Aristotle. "Categories" in *Complete Works of Aristotle*, vol. 1, pp. 7-15



ئەو نەریتە فەلسەفیەی لێرەدا مەبەستمانە، نەریتی تازەگەرایەتیە، بە تایبەتی ئەو تازەگەرایەتیەی لەسەر زەمینەی مێتافیزیکی دێکارتی بناخەی داکوتاوە. مێتافیزیکی دێکارتیش لە بنەڕەتدا ئەریستۆیانەیەو دەتوانین نەریتەکە، بە شێوەمێتافیزیکی ئەریستۆ- دێکارتی دابنێین. بێگومان، هایدیگەر ئەم زاراوەیەی بۆ نەریتەکە بەکارنەهیناوە و لە ئەنجامی لێکۆلێنەوەو بۆچوونەکەماندا سەریهەلداوە. بەبیروڕای من نەریتی دێکارتی (تازەگەری) باشتر لە بەر ڕۆشنانی نەریتی ئەریستۆییدا دەناسرێت، چونکە بنەما مێتافیزیکیەکانیان بە یەکدی دەگەن. هەردووکیان دووەلیستانە دەڕواننە بوون و دەیگەرێننەوە بۆ دوو سەرچاوەی جیاواز و بەیەکنەگەیشتوی وەکو هۆش و ئەستو. هەریەکێک لەم لایەنانەی بوون دەتوانێت بەبێ لایەنەکەی دیکە هەبێت و بەردەوامیش بمێنێتەوە. هاوکات، ئەم بۆچوونە نکۆلی لە هەندێک وردە جیاوازی نێوان دوونەریتەکە ناکات. من نالێم دێکارت مندالی ئەریستۆیە و ئەم مندالەش بە تەواوی لە باوکی دەچێت. دەستپێکردنە فەلسەفیەکەی دێکارت بە(کۆجیتۆ) بەلگەنەویستەکەی لادانێکی ئاشکرایە لە ئەریستۆ، بەلام هێشتا دێکارت لە ئاکامی توێژینەوەکەیدا نەگەیشتوە بە باوەڕێک لە دۆگمای ئەریستۆوە جیاوازبێت. لەڕوانگە دووەلیستیەکەی دێکارتەوە هۆش(گیان) و ئەستۆ(ماتەر) دوو ناوەرۆکی جیاوازن. یەکەمیان نەگۆر و چەق وەستاوە و کات و شوێن، کە دووخەسلەتی ناوەڕۆکە ئەستۆییەکەن، کارناکەنە سەری.

هۆش بەم شێوەیە، لەودیو بوونی ئەستوییەوە پەیوەندی لەگەڵ رووداوەکانی نێو جیهانی ئەستوییدادەبەستێت. بەڵام پەیوەندییەکەی (زەروری) نیە. ئەو دەتوانێت بەبێ ئەستو هەبێت. بوونی مرۆڤیش وێنەیەکی بچوکی ئەم پەیوەندییە یە لە نێوان هۆش و ئەستودا. مرۆڤ هۆشە لە نێو ئەستو(لەش)دا.

هۆش و لەش لە بنەڕەتەوە دوو ڕاستەقینەی جیاوازن و بۆ دوو ناوەڕۆکی جیاواز و پێکەوە گرێنەدراو دەگەڕێنەوە. ئەم یەکگرتنە ناپێویست و قایمنەکراوە، لە کۆجیتۆکەی دێکارتدا بەئاشکرا دیارە. دێکارت لە کۆجیتۆکە دا(من بیردەکەمەوە، کەوابوو من هەم.) بیرکردنەوە بە خسڵەتی ناوەڕۆکی هۆشەکی و هەبوونیش بە ئەستویی دادەنێت. ئەم دوولایەنەش، کەلەپێشتر ئاماژەمان بۆکردن پەیوەندییەکی زەروریيان نیەو بە توندی پێکەوە گرێنەدراون. لەم بۆچوونەوە مرۆڤ لەش نیە، بەڵکو لەشی هەیە، یان لەشی پێدراوە. ئەو بوونێکی جیاوازترە، شتێکە لەودیوو ئەو بوونە ئەستوییەوە، کە لە ناو کات و شوێندادەبینرێت. لەبەر ئەوەی هۆش ناوەڕۆکێکی سەربەخۆیەو پێویستی بەئەستو بۆ بوونی نیە، ئەوا دەگەینە ئەو ئاکامەی، کەلەم شێوە مێتافیزیکەدا مرۆڤ بوونێکە(ناوەڕۆکێکی هۆشەکی) یان گیانەکییەو بەبێ (لەش) دەتوانێت هەبێت و بەتێکشکاندنی لەشی کۆتاییش بە بوونی نایەت.[٣٧]

[37] بۆ زیاتر تێگەیشتن لەم کێشەیە بڕوانە:



لە پێش هایدیگەردا بیریارانی فێرگەی ئەزموونگەری، وەکو جۆن لۆک و بارکلی و دایڤد هیوم ڕەخنەیان لەم بۆچوونەی دێکارت گرتووە. لە هەموویان گرنگتر(هیوم) ە، کە بوونی هۆش و بیرە زکماکییەکان ڕەتدەداتەوە. بەڵام ئەم بیریارانە ئاوەڕیان لە پرسیارە مەزنە فەلسەفیەکە سەبارەت بەواتای بوون نەداوەتەوە. هەرچەندە ئەم سێ بیریارە بە ئەزموونگەری ناسراون و سەرچاوەی سەرهەڵدانی زانین بۆ ئەزموونی هەستەکی دەگەڕێننەوە، بێجگە لە هیوم، کە بەتوندی ڕەخنە لە دێکارت دەگرێت و بیرۆکەی ناسنامەی ناوەڕۆکی هۆشەکی بە ئەفسانە دادەنێت، دوو بیریارەکەی دیکە باوەڕیان بەو ناوەڕۆکە بەشێوەیەکی دیکە هەیە و نەیانتوانیوە بە تەواوی ڕەتیبدەنەوە.[٣٨]

بوونی مرۆڤ، وەکو ناوەڕۆکێکی هۆشەکی و گرێدانی بە لەشەوە ئەوە دەگەیەنێت، کە مرۆڤ بوونێکی بەرزی هەیە و

René Descartes. “Meditations on First Philosophy”, in *The Philosophical Writings of Descartes*, vol. 2, Cambridge: Cambridge University Press, 1999. Sixth Meditation, pp. 50- 62

[38] David Hume. *A Treatise of Human Nature*, second edition, Oxford: At the Clarendon Press, 1985. Pp. 252-256

خزێنراوەتە نێو لەشەوە. بەرێگەی لەشەوە لە نێو کات و شوێندا مامەڵە لەگەڵ ڕووداوەکاندەکات. ئەم بوونە جیهانی نیە و سەر بە(ئێرە)نیە. جیهان نیشتمانی ڕەسەنی ئەو نیەو لێرە نامۆیە. بوونی لە نێو ئەم جیهانەدا سنوورکێشانە بە دەوری دەستەڵات و بیرکردنەوەیدا.

لە بەرئەوەی مرۆڤ بوونێکی هۆشەکی نادیارە لەودیوو لەشەوە، ئەوا بە(لەش) ناناسرێت. ئەو بوونە نادیارەشی ناکەوێتە بەر ڕۆشنایی ئەزموونەکانەوە. بەم جۆرە(من)، وەکو ناوەرۆکێکی هۆشەکی نادیار لە نێو لەشمدا بە شاراوەیی دەمێنمەوەو تاکو بەرێگەی بیردەربڕین و هەڵوێست هەندێک لەولایەنە شاراوەیەم دەرنەخەم کەسانی دیکە ناتوانن بمدۆزنەوە. کەسانی دیکە لەپەنجەرەی چاوەکانیانەوە دەڕواننەمن وتەنیالەشم دەبینن. منیش(ئەوان) نابینم، چونکە نە ئەوان و نەمن لەشین. دەستنیشانکردنی لایەنی هۆشەکی لەم بوونەدا و دوورەلایەنی ئەم لایەنە لە گۆرانکارییەکانی نێو کات و شوێن وابەستە بە خۆرسکی چەسپاوو نەگۆڕی ئەم لایەنەوە، کە لەپێشتر بە چەک و تفاقی زانینە زکماکیەکانەوە پەیدابووە.

بەم شێوەیە، بوونی مرۆڤ، لە نەریتی دیکارتیدا، ناوەرۆکێکی گیانەکی یان(شت) ێکە لە مێژوو ڕووتکراوەتەوە و خۆرسکێکی لە پێشترو نەگۆڕی پێدراوە. بوونێکە ناچار نەک سەربەست لەم جیهانەشدا خۆی بە بێگانە و نامۆ



دەبینێت. هایدیگەر بەرانبەر ئەم بۆچوون و تێگەیشتنە دێکارتیە نایار ڕادەوەستێت و ڕەتیدەداتەوە. دەیەوێت تەفسیرێکی نوێ بۆ بوونی مرۆڤ بکات و زاراوەی(ناوەڕۆکی هۆشەکی) بەکار نە هێنێت. ئەو پرسیارەی لێرەدا خۆی دەسەپێنێت ئەوەیە، ئەگەر بوونی مرۆڤ ناوەڕۆکی هۆشەکی و خۆرسکی نەگۆڕو لە جیهان ڕووتکراوە نەبێت، چۆنەو چیە؟ بۆ هایدیگەر مرۆڤ ناوەڕۆکی گیانەکی نیە و خۆرسکێکی نەگۆڕی پێنەدراوە. بوونێکە لیرەدا(دازاین) لە نێو جیهاندا و بەبێ جیهان نابێت.[39] ئەمەش دابڕانی ئەم بوونەیە لە هەموو بنەما و سەرچاوەیەکی نادیار و مێتافیزیکیەوە و گرێدانێتی بە جیهان و مێژووەوە. (دازاین) یش بوونێکی هەمەکی و فۆرمێکی بەرزی ئەفلاتونی نیە، لە هەمووحاڵەتێکدا ئەو بوونەیە، کە(من) م، یان(من) یەکێکم لە دازاینەکان[40]. ئەو کێشەیەی یەخەمان دەگرێت شێوازی

---

[39] Martin Heidegger. *Being and Time*, p. 27

هایدیگەر لە زۆر بەرهەمی دیکەدا زاراوەی (دازاین) ی بۆ بوونی مرۆڤ بەکارهێناوە و لە زمانە جیهانیەکانیشدا، بۆ نموونە ئینگلیزی ئەم زاراوەیە وەکو خۆی دانراوەتەوەو بووە بە زاراوەیەکی هایدیگەری فەلسەفی بۆ بوونی مرۆڤ، بۆیە منیش لە هەندێک شوێندا لەم نوسراوەدا زاراوە ئەڵمانیەکەم داناوەتەوە.

[40] هەمان سەرچاوەی پێشو. لاپەڕە ٧٨، هەروەها بڕوانە:

Martin Heidegger. *Zollikon Seminars*, translated by Fanz Mayr and Richard Askay, IIIionis: Norrthwestern University Press, 2001. P. 4

تێگەیشتنمانە لەم بوونە. چونکە با ئەوەمان لە بیرنەچێت، کە مەبەستی ئێمە لە توێژینەوەکەمان گەڕانە بە دوای واتای بووندا. ئێمە لە تێگەیشتنمان لە بوونی مرۆڤەوە(دازاین)، وەکو سەرەتاو یەکەم ویستگەی گەشتەکەمان خۆمان بە دوا ویستگە دەگەیەنین ودەمانەوێت لە واتای بوون تێبگەین. تێگەیشتنمان لە دازاین لەسەرزەمینەی ئۆنتۆلۆجیە بنەڕەتیەکە ڕادەوەستێت و لەم تێگەشتنەوە بەرەو تێگەیشتن لە واتای بوون ڕێدەکەین. لە بەشێکی ئەم بوونەوە، یان لایەنێکیەوە خۆمان بە(هەموو) دەگەیەنین. ئەم ڕەوتەش لە لایەنەکانەوە بۆ هەموو، وەکو لە هەمووەوە بۆ لایەنەکانەو ڕەوتێکە لە نێو خولەیەکی بازنەییدایە، کە بە بازنەی هێرمینۆتیکی ناسراوە.[١] هێرمینۆتیک، وەکو زانستی ڕاڤەکردن(تەفسیر) بۆ ئەم بوونە هاوکات فینۆمینۆلۆجیانەیە. دازاین بوونێکی شاراوە و نە ناسراو نیە، دیاردە(فینۆمینە) یەو بەڕێگەی میتۆدی فینۆمینۆلۆجی (دیاردەگەرایەتی) دەیناسین و تەفسیریدەکین. لەم ڕووەوە فینۆمینۆلۆجی بوونی مرۆڤ هێرمینۆتیکانەیە، یان بەوجۆرەی دازاین خۆی دەردەخات بوونی تەفسیر دەکرێت. بەڵام کێ بوونی تەفسیردەکات؟ ئایا کەسێکی دیکە بێجگە لە دازاین هەیە بەم کارە هەستێت؟ دازاین خۆی بوونی تەفسیردەکات. لەم

[41] Martin Heidegger. *Being and Time*, p .62



ڕووەوە فینۆمینۆلۆجی هێرمینۆتیک، کە بۆ تەفسیرکردنی ئەم بوونە خراوەتەگەر، وەکو نوسینەوەی ژیاننامەی تاکە کەسێکە بە خامەی خۆی. بۆ ئەوەی فەلسەفەکەمان بەرەوپێشەوە بڕوات و خۆی بە واتای بوون بگەیەنێت، ئەوا دەبێت ئەم سەرەتایە ڕەتبکات و خۆی بە بوون لەم ڕێگەیەوە بگەیەنێت. بەڵام پێش ڕەتکردنی سەرەتاکە تێگەیشتن و تەفسیرکردنی ئەم سەرەتایە، کە بە لایەنێکی بوون دادەنرێت پێویست و گرنگە. لە بەرئەمە خۆمان بەم سەرەتایەوە ماندوودەکەین و تەفسیرێکی گونجاوی بۆ ئامادەدەکەین. لەم تەفسیرکردنەدا زمانە فەلسەفیەکەش گۆڕانی بەسەردادێت و ناکرێت زمانێکی فەلسەفی دێکارتی بەکاربهێنرێت. دازاین ناوەڕۆکی هۆشەکی نیە تاکو بە زمانی فەلسەفی دێکارتی لە بوونی بدوێین. هەروەها بوونێکە لە هەبووەکانەوە جیاوازە. بوونی مرۆڤێک، وەکو بوونی مێز لە نێو جیهاندانیە. کەوابوو پێویستە بوو(*Existenz*) بۆ مرۆڤ و هەبوون (*Existentia*) بۆ بابەتەکانی دیکە دابنێین.[٢] لە سەرو ئەمەشەوە دازاین بە کۆمەڵێک خسڵەتی نەگۆڕو چەسپاو بە ناوەڕۆکییەوە ناناسرێت، چونکە ناوەڕۆکی ئەو لە بوونیدایە.[٣] دازاین، کە دیاردەیەکی بوونە، بەو شێوەیە دەناسرێت، کە خۆی دەردەخات، یان باشتروایە بڵێین ئەو مەرجانە دەدۆزینەوە،

[42] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٦٧

[43] هەمان سەرچاوە.

که ئەم بوونە دەکەن بە مرۆڤ و لە هەبووەکانی دیکەی جیادەکەنەوە. هایدیگەر ئەم مەرجانە بە *(Existentials)* دادەنێت و منیش بە(پێشمەرجی ئۆنتۆلۆجی) ناوزەدمکردوون. خسڵەتەکانی دیکەی بوونی مرۆڤ، کە ناوەڕۆکی پێکدەهێنن و لە ژیانی ڕۆژانەدا تاکێک هەڵیاندەبژێرێت پێشمەرجی ئۆنتۆلۆجی نین و هایدیگەر ناویاندەنێت *(Existentiell)* .[44] بۆ نموونەمامۆستایەتی خسڵەتێکی ئۆنتۆلۆجی بوونی مرۆڤ نیە. ئەگەر تاکێک مامۆستاش نەبێت مرۆڤە. مامۆستایەتی*(Existentiell)* ەو پرۆژەیەکی هەڵبژێردراوی ژیانی تاکێکە، کە مامۆستایە. بە پێچەوانەی ئەم خسڵەتانەوە، پێشمەرجە ئۆنتۆلۆجیەکان بارودۆخی بوونی مرۆڤن و بوونی و تایبەتمەندێتیەکەی دەردەخەن. ئەگەر مرۆڤ لەنێوجیهاندا نەبێت بیر لە بوونی ناکرێتەوە. کەوابوو بوونی مرۆڤ لە نێو جیهاندا پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجیە و بوونی مرۆڤ بەبێ ئەم مەرجە نابێت. ئەم مەرجەش، هاوکات پێش بوونی مرۆڤ دەکەوێت و بە پێچەوانەشەوە ناگونجێت. ناتوانین بڵێین بوونی مرۆڤ لە پێش بوونی جیهانەوەیە. پێشمەرجەکان بارودۆخی ئۆنتۆلۆجی بوونی مرۆڤن و بونیادی ئەو بوونەن، کەبەبێ ئەوان بیر لەو بوونە ناکرێتەوە. لەگەڵ هەموو بوونیاد و پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی بوونی مرۆڤ (بوون) بەگشتی ڕاستەقینەیەکی بنەڕەتی لە پێشترە و تەنانەت

44 هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٣٣



پێشمەرجەکانیش بەبێ ئەو نابن.[45]

حەز دەکەم جەخت لەسەر ئەو خاڵە بکەم، کە پێشمەرجە ئۆنتۆلۆجیەکان بنەماکانی پێکهاتەی ناوەڕۆکی مرۆڤ نین. ناوەڕۆکی مرۆڤ، کەلەپاشتر باسی دەکەین، لە پێشمەرجەکانەوە جیاوازە. لەبەرئەمە ئێمە پێشمەرجەکانمان بە(ئۆنتۆلۆجی) داناوە و وابەستن بە بوونەوە نەک بە ناوەڕۆکەوە. دێکارت لە پێناسکردن و توێژینەوەکەیدا بۆ بوونی مرۆڤ، مرۆڤ بە ناوەڕۆکی هۆشەکی دادەنێت. بەڵام هایدیگەر ناوەڕۆکی هۆشەکی ڕەتدەداتەوە و دەیەوێت تەفسیرێکی فینۆمینۆلۆجیانە بۆ ئەم بوونە بکات. بۆچوونەکەی دێکارت فینۆمینۆلۆجیانە نیە. بوونی مرۆڤ، وەکو ناوەڕۆکی گیانەکی خۆی دەرناخات و ئەو ناوەڕۆکە (دیاردە) فینۆمینە نیە. گریمان ئەو ناوەڕۆکە شتێکە هەیە، بەڵام بوونێکی شاراوە و نادیاری هەیە و هەرگیز، وەکو دیاردە ناناسرێت. بێجگە لەمە، پێشمەرجە ئۆنتۆلۆجیەکان سترەکچەرێکی دەرەکی، وەکو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان نیە تاکو حوکم بەسەر ناوەڕۆکی مرۆڤدابکات و دەستەڵات و سەربەستیەکەی سنووردار بکات. ئەمەش دیسانەوە بۆ ئەوخاڵە دەگەڕێتەوە، کە لەپێشەوە باسمانکرد و پێشمەرجەکانمان بە بنەماکانی پێکهاتەی ناوەڕۆکی مرۆڤ دانەنا. ئەشێ لێرەدا ئەو پرسیارە گونجاوبێت، ئەگەر ئەم پێشمەرجە ئۆنتۆلۆجیانە

45 هەمان سەرچاوە.

ناوەڕۆکی مرۆڤ پێکنەهێنن، ناوەڕۆکی مرۆڤ چیە؟ بیریاران لە ئەفلاتونەوە، بێجگەلەوانەی پەیڕەوی فێرگەی ماتەریالیزمیان کردووە، ناوەڕۆکی مرۆڤیان بە شتێکی نەگۆڕو چەقوەستاو داناوە، کە بە بەردەوامی لە ژوور گۆڕانکارییەکانەوە(وەکوخۆی) دەمێنێتەوە.[46] بەردەوامبوونی شتێکی نەگۆڕ لە ژوور گۆڕانکارییەکانەوە بۆچوونێکی مێتافیزیکی ئەفلاتونیە. بۆ ئەفلاتون(ئایدیا) یان فۆرمە هەمەکی و بەرزەکان، کە ناوەڕۆک و ڕاستی هەموو هەبوویەکی هەندەکین نەگۆڕن و وەکو خۆیان دەمێننەوە. گۆڕانکارییەکانی نێو مێژوو(کات و شوێن) کاریگەرێتی بەسەریانەوە تۆمارناکەن. ناوەڕۆکی مرۆڤیش، کەلەم بۆچوونە مێتافیزیکییەی ئەفلاتونەوە لێکدراوەتەوە و لێکدانەوەکەش چەند جارێک گۆڕانکاری تێداکراوە بە درێژایی مێژووی بیرکردنەوەی فەلسەفی ماوەتەوە.

هایدیگەر، بەپێچەوانەی شوێنکەوتوانی ئەم نەریتە مێتافیزیکییەوە، ناوەڕۆکی مرۆڤ بۆ ناوەڕۆکێکی نەگۆڕ ناگەڕێنێتەوە. ناوەڕۆکی ئەم بوونە لە بوونیایەتی.[47] دازاین(مرۆڤی تاک) هەرچیەک بیت و چۆن بژی، چیەتی بوونی یان ناوەڕۆکی ئەوشێوە بوونەیە خۆی هەڵیبژاردووە.

[46] من باسی بۆچوونی شوێنکەوتوانی فێرگەی ماتەریالیزم ناکەم چونکە مشتومڕی هایدیگەر لەگەڵ دێکارت و نەریتی دێکارتیدایە نەک لەگەڵ ماتەریالیستەکان.

[47] هەمان سەرچاوەی پێشو، لاپەڕە ٦٨



شتێک نیە لە پێشتر ئامادەکرابێت و بەبوونیەوە گرێدرابێت. بوونی و ناوەڕۆکی یەک شتن، چونکە ناوەڕۆکی شێوازی بوونێتی و بوونیشی لە دامەزراندنی ناوەڕۆکیدایە. لەم بۆچوونەوە مرۆڤ بوونێکی بێ ناوەڕۆکە، چونکە ئەو بوونە ناوەڕۆکێکی هۆشەکی نیە. بوونێکە بەو نەبوونی و هەژارییەوە(بێ ناوەڕۆکیەوە) پەیدابووە و هەوڵدەدات بەسەر نەبوونیەکەیدا سەرکەوێت و ناوەڕۆکی خۆی دامەزرێنێت. بە پێچەوانەی هەبووەکانەوە، وەکو مێز و پەرتووکی سەرمێزەکە، کە چیەتیەکی پڕوتەواویان هەیە، بوونی مرۆڤ چیەتی نیە و خۆی ئەو چیەتیە لە نێو زەمینەی بەرینی ئەگەرەکانی بوونیدا دادەهێنێت.[48] هەرچەندە هایدیگەر بە ئاشکرا لە کێشەی پاش و پێشخستنی بوون و ناوەڕۆک نادوێت، بەڵام دەتوانین بڵێین بۆ ئەم بیریارە بوون پێش ناوەڕۆک دەکەوێت. ئەمەش هەڵوێستێکی فەلسەفی بنەڕەتیە لای بوونگەرایەتی (بوونخوازی). هەروەها ئاکامێکی لۆجیکمەندانەی ڕەتدانەوەی بیردۆزە دێکارتیەکەیە. دامەزراندنی ناوەڕۆکیش، کە بەبێ بوونی ئەم بوونە نیەو لەپێشتر بڕیاری لەسەرنادرێت دوو شێوازی هەیە، کە لەگەڵ خۆیدا دووشێوازی بوونی مرۆڤیش دیاریدەکات. ئەگەرەکانی بوون ئەو پرۆژانەن ئەم بوونە هەڵیاندەبژێرێت و نەبوونیەکەی خۆی پێیان پڕدەکاتەوە. تاکەکان بە بەردەوامی لە بووندا هەوڵدەدەن خۆیان تەواوکەن و بەچیەتیەکی پڕ بگەن.

[48] هەمان سەرچاوە.

هەڵبژاردنی پرۆژەکانیش، کەدەبن بە بنەماکانی پێکهاتەی ناوەڕۆک هەندێک جار لەلایەن خۆیەوە و جارەکانی دیکەش لەلایەنێکی دەرەکییەوە بڕیاری لەسەردەدرێت. لە حاڵەتی یەکەمدا، ئەگەر تاکێک سەربەستانە بڕیار لەسەر پرۆژەکانی بوونی بدات و هەڵیانبژێرێت، بوونێکی ڕەسەنی دەبێت و بەنامۆیی ناژی.

لەحاڵەتی دووەمدا، تاکەکە تەسلیمی دەستەڵاتێکی دەرەکی دەبێت و ڕێگە بەودەستەڵاتە دەدات بڕیار لەسەر پرۆژەکانی بوونی بدات و ئەم تاکە دەبێت بەناڕەسەن و بەنامۆیی دەژی. هەندێک لەم پێشمەرجە ئۆنتۆلۆجیانەی بوونی مرۆڤ بەسەر هەبووەکانیشدا دەچەسپێن. بوون لە ناوجیهاندا، بۆنموونە پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجیە بۆ مێز و پەرتووکی سەر مێزەکەش. ئایا چۆن بتوانین جیاوازییەک لە نێوان شێوازی بوونی مرۆڤ و ئەم هەبووانە لەم لایەنەوە دیاریبکەین؟ بێگومان (هەندێک) نەک(هەموو) پێشمەرجەکان ئەم خەسڵەتەیان هەیە. بەڵام جیاوازییەکی بنەڕەتی لە نێوان بوونی مرۆڤ و بوونی مێز و پەرتووکەکە لە نێو جیهاندا هەیە. مرۆڤ لە هەموو پەیوەندییەکانیدا(بیردۆزەیی و کردەگی و عاتیفی) بەجیهانەوە ئاگامەندە و بە ئاگاییەوە مامەڵەی لەگەڵدادەکات. ئێمە ناتوانین تەفسیری بوونی مرۆڤ و مێز و پەرتووکە کە لەجیهاندا بەیەک شێوە بکەین و ئەوەی سەبارەت بە بوونی مرۆڤە بەسەر مێز و پەرتووکە کەشدا ساخکەینەوە. ڕیزکردنی پێشمەرجە ئۆنتۆلۆجیەکان



میتۆدێکی تایبەتی نیە و هایدیگەر ڕوونی ناکاتەوە بەچی ڕێگەیەک هەڵیانبژێرین. بەڵام دووخاڵی گرنگ هەن، کە پێویستە ڕەچاوبکرێن. یەکەم، لەسەرەتاوە بۆ بنەڕەترین و هەمەکیترین پێشمەرج دەگەڕاین، کە لە ژوورئەوەوە پێشمەرجێکی دیکە نیە لەم زیاتر بنەڕەتی و گشتگرتربێت. دووەم، لە زۆر شوێنی تەفسیرەکەماندابۆ بوونی مرۆڤ پێشمەرجێک دەبێتە زەمینە و زاگەی پێشمەرجێکی دیکە. لە ڕوونکردنەوەی واتای پێشمەرجی یەکەمەوە لۆجیکمەندانە ڕوو لە پێشمەرجێکی دیکە دەکەین. ئەگەر بتوانین پێشمەرجی یەکەم، کە لە هەموویان بنەڕەتی ترە بدۆزینەوە، ئەوا بە پێشمەرجەکانی دیکەش دەگەین. ئایا چی پێشمەرجێک بۆ بوونی مرۆڤ لە هەموو پێشمەرجەکانی دیکە بنەڕەتی ترو لە پێشترە؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارەدابوون- لەنێو- جیهاندا بە یەکەم پێشمەرجی ئۆنتۆلۆجی دادەنێین. لەم سەرەتایەوە هێرمنیۆتیکە فینۆمینۆلۆجیەکە دەخەینەگەر. مرۆڤ ناوەڕۆکێکی هۆشەکی نیە، بەڵکو، بوونێکە لە نێو جیهاندا. بوونەوەرێکی جیهانییە و جیهانیش پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجیە بۆ بوونی ئەو.

# بەشی سێیەم
# پێشمەرجە ئۆنتۆلۆجیەکانی بوونی مرۆڤ

لەم بەشەدا لەوپێشمەرجانە دەدوێین، کە هایدیگەر بۆ تێگەیشتن لە واتای بوونی مرۆڤ ڕیزیاندەکات. لەم ڕێگەیەشەوە گۆڕانکارییە فەلسەفیەکەی دەبینین، کە کاریگەرێتی بنەڕەتی بەسەر تێگەیشتنمان لە بوونی مرۆڤ تۆمارکردووە. تیگەیشتنی هایدیگەر لە بوونی مرۆڤ دەرچوونێکی ئاشکرایە لە نەریتی دێکارتی و شۆڕشکردنێکی فەلسەفیە بەسەر ئەونەریتەدا. هەروەها، لە پێشتریش باسمانکرد، کە لەپێشترین و بنەڕەتترین پێشمەرجی ئۆنتۆلۆجی بۆ بوونی مرۆڤ بوون- لەنێو- جیهاندایە *In-der-welt-sein* بابزانین ئەم پێشمەرجە چی واتایەکی هەیە.

## بوون- لەنێو- جیهاندا *In-der-welt-sein*

دەرچوون لە نەریتی دێکارتی بیرکردنەوەمان بۆ بوونی جیهان و پەیوەندی مرۆڤ بەجیهانەوە دەگۆڕێت. مادامەکی مرۆڤ ناوەرۆکی هۆشەکی نیە و لە شوێنێکی دیکەوە فرێنەدراوەتە ئێرە، ئەوا بوونێکە لێرەدا(دازاین) و لە نێوجیهاندا ڕسکاوە. بوونی ئەو جیهانییە و بەبێ جیهان نیەو نابێت. بوونی لە نێوجیهاندا پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجیە



بۆ بوونی. ناتوانرێت بیر لە بوونی مرۆڤ بکرێتەوە ئەگەرمرۆڤ لە نێوجیهاندا نەبێت.

لە فەلسەفەی هایدیگەردا جیهان چوار واتای هەیە: یەکەم، جیهان پێشەرجێکی ئۆنتۆلۆجیە بۆ بوونی مرۆڤ، دووەم سروشتە، سێیەم، نیشتمان و ژینگەی مرۆڤە و چوارەم، کەلوپەلەکانی بەردەستە. واتای یەکەمی جیهان ئاشکرایەو پێویست ناکات لەمەزیاتر درێژە بەڕوونکردنەوەی بدەین. لەواتای دووەمیشدا جیهان سروشتە، کە مرۆڤ ڕاستەوخۆ مامەڵەی لەگەڵدا دەکات و هەوڵدەدات بۆ ئەوجیهانەی بگۆڕێت خۆی دەیخوازێت. بۆنموونە کەلوپەلەکانی چواردەورم لەم قاوەخانەیەدا، وەکو کورسی و مێزەکان و پەڕتووک و لاپەڕەکانی بەردەستم قەدی ئەودرەختانەن لە دارستانەکانەوە(سروشت) بڕڕاونەتەوە و مرۆڤ بۆ مەبەستی خۆی گۆڕیونی بۆ ئەم کەلوپەلانەی ئێستا من بەکاریاندەهێنم. سروشت، لەم ڕووەوە لەوجیهانەوە جیاوازە دازاین دایهێناوە. چەمی سیروان سروشتە، بەڵام ئاوبەندی دەربەندیخان لەبەردەم چەمی سیرواندا جیهانێکە دازاین دایهێناوە و سودیلێوەردەگرێت. جیاوازی بنەڕەتی سروشت و جیهان وابەستە بە بەکارهێنانی سروشت و گۆڕینی لە لایەن مرۆڤەوە بۆ شتێکی دیکەو مەبەستێکی دیاریکراو. سیروان سروشتە، بەڵام ئاوبەندی دەربەندیخان جیهانە، یان لەکاتێکدا جوتیارێک لەوچەمەوە ئاو بۆ سەرزەوییەکەی ڕادە کێشێ و بۆکشتوکاڵ سودیلێوەردەگرێت دەبێت بەجیهانێکی تایبەت بۆ جوتیارەکە. بەهەمان شێوە،

مێزەتەختەکەی بەردەمم لەقاوەخانەکە درەختەو بەشێکە لە سروشت، بەڵام دازاین گۆڕیویەتی بۆمێز و خستۆتیەتە سەرئەوجیهانەی خۆی دایهێناوە و ئێستا لەم قاوەخانەیەدامن بۆنوسین بەکاریدەهێنم. لەگەڵ واتاکانی سێیەم و چوارەمدا گۆڕانکارییەکان لە تێڕوانینی هایدیگەر بۆجیهان زیاتردەردەکەون. لەبەرئەوەی ڕاستەقینەی بوونی مرۆڤ بۆ دێکارت ناوەڕۆکێکی هۆشەکی نەگۆڕەو لە(لەش)ەوە جیاوازە، ئەواجیهان بۆئەم بوونە، کە ناوەڕۆکێکی ئەستوویی هەیە ڕاستەقینەیەکی بێگانەو ناحەزە. ناوەڕۆکی هۆشەکی لەنێوجیهاندا، یان لەگەڵ ناوەڕۆکی ئەستووییدا بوونێکی نامۆی هەیە چونکە ئەم جیهانە نیشتمانی ڕەسەنی ئەم بوونەنیە. هۆی ئەمەش لەوەدایە، کە لەنەریتی دێکارتیدا ناوەڕۆکی مرۆڤ سەربەڕاستەقینەیەکی دیکەیە. بەجیهانکردنی مرۆڤیش دابەزینێتی لە ئاستی بەرزێتی و پلەی هۆشەکی ئەم بوونە بۆ نەهۆمێکی نزمی بوون. هایدیگەر، بە پێچەوانەی ئەم بۆچوونەوە، بوونی مرۆڤ لەبنەڕەتەوە بەبوونێکی جیهانی دادەنێت و بەڕاستیەکی بەرزەوە گرێینادات. بوونی مرۆڤ لەنێوجیهاندا بوونێکی نامۆنیە، چونکە جیهان نیشتمان و ژینگەی مرۆڤە. بەجیهانبوونی مرۆڤیش دوو واتای هەیە. لەلایەکەوە ئەوەمان بۆ دەردەخات، کە مرۆڤ لەشوێنێکی بەرزەوە بەرەونێو جیهان شۆڕنەکراوەتەوە و فڕێنەدراوەتە ئێرە. لەلاکەی دیکەوە، مرۆڤ بوونێکی جیهانگەرانەی هەیە. جیهان بەگشتی، نەک پارچەیەک زەوی سنووردارکراو، نیشتمانی ئەوە. ئەمەش ڕاستیەکی ئۆنتۆلۆجیانە ی ئەم



بوونەیە، نەک فینۆمینۆلۆجیانە. ئەگەر بڕوانینە ئەو بارودۆخەمێژووییەی دازاین، دەبینین، کە نیشتمانی دازاین، ئەوجیهانەی خاکی ئەوە، سنووردارکراوە و پانتاییەکەشی تەسککراوەتەوە.

ئەمەڕووادانێکی فینۆمینۆلۆجیانەیە. بەڵام ئەو واتایەی بۆئێمە گرنگە لەجیهانبوونی مرۆڤدا لەتێگەیشتنی ئۆنتۆلۆجی پەیوەندی مرۆڤ و جیهاندایە. مرۆڤ بەبێ جیهان نیە و نابێت و جیهان نیشتمانی ئەم بوونەیە. زاراوەی(نیشتمان) یش، لەم ڕوانگە ئۆنتۆلۆجیەوە واتایەکی بەرچاوتەسکی ڕامیاریانەی نیە. واتای جیهان، وەکو کەلوپەل، بۆدەوروبەر دەمانگەڕێنێتەوە. مرۆڤ لەژیانی ڕۆژانەیدا بەکاریدەهێنێت و سودیانلێوەدەگرێت. ئەگەر تەماشای دەوروبەربکەین دەبینین تەنانەت لەژووری نوستندا چەند کەلوپەلێک هەن بۆمەبەستی تایبەت بەکاردێن و جیهانێکی تایبەتیان بۆ مرۆڤ پێکهێناوە. ئەم کەلوپەلانە ئامێری بەردەستن لەپێناوی سودلێوەرگرتن بەکاردێن. بەڵام هەریەکێک لەم ئامێرانە، یان کەلوپەلانە بەتەنیا و بەبێ پەیوەندی بەئامێرەکانی دیکەوە لەنێوجیهاندا واتای تەواوی خۆی ناداو جێگەی خۆشی لەژیانی پراکتیکیدا پڕناکاتەوە.[٩] بوونی چەکوش لە

[49] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٩٨ هەروەها بڕوانە:

Hubert L. Dreyfus. *Being- in- the- World*, London: The MIT Press, 1991. P. 62

دوکانی دارتاشێکدا باشتر واتاکەی لەبوونی لای دەرمانفرۆشێک دەردەکەوێت. چەکوش ئامێرێکە بەستراوە بەسترەکچەری دارتاشخانەکەوە. مەبەست لە سترەکچەر پەیوەندییەکانی کەلوپەلەکانی دارتاشییە بە یەکدییەوە. بێجگەلەم خسڵەتەی کەلوپەل، هایدیگەر ئاماژەشی بۆ ئەو لایەنەکردووە، کە بوونی کەلوپەلەکان تەوانای خۆشاردنەوە و خۆدەرخستنیان هەیە. بوونی چەکوش تاکو پێویست نەبێت و بەکارنەیەت بەشاراوەیی دەمێنێتەوە. ئەگەر کەسێک پێویستی بە چەکوش نەبێت، چەکوشەکەی لە ژوورەکەیدا لە سوچێکدا دانرابێت، ئەو هەست بەبوونی چەکوشەکە ناکات. بەڵام کەئەو پێویستیە سەریهەڵدا بوونی چەکوشەکە خۆی دەردەخات.[50]

تێگەیشتن لەواتای جیهان لەم ڕوانگەیەوە دەمانگەڕێنێتەوە بۆ جۆرێک پەیوەندی نێوان بوونی مرۆڤ و جیهان. ئەوجیهانەی بەم جۆرە لەواتاکەی دەدوێین جیهانی کەلوپەلی بەردەستە و مرۆڤ ڕۆژانە بۆمەبەستێک بەکاریاندەهێنێت. لە ڕوانگەی فینۆمینۆلۆجیەوە مرۆڤ ڕۆژانە ڕاستەوخۆ ئەم پەیوەندییەی بەجیهانەوە هەیە و

[50] هەمان سەرچاوەی هایدیگەر، لاپەڕە ٩٩ ، و هەمان سەرچاوەی هیوبارت درایفوس، لاپەڕە ٩٤



بەبێ ئەوەی لەواتاو ناوەڕۆکی ئەو کەلوپەلانەی بەردەستی بکۆڵێتەوە. دارتاشێک ڕۆژانە چەکوشەکەی بۆ مێخ داکوتان بەکاردەهێنێت، بەڵام بیرلەوە ناکاتەوە چەکوش یان ناوەڕۆکی چەکوش چیە. لێرەدا کەلوپەلە بەردەستەکییەکان، کە هایدیگەر ناویاندەنێت (*Zuhandenheit*) ڕاستەوخۆ خۆیان بۆ مرۆڤ دەردەخەن و مرۆڤیش پەیوەندییەکی کردەگی(پراکتیکی) لەگەڵیاندا هەیە [51]. ئەم پەیوەندییەکردەگییە پێش پەیوەندییە بیردۆزەیی و زانینکارییە دەکەوێت، کە دێکارت و شوێنکەوتوانی نەریتی دێکارتی بە پەیوەندییەکی لە پێشتری دادەنێین. هەرچەندە کارکردنی دارتاش لە دوکانی دارتاشیدا زانینە، تەنانەت دەستبردن بۆ چەکوشەکە و بەکارهێنانی بۆ داکوتانی مێخێک لە نێوتەختەکەدا جۆرێکە لە زانین تاکو دارتاشەکە نەزانێت چەکوش بۆ ئەومەبەستە بەکاردێت دەستی بۆ درێژناکات و بەکاریناهێنێت. لەهەمانکاتیشدا ناتوانین ئەم هەڵوێستە بە بیردۆزانە دابنێین و لە پەیوەندییە زانینکارییە دێکارتیەکەی جیانەکەینەوە. دارتاشەکە ئەو پرسیارە لە خۆی ناکات، ئایا چەکوش چیە؟ بەڵکو ڕاستەوخۆ بەکاریدەهێنێت. لەگەڵ سەرهەڵدانی ئەم پرسیارەدا سەبارەت ناوەڕۆکی چەکوش و چیەتی ئەم ئامێرە، چەکوشەکەخسڵەتی خۆی لە بابەتیکێ بەردەستەوە بۆ بابەتێکی زانستانە یان فەلسەفیانە دەگۆڕێ و دەخرێتە بەر ڕۆشنایی زانین و بیردۆزەوە و لە

[51] هەمان سەرچاوەی هایدیگەر، لاپەڕە ٩٨

ناوەڕۆکی دەکۆڵرێتەوە. دەبێت بە بابەتێکی زانستانە بۆ ناسینی ناوەڕۆکی ، نەک بەکارهێنان دادەنرێت. ئەم جۆرەبابەتانە، کە بابەتی لێکۆڵینەوەن (*Vorhandenheit*) [52]، خسڵەتی کردەگی وندەکەن و پەیوەندییەکەیان لەگەڵ مرۆڤدا لەسەر زەمینەی بیردۆزە و زانین دادەمەزرێن. بەپێچەوانەی ئەمەشەوە، دارتاشەکە پەیوەندییەکی کردەگی لەگەڵ چەکوشەکەیدا هەیە، کە پەیوەندییەکی پێش- تویژینەوەی زانستانە یان نا-زانستانەیە. [53] دارتاشەکە ڕۆژانە چەندجارێک چەکوشەکەی بەکاردەهێنێت، بەڵام هیچ جارێک کە دەستدەداتە چەکوشەکە لەخۆی ناپرسێت چەکوش چیە؟ بۆ چی بەکاردێت؟ چۆن لەواتاکەی تێبگەین؟ مەبەستی هایدیگەر لە پێشخستنی پەیوەندیکردەگی و هەڵوێستی نا-زانستانەی مرۆڤ لەبووندا ڕەتدانەوەی پەیوەندییە زانینکاری و زانستیانەکە نیە. بەڵکو ڕەتدانەوەی لەپێشتردانانی ئەو پەیوەندییەیە. چونکە تێگەیشتنی فینۆمینۆلۆجیانەمان لە بوونی مرۆڤ لەنێو جیهاندا ئەوە دەردەخات و نایسەلمێنێت پەیوەندی زانینکاری لەپێشتربێت. تەنانەت زانستکارێکیش لە تاقیگەیەکدا ڕۆژانە کەلوپەلەکانی نێو تاقیگەکە بەکاردەهێنێت و

[52] هەمان سەرچاوە.

[53] هەندێک جار زاراوەی(نا- زانستانە) بۆ ئەفسانەو کێشەیەکی لەڕاستی بەدەربەکاردێت. مەبەستی من لەم پەیوەندییە نا- زانستانەیە ئەم واتایە نابەخشێت.



چەندجارێک لولەیەکی شوشە بە ئامێرێکی دیکەوە بۆ گەیشتن بەئاکامی تاقیکردنەوەکەی دەبەستێتەوە، بەڵام هەرجارێک دەستدەداتە لولەشوشەکە ئەوپرسیارە فەلسەفیە لەخۆی ناکات، کە لولەی شوشەچیە؟ پەیوەندی کردەگی مرۆڤ بەجیهانەوە فینۆمینۆلۆجیانە پەیوەندییەکی لەپێشترە.

بوون لەنیوجیهاندا بوونی مرۆڤ **لەنێو شوێندا** دەردەخات. مرۆڤ بوونێکە هەمیشە لەنێو- شوێندایە. ئەمەش پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی دیکەیە، کە لەپێشمەرجی بوون- لەنێو- جیهانەوە وەرمانگرتوە. لەبەرئەوەی بوون- لەنێو- شوێندا پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی ئەم بوونەیە، پێویستە لەبوونی هەبووەکانەوە لەنێوجیهاندا جیابکرێتەوە. بوونی مرۆڤ لەنێوشوێندا، وەکو بوونی هەبووەکان نیە. مرۆڤ لەنێوشوێندا دانانرێت یان فڕێنادرێت بەڵکو جێنشیDwelling دەبێت. [54] واتای جێنشین بوونیش بۆ دوو فاکتۆر دەگەڕێتەوە، لەلایەکەوە مرۆڤ ئاگامەندە و بەئاگاوە لەشوێنێکدادەژی، لەلایەکی دیکەوە مرۆڤ بەنیگەرانیەوە مامەڵە لەگەڵ شوێندادەکات. بوونی من وەکو بوونی مێزەکە لەنێو قاوەخانەکەدانیە. بێگومان من و مێزەکە بەبێ(شوێن) نابین، بەڵام من بەئاگاوە لەنێو قاوەخانەکەم و مامەڵە لەگەڵ دەوروبەرمدادەکەم. ئاگایی من ، هاوکات واتای دووری و نزیکی شوێن و بابەتەکانی نێو شوێنیش دەگۆڕێت.

[54] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٨٠

کەسانی دەوروبەرم لەنێو قاوەخانەکە مەترێک لەمنەوە نزیکن، بەڵام لەبەرئەوەی نیگەرانیان نیم نزیکییان بۆمن دوورییە و هاوکات هارێیەکی خۆشەویستم، کە زۆرلەمنەوە دوورە و تەنانەت لەوڵاتێکی دیکەدادەژی و نیگەرانی ئەوم، دوورییەکەی هەستپێناکرێت و لە منەوە نزیکە. (جێنشین)ی، کەواتای بوون لەنێوشوێندا بۆ بوونی مرۆڤ تەواودەکات خسڵەتێکی مرۆڤانەیە و بەتەنیا مرۆڤ، نەک هەبووەکان، جێنشین دەبێت.[٥٥] جێنشین بوونیش ئاماژە بۆ بوونی مرۆڤ لە تەنیشت being alongside بوونەکانی دیکەوەدەکات .[٥٦] بوونی مرۆڤ لەنێوشوێندا جێنشین بوونێکی بەتەنیشت هەبووەکانەوە یە. بوونی من لەنێوقاوەخانەکەدا و دانیشتنم لەسەرکورسیەکە و نوسینم لەسەر مێزەکەی بەردەمم نزیک کەسەکانی دیکەی نێوقاوەخانەکە و نزیک پەنجەرەکە بوونی من لەنێو ئەم شوێنە بەتەنیشت تاکەکانی دیکە و شتەکانی دەوروبەرم ڕووندەکاتەوە. مرۆڤ لەنێوشوێندا هەمیشە بەتەنیشت شتێکەوەیە.

---

[55] هایدیگەر ڕەگوڕیشەی وشەی (لەنێو) ڕووندەکاتەوە. ئەم وشەیە کە بەئینگلیزی و ئەڵمانی بە (in) دادەنرێت لەوشەی لاتینی (*innan*) ەوە هاتوە، کەواتای (جێنشین)ی to reside, dwell دەبەخشێت.

[56] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٨١



## بوون– لەگەڵ *Mit- Sein*

بوون لەنێوجیهاندا دووپێشمەرجی ئۆنتۆلۆجی دیکەشی بۆ بوونی مرۆڤ (بوون لەنێوشوێن) و (بوون بەتەنیشت) هێنایەکایەوە. ئێستاش دەتوانین لەم زەمینەوە خۆمان بە پێشمەرجێکی دیکە بگەیەنین، کە بووە بە بناخەی فەلسەفی کۆمەڵایەتی بونگەرایەتی. لەبەکارهێنانی میتۆدە فینۆمینۆلۆجیەکەمان ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێت، کە بوون لەنێوجیهاندا هاوکات **بوونە لەگەڵ کەسانی دیکەدا.** دازاین، کە هەرتاکێکە لەئێمە بەبێ کۆمەڵ نیەو نابێت. بوونی ئەو لەسەر بوونی کەسانی دیکە وەستاوە.[٥٧] بوونی کەسانی دیکە پێشمەرجی ئۆنتۆلۆجیە بۆ بوونی مرۆڤ و بوونی مرۆڤیش بوونە- لەگەڵ- کەسانی دیکەدا. لەم زەمینەوە(تەنیایی) و دوورەپەرێزی لەکۆمەڵ و کەسانی دیکەوە ئۆنتۆلۆجیانە نیەو هیچ تاکێک بەتەنیا نیەو نابێت، بەڵام لەڕووە فینۆمینۆلۆجیەکەوە، وەکو ڕووداوێکی مێژوویی دەگونجێت. تاکێک دەتوانێت تەنیایی بۆخۆی هەڵبژێرێت و دوورەپەرێز بژی. بوون- لەگەڵ- کەسانی دیکەدا دووشێوازی بوون بۆ مرۆڤ دیاریدەکات، ناڕەسەن و ڕەسەن.[٥٨] شێوازی بوونی ناڕەسەن دیاردەیەکی ڕۆژانەیە لەبوونی ڕۆژانەی تاکەکاندا. لەبەرئەوەی بوون- لەگەڵ کەسانی دیکەدا پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجیە بۆ تاک ئەوا تاک لەنێو کۆمەڵدا

---

[57] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ١٤٩

[58] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٦٨

پەیدادەبێت. کۆمەڵیش خاوەنی نەریت و کەلتوور و بەهای خۆیەتی، کەبەسەر تاکەکاندا فەرزیدەکات. لەگەڵ پێشمەرجی ئۆنتۆلۆجی بوون- لەگەڵ- کەسانی دیکەدا سترەکچەرێکی کۆمەڵایەتی لەپێشتریش سەرهەڵدەدات، کەتاکی تێدادەژی و لەژیانی ڕۆژانەیدا، لەیەکەم ساتی بوونیەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات. لەنێو ئەو سترەکچەرەدا جیاوازی و تایبەتمەندێتی تاکەکان دەخرێتە پەراوێزەوە و ناسنامەیەکی هەمەکی بەسەرهەموویاندا دەسەپێنرێت. لەم شێوەی بوونەدا تاک تایبەتمەندێتی خۆی دەدۆڕێنێت و دەبێت بە وێنەیەکی لێوەرگیراوی کەسانی دیکە یان (ئەوان) ی دیکە.[٥٩] وەکو (ئەوان) باوەڕبەدۆگماکان و شوێن بەهاو باوەڕەباوەکان دەکەوێت و ژیانی دەبێت بە لاساییکردنەوە.

ئەم دوورییە لەخۆوە لەبوون لەگەڵ کەسانی دیکەدا لەوێدایە، کە مرۆڤ دەبێت بە بابەت بۆ کەسانی دیکە. بوونی لەلایەن کەسانی دیکەوە داگیردەکرێت. کەسانی دیکە بڕیار لەسەر پرۆژەکانی بوونی دەدەن. (کەسانی دیکە) لێرەدا، تاکێکی دیاریکراوو ناسراونیە، بەڵکو هەموو کەسێکە.........

[59] حەزدەکەم خوێنەر تەفسیرێکی ئەفلاتونی بۆ زاراوەی(وێنەی لێوەرگیراو) نەکات، کە من لێرەدا بەکارمهێناوە. مەبەستم ئەوەنیە،کە تاک وێنەیەکی لێوەرگیراوی بیرۆکەیان فۆرمی مرۆڤی بەرزبێت لە جیهانی بەرزی ئەفلاتونیدا.



کەسانی دیکە نە ئەم و نە ئەو تاکەیە، بەڵکو (ئەوان) ن (*das mann*).[٦٠]

بوونی نارەسەنانە، کە لەژێربارودۆخی بوون- لەگەڵ- کەسانی دیکەدا سەرهەڵدەدات دوورکەوتنەوەیە لەخۆ و(نامۆ) بوونە. لەیەکەم ڕۆژی لەدایکبوونی تاکێکەوە، بەبێ ئەوەی بیرلەوەبکرێتەوە، کەتاک تایبەتمەندێتی خۆی هەیە کۆمەڵێک نەریت و باوەڕو بەهای لەپێشتر ئامادەکراو بە سەرئەو تاکەدا دەسەپێنرێت. تایبەتمەندێتیەکەی لەناودەبرێت و دەبێت بە یەکێک بەبێ جیاوازی لە(ئەوان). ئەگەر تاکێکی نێو ئەم سترەکچەرە ببینین وەکو ئەوەوایە هەموو تاکەکانمان بینیبێت، چونکە جیاوازی نێوانیان لەناوچووە و ناسنامەیەکیان بەسەردا ساخکراوەتەوە. ئەم تاکانە نارەسەنن و ناتوانن جیاوازی و تایبەتمەندێتی خۆیان دەربخەن و بیسەلمێنن. ناتوانن پرۆژەکانی بوونیان هەڵبژێرن و خۆیان بڕیاری لەسەربدەن. کەسانی دیکە (ئەوان) پرۆژەکان هەڵدەبژێرن و بڕیاری لەسەردەدەن. ژیانی ڕۆژانەی تاکە نارەسەنەکان بێجگە لەوەی لاسایکردنەوەیە سازشکردنێکی بەردەوامیشە بۆ(ئەوان). تاکی نارەسەن دەیەوێت، بەوجۆرەی کەسانی دیکە دەیانەوێت، بژی و بیر لە حەزوئارەزووەکانی(ئەوان) دەکاتەوە. بەختەوەری لە تەسلیم بوون و شوێنکەوتنی کوێرانەی نەریتە باوە سەرکوتکەرەکەدا دەبینێت و نکۆڵی

[60] هەمان سەرچاوەی پێشو، لاپەڕە ١٦٤

لە تایبەتمەندی بوونی خۆی دەکات. بێگومان تەسلیم بوون و خۆ دۆڕاندن لەژێر ئەم بارودۆخەدا، بەوشێوەیەی (سارتەر) یش ئاماژەی بۆدەکات خۆدزینەوە و ڕاکردنە لە لێپرسینەوەی مێژوویی.[٦١] ئەو تاکانەی لە لێپرسینەوە دەترسن، نایانەوێت پرۆژەکانی بوونیان هەڵبژێرن و ڕێگە بەکەسانی دیکە دەدەن بڕیار لەسەرپرۆژەکانی بدەن. بوونی نارەسەن و دوورکەوتنەوە لە(خۆ) و ژیان لەژێردەستەڵاتی زاڵبووی(ئەوان) دا بۆسە قامگیرکردنی کەلتوورێکی باوی بازاڕییە، کە هەمووتاکێک دەبێت پەیڕەوبیکات. کەلتووری بازاڕیش، هاوکات لەسەرزەمینەی لەناوبردنی جیاوازییەکان دامەزراوە و دابەزینە لەبەرزێتیەوە بەرەوئاستێکی نزم و باو. لەنێو کەلتووری بازاڕییدا تاکەکان وەکو یەک حەزوئارەزووەکانیان دەردەبڕن. هەموو، وەکویەک، شوێن باوەڕو بەهاکان دەکەون و دەخۆن و دەخەون و تەنانەت حەزلەیەک جۆرمۆسیقاو هونەریش دەکەن.[٦٢] بوونی ڕەسەن، بەپێچەوانەی بوونی نارەسەنەوە، خۆبوون و جەختکردنە لەسەرجیاوازیو تایبەتمەندێتی هەریەکێک لە تاکەکان. بوونێکە کەسانی دیکە داگیریان نەکردووە و نەخلیسکاوەتە نێو زەلکاوی نەریتەبازاڕی و باوەکە. کەسێکی ڕەسەن خاوەنی خۆیەتی و

[61] Jean-Paul Sartre. *Being and Nothingness*, translated by Hazel E. Barnes, London: Routledge, 1996. Pp. 47- 50

[62] Martin Heidegger. *Being and Time*, p. 165



خۆی بڕیار لەسەر پرۆژەکانی بوونی دەدات و (داهێنەرانە) دەژی.[٦٣] مرۆڤ لەوێدا ڕەسەنە، کە خۆی پرۆژەکانی بوونی هەڵدەبژێرێت، کەسانی دیکە بڕیاری بۆنەدەن و خۆی نەخاتە ژێر کاریگەرێتی سترەکچەرە لە پێشترەکەوە. بە ناسینەوەی تایبەتمەندێتی خۆی، وەکو تاکێک و جیاوازییەکانی لەگەڵ تاکەکانی دیکەدا بوونی خۆی دەسەلمێنێت و مامەڵە لەگەڵ دەوروبەری دەکات. تاکێکە سەربەست و کەسانی دیکەش، بەم جۆرە، وەکوخۆی، دەبینێت. باوەڕی بە تایبەتمەندێتی و جیاوازییەکانی تاکەکانی دیکەش هەیە. لەم ئاستەوە، سەربەستانە و سەربەخۆ پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانی دادەمەزرێنێت. ڕەسەنێتی بوون، لەگەڵ ئەوەدا کە بنەمایەکی ئۆنتۆلۆجی هەیەو هەمووتاکێک لەبنەڕەتەوە جیاوازو تایبەتمەندە، بەڵام لەگەڵ (فڕێدانی) بۆ ناوکۆمەڵ و ژیاندا (نارەسەنی) دەبێت بەشێوەیەکی زاڵبووی بوونی. تاکەکان لەو ڕۆژەوە پەیدادەبن شێوەی نارەسەنی، بەناوی کەلتور و نەریت و ئایین و بیروباوەڕەوە، بەسەریاندا دەسەپێنرێت و زۆرجار ڕەسەنیەتی بوونی خۆیان بەتەواوی ووندەکەن. هەندێکجاریش لەنێو زۆرانبازی و ناکۆکییەکانی نێوان ئەم دووشێوەی بوونە بەجەنگاوەری دەمێنێنەوە و بەرەنگاری

[63] هایدیگەر وشەی (داهێنەرانە) بەکارناهێنێت. ئەم وشەیە من بەکارمهێناوە و لەنوسراوێکی دیکەدا بەدرێژی باسمکردوە. بڕوانە: محەمەد کەمال، بوون و داهێنان، دەزگای سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٥. لاپەڕە ١٥٣

دەکەن. لەژیانی ڕۆژانەدا، کە دیاردەیەکی مێژوویی یان فینۆمینۆلۆجیانەیە، نەک ئۆنتۆلۆجیانە، تاک بەناڕەسەنی دەبینرێت. بەئاگاهاتنەوە و ناسینەوەی تایبەتمەندێتی و جیاوازییەکان تاکەڕێگەیەکە بۆ گەڕانەوەی ئەم بوونە لە ناڕەسەنیەوە بۆ ڕەسەنی. بەستنەوەی ڕەسەنیەتی بوون بەزەمینەیەکی ئۆنتۆلۆجی و ناڕەسەنیەتیش بە فینۆمینۆلۆجیەوە ئەو بۆچوونە ڕووناکبینەمان بۆ دیاریدەکات، کە مرۆڤ بە ناڕەسەنی پەیدانەبووە و بەڵکو ئەو شێوەی بوونە بەسەریدا لەلایەن کەسانی دیکەوە سەپێنراوە. ناڕەسەنی ڕووداوە نەک کۆڵەکەیەک لە بونیادی ئۆنتۆلۆجی ئەم بوونەدا. هیچ تاکێک بە چەوساوەیی لەدایکنەبووە و چەوسێنراوەتەوە. ڕەتدانەوەی ئەم شێوەی بوونەش کە مادامەکی ئۆنتۆلۆجیانەنیە، پرۆژەیەکی بوونی مرۆڤە و مرۆڤ خۆی دەتوانێت بڕیاری لەسەربدات و بوونێکی ڕەسەنانە بۆ خۆی هەڵبژێرێت. لەم ڕوانگەیەوە، بوونی ڕەسەن ژیانە لەگەڵ جیاوازییەکاندا.) دەبێت بە بەهایەکی بەرز و بناخەی پەیوەندییەکانوIdentity (جیاوازی) نەک (وەک یەک ڕەسەنیەتی بوونیش دەپارێزێت. ئەگەر جیاوازییەکان هەڵبوەشێنرێنەوە و لەناوبچن و تاکەکان یەک بن شێوەی بوونی ڕەسەنیش بۆ شێوەناڕەسەنەکە دەگۆڕێت. لەنێو پەیوەندی بوونەڕەسەنەکاندا لێکچونیش هەیە، تاکە ڕەسەنەکان لە هەندێ ڕووەوە لە یەکدی دەچن Same، هاوکات جیاوازیشیان هەیە. ئەم لێکچونە بەبێ جیاوازییەکان نیەو نابێت. بۆنموونە دەڵێن قادرمیرخان هونەرمەندێکی کوردە، بەڵام



هەموو هونەرمەندێکی کورد قادرمیرخان نیە. لێرەدا لێکچوونێک و جیاوازیش لە نێوان قادرمیرخان و هونەرمەندی کوردا دیاریکراوە.

بوونی ناڕەسەن لە ژیانی ڕۆژانەدا، لەنێو کەلتووری باودا لە بارودۆخێکی دەروونیدا دەژی، کە بە بەردەوام ئەوبارودۆخە دەروونیە لەگەڵیدایە و بەری نادات. هایدیگەر ئەم بارودۆخە دەروونیە لەگەڵیدایە و بەری نادات. هایدیگەر ئەم بارودۆخە دەروونییە یان هۆشەکییە ناودەنێت **مەزاج**.[64] بوونی ناڕەسەن مەزاجیە، لەهەڵچون و داچوونی عاتیفیدایە. بەمەزاجەوە مامەڵە لەگەڵ دەوروبەرییدادەکات. بوونێکی توڕە یان هێمن، بەختەوەر یان خەمبار ساتێک بەبێ مەزاج نیە. هۆی ئەمەش بۆ شێوەی بوونی، وەکو بوونێکی داگیرکراوو بێ داهاتوو دەگەڕێتەوە. پەیوەندی بە خۆبەستنەوەی ئەم بوونەوە بەڕووداوەکانی ئێستاو ڕابردووەوە هەیە. بوونێک لەڕابردوودابژی و ئێستاش بەو ڕابردووەوە گرێبدات و نەڕوانێتە داهاتوو مەزاجی دەبێت. ڕووداوەکانی ڕابردوو کاردەکەنە سەربارودۆخی ئاگامەندی ئەو. جارێک بەختەوەر و جارەکەی دیکە خەمباری دەکەن. لەناوئێستاشیدا ئەو بوونە بە(**ترس**) ەوە مامەڵە لەگەڵ

[64] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ١٧٢

بووندا دەکات.[65] داهاتوو، کەجیهانێکی کراوەی پرۆژە بەرهەمنەهێنراوەکانە، نابێتە سەرچاوەی مەزاج.

پرۆژەو ڕووداوێکی پەیدانەبوو تاکێک خەمبار یان بەختەوەرناکات. ڕوودانی ئەوپرۆژەیە(ئێستا) یان لەڕابردوودا دەبێتە هۆ بۆسەرهەڵدانی جۆرێک لە مەزاج. تاکو مرۆڤ ناڕەسەن بێت و لە ڕابردوودا بژی مەزاج بەرینادات. لەکاتێکدا مرۆڤێکی ناڕەسەن بەختەوەریش نەبێت، هێشتا لە نێو مەزاجێکی دیکەدا دەژی. مەزاجەکانی دەگۆڕێن، بەڵام هەرگیز وازیلێناهێنن و لە نێو ئێستاشیدا بەترسەوە دەژی، کە ئەمەش شێوازێکی مەزاجە[66]. ترس، کە بابەتێکی ناسراوی هەیە و مرۆڤ لێیدەترسێت لە **(دوودڵی)** بوونگەرایەتیەوەجیاوازە. دوودڵی ترس نیە، بارودۆخێکی ئاگامەندانە یە، کەلەپێش هەڵبژاردنی پرۆژەیەکدا سەرهەڵدەدات و پەیوەندی بە هەڵبژاردنەوە هەیە. لە ئاکامی ئەو باوەڕە فەلسەفیەوە پەیدادەبێت، کە مرۆڤ بە لێپرسراو لە هەڵبژاردنەکەی دادەنێت. بۆ نموونە، ئەگەر مرۆڤ ڕەسەنانە بژی و خۆی پرۆژەکانی بوونی هەڵبژێرێت ، ئەوا خۆشی لەئاکامی هەڵبژاردنەکەی بەرپرسیارە. ئەمەش پێویستی بە تێڕوانین و بیرکردنەوە پێش هەڵبژاردنەکە هەیە، کە لە بوونگەرایەتیدا بە (دوودڵی) ناوزە دەکرێت.

65 هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ١٧٣

66 هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ١٧٤



(دوودڵی) لەم ڕووەوە لەگەڵ بوونی ڕەسەندایەو (ترس) یش لەگەڵ بوونی ناڕەسەن. هەروەها دوودڵی ترساندن لە هەڵبژاردن نیە. هەڵسەنگاندنی لایەنەکانی هەڵبژاردنەکەیە، کە ئەو بوونە ڕەسەنە دەیەوێت خۆی بەلێپرسراو لە هەڵبژاردنەکە دابنێت. پێش ئەوەی تاکێکی ڕەسەن، بۆنموونە پرۆژەی خوێندن لەزانکۆیەکدا هەڵبژێرێت، بیر لەلایەنەکانی خوێندنەکەو ئاکامەکانی دەکاتەوە، ئینجا بڕیار لەسەر چوونە نێو زانکۆ دەدات. ئەوتاکە ڕەسەنە لەبەرئەوەی لە زانکۆ ناخوێنێت چونکە هەموو کەسێک دەچێتە زانکۆ. خوێندن لە زانکۆ پرۆژەیەکی بوونی خۆیەتی وخۆی بڕیاری لەسەردەدات. هەڵبژاردنەکەشی، کە ئاماژە بۆ سەربەستی ئەم تاکە ڕەسەنە دەکات پەیوەندییەکی (زەروری) بەلێپرسینەوە هەیە. تاکێکی ناڕەسەن، بەپێچەوانەی تاکە ڕەسەنەکەوە، خوێندنی لەزانکۆ پرۆژە نیە، شتێکی باوەو وەکو تاکە ناڕەسەنەکانی دەوروبەری بە نەریتێکی باوی دادەنێت، یان کەسانی دیکە ئەم پرۆژەیەی بۆ دیاریدەکەن. لەبەرئەمە دوودڵ نیە، چونکە بەرپرس نیە و ئەوانەی پرۆژەکەیان بۆ هەڵبژاردووە لێپرسراو دەبن. بەڵام لە خوێندنەکە دەترسێت. ئەم تاکە ناڕەسەنە خۆی لە لێپرسینەوەکەی دووردەخاتەوە و لەکاتی نەگەیشتن بە ئاکامی پرۆژەکەش تۆمەت و لێپرسینەوە دەخاتە سەر شانی لایەنە دەرەکییەکان و ئەوان تاوانباردەکات. مرۆڤی ڕەسەنیش هەمیشە خۆی بەلێپرسراو دادەنێت و لەو ئاکامە تاڵە ناترسێت. بەڵام پێش هەڵبژاردنی پرۆژەکەی دوودڵە لەوەی ئەو پرۆژەیە

هەلبژێرێت.

بوونی ناڕەسەن لەژیانی ڕۆژانەدا لە نێو کەلتووره بازاڕییەکەدا خاوەنی بیرکردنەوەو پرۆژەکانی خۆی نیە. ئەو هەرچیەک بێت، ئەو بوونەیە کەسانی دیکە دەیانەوێت و بڕیاری بۆدەدەن. ئەم بارودۆخە ناڕەسەنە کاردەکاتە سەر بیرکردنەوەو گەڕان بۆ دۆزینەوەی ڕاستی بوون و هەڵبژاردنی بەهاکانیش. ئەو، وەکو ئەوان بیردەکاتەوە و زمانە بازاڕییەکەی ئەوانیش بەکاردەهێنێت. بیرکردنەوە و زمان ڕۆڵی ئۆنتۆلۆجی خۆیان وندەکەن و نابن بەو دوو ناوەندە بۆ دۆزینەوەو دەربڕینی ڕاستی بوون. بیرکردنەوە لەنێو کەلتووری بازاڕییدا ئەو شێوەیەیە، کە هەمووکەسێک بەبێ جیاوازی دەتوانێت هەیبێت. تاکە ناڕەسەنەکان وەکو یەک بیردەکەنەوە و زمانەکەشیان هەگبەیەک وشەی ڕیزکراون، کەبەبێ تێگەیشتن لەواتاکانیان بەکاردێن. ئەم خەسڵەتەش لە شێوازی بیرکردنەوەدا بۆ هایدیگەر(ناڕەوان) ی و ئاڵۆزییە Ambiguity ،لەژیانی ڕۆژانەماندا مامەڵە لەگەڵ ئەوشتانەدادەکەین، کە هەموو کەسێک دەستی پێیان دەگات. لەو شتانە دەدوێین، کە هەموو کەسێک دەتوانێت لە بارەیانەوە بدوێت. ناتوانین ڕاستی و ناڕاستی لەیەکدی جیابکەینەوە.[٦٧]

[67] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ١٦٢



بیرکردنەوەی ناڕەسەنانە ئاڵۆز و نا- ڕەوانە و مەبەستی گەڕان و دۆزینەوەی ڕاستی نیە، بەڵکو لاسایی کردنەوەیە. زمانی دەربڕینی ئەم شێوە بیرکردنەوەیەش، کە ڕێگەی دەربڕینی ناوەڕۆکی بیرکردنەوەکەیە لە (گوتار) دا دەبێت بە ئامێرێکی پەککەوتوو. گوتارەکەشی بە گوتارێکی لەکارکەوتووIdle Talk. زمان بۆ لێکۆڵینەوە و دەربڕینی ڕاستی بەکارنایەت و بیرکردنەوە و گوتارەکەشی بازاڕیی و بەکارهێنراوە.[٦٨] ئەو ڕاستیەی لە بازاڕدا و لەژیانی ڕۆژانەدا دەردەکەوێت هەموو تاکەکان دەیناسن و بەبێ جیاوازی لە شێوازی بیرکردنەوەو بۆ چوونیاندا باسیدەکەن. ئەم باسکردنەکەش بە گوتارە لەکارکەوتووەکەیانەوە خۆتێهەڵقورتانیانەCuriosity لەو ڕاستیە و لە حەزو ئارەزووی گەڕان و لێکۆڵینەوەوە سەریهەڵنەداوە. بەم جۆرە، بوونە ناڕەسەنەکان، لە نێو کەلتووری بازاڕییدا بەو شێوازی بیرکردنەوە ناڕەوانەوە و بەگۆتارە لە کارکەوتووەکەوە خۆیان لەڕاستیە باوەکان هەڵدەقورتێنن و مامەڵە لەگەڵ دەوروبەردادەکەن.هەروەها ئەم شێوەی بوونە مەزاجییە، لەبەر ئەمەشە ناڕەسەنە چونکە بوونێکی دۆڕاوەو (تەسلیم) بووە.

[68] ڕۆڵی سەرەکی زمان بۆ هایدیگەر دەربڕینی ڕاستی بوونە، کە لەگەڵ (لێکۆڵینەوە) دا سەرهەڵدەدات. هەروەها ئەم بیریارە لەوباوەڕەدایە یۆنانیەکۆنەکان وشەی (لێکۆڵینەوە *Logos*) یان بۆ (زمان) بەکارهێناوە. بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوی هایدیگەر، لاپەڕە ١٥٥

## بوونی ڕەسەن و تێگەیشتن

شێوەی بوونی ناڕەسەن کاریگەریێتی نەرێی بەسەر بیرکردنەوە و دەربڕین و گەران بەدوای ڕاستیدا لەو بوونەدا هەیە. ئەم کاریگەرێتیە نەرێییە لەکاتێکدا لە ناودەچێت، کە مرۆڤ ڕەسەنانە بژی و بوونێکی نامۆی نەبیت. بوونی ڕەسەن داهێنەری پرۆژەکانی بوونیەتی و بەرێگەی هەڵبژاردنی پرۆژەکانی، لەلایەن خۆیەوە نەک کەسانی دیکەوە ناوەڕۆکی خۆی دادەمەزرێنێت. بۆ هەڵسوڕانی ئەم کارەش، ئەم بوونە ڕەسەنە ئاگامەندە لە بوونی خۆی و پرۆژەکانی تیدەگات. بەتێگەیشتنەوە، نەک شوێنکەوتنی کوێرانەو لاسایی کردنەوە، ڕوو لە پرۆژەکان دەکات و هەڵیاندەبژێرێت. **تێگەیشتن** پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجیە بۆ بوونی مرۆڤ، بەڵام بوونە ناڕەسەنە کە ئەم ڕاستیەی وونکردووەو لەبەرئەوەی بوونی داگیرکراوە و کەسانی دیکە بڕیار لەسەرپرۆژەکانی بوونی دەدەن، ئەوا لە بوونی خۆی و پرۆژەکان تێناگات.[69] ئەمەش ئەوەناگەیەنێت، کە بوونی

[69] مەبەست لە زانینی گوێزراوە (العلوم النقلیة) ی ئایینی ئیسلام نیە، کە بەرامبەر زانینە هۆشەکیەکان (العلوم العقلیة) دادەنرێت. لەگەڵ ئەمەشدابەبیروڕای من (العلوم النقلیة) ی ئایین نموونەیەکی چاکە بۆ جۆری زانین لە نێو بوونە ناڕەسەنەکاندا. مەلاکان هەمیشە بۆ سەرچاوەکان و زانیارییە لەپێشتر ئامادەکراوەکان دەگەڕێنەوە و بەبێ دەستکاری دەیگوێزنەوە بۆ سەردەمەکەیان. زانینەکەیان لە نێو(العلوم النقلیة) دازانینی پێش



ناڕەسەن نەزانە و زانیاری لە بارەی پرۆژەکانەوە نیە. ئەوهەرچ زانینێکی هەبێت خۆی پەیدای نەکردووە و بەدوایدانەگەڕاوە. زانینێکی لەپێشتر ئامادەکراوە و کەسانی دیکە دایانناوە و بەگواستنەوە (نەقڵ) بەم گەیشتوە.[70] بوونی ڕەسەن خۆی بەگواستنەوەی زانینەوە ماندووناکات. لەگەڵ هەموو پرۆژەیەکی نوێوە بە تێگەیشتنی خۆی ڕەسەنانە دەدوێت ئەو ڕاستیە بناسێت، کە بەدوایدا دەگەڕێت. ئەگەر(تێگەیشتن) پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی بوونی مرۆڤ بێت، بۆچی مرۆڤی ناڕەسەنی لێ بێبەشکراوە؟ ئایا پێشمەرج نیە بۆ بوونی مرۆڤی ناڕەسەنیش؟ تێگەیشتن پێشمەرجی ئۆنتۆلۆجیە بۆ بوونی مرۆڤ، گرنگ نیە ئەو مرۆڤە چی شێوە بوونێکی هەبێت. مادامەکی مرۆڤە دەبێت لەبوونی خۆی و دەوروبەرو پرۆژەکانی یان بوون بەگشتی تێبگات. بەڵام لەگەڵ بەناڕەسەنکردنی بوونی و داگیرکردنی لەلایەن کەسانی دیکەوە ئەم ڕاستیەی لێدەشاردرێتەوە. لایەنێکی داگیرکەر نایەوێت لایەنەداگیرکراوەکەی ئاگامەندانە و بەتێگەیشتنەوە مامەڵە لەگەڵ بووندابکات. تێگەیشتن لەواتای بوون ئاگاییە لە بارودۆخی ئەوبوونەش، کە تیایدا دەژی. نەزانی و دەبەنگی و تێنەگەیشتنی بوونە ناڕەسەنەکە، کە بەکەلوپەل کراوە چەند بێ ئاگابێت

سەدەکانی ناوەڕاست و سەدەکانی ناوەڕاستە، کە تاکو ئەمڕۆ لەم سەدەی پاش تازەگەرییەدا مامەڵەی لەگەڵدادەکەن.

[70] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ١٨٢

ئەوەندە بۆ لایەنە داگیرکەرە سودبەخشە. حەزدەکەم نموونەی پەیوەندی نێوان ژن و پیاو لە کۆمەڵگای پیاوسالارییدا بهێنمەوە. پیاو لەنێو کەلتووری پیاوسالارییدا بوونی ڕەسەنی ژنی سڕیوەتەوە و ئەوبوونەی کردووە بە کەلوپەل و بابەتی ئارەزووەکانی خۆی. بەئاگاهاتنەوەی ژن و تێگەیشتنی لە ناڕەسەنی بوونی دەبێتە هۆی گەرانەوەی ژن بەرەو ڕەسەنیەت. ئەمەش هەڕەشە لەدەستەلاتی داگیرکەری پیاودەکات. لەبەرئەمە بۆ پیاو چەند ژن نەزان و ساویلکەبێت و لەواتای بوون تێنەگات، ئەوەندەش بەقەدەر ئەوساویلکەو نەزانینە داگیرکردنی ئاسانتردەبێت. لێرەدا لەبەر ئەوەی ژن مرۆڤە تێگەیشتن پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجیە بۆ بوونی، بەلام بە ناڕەسەنکردنی ئەم بوونە مێژوویی یان فینۆمینۆلۆجیانەیە. بوونێکە لە بونیادە ئۆنتۆلۆجیەکەیدا تێگەیشتن کۆڵەکەیەکی بوونێتی و کۆمەڵەکەی ڕێگەی پێنەداوە ئەم لایەنە زەرورییەی بوونی خۆی ببینێت و بۆتەواوکردنی بوونی و دامەزراندنی ناوەڕۆکی خۆی بەکاریبهێنێت. لەبەرئەمە بوونی ناڕەسەن لەبنەڕەتەوە و لە بونیادە ئۆنتۆلۆجیەکەیەوە ناڕەسەن نیە، بەڵکو ناڕەسەندەکرێت، سیمۆن دیبۆڤوار، بۆنموونە سەبارەت بەناڕەسەنکردنی ژن دەنووسێت، (ژن بەژنی لەدایکنابیت، کۆمەڵ دەیکات بەژن.)[71] ژن مرۆڤە و وەکو هەموومرۆڤێکی دیکەخاوەنی بوونێکی جیاواز و

[71] Simone de Beauvoir. *The Second Sex*, translated by H. M. Parshley, London: Jonathan Cape, 1956. P. 273



تایبەتمەندێتی خۆیەتی، بەلام جیاوازی و تایبەتمەندێتی خۆی، وەکو تاک، لە نێوکۆمەڵدا دەدۆڕێنێت و پیاو ئەم بوونە دەکات بەژن یان بەو ماکینەیەی بۆ حەزوئارەزووی سێکسی و وەچە بەردانەوە دایدەنێت. مرۆڤ بوونێکی جیاوازی لە کەلوپەلە بەردەستەکیەکان و بابەتەکانی زانینەوە هەیە. تەنانەت ئۆنتۆلۆجی ئەم بوونەش لە ئۆنتۆلۆجی بوونەکانی دیکەوە جیاوازە، چونکە ئەم بوونە لە بونیادە ئۆنتۆلۆجیەکەیدا ناتەواوەو بەبێ ناوەڕۆک پەیدابووە. ناوەڕۆکی دەستەیەک خەسڵەتی نەگۆڕو لە پێشترنین، کە هێزێکی دەرەکی و لە ژوور دایانی مەزراندبێت.

چیەتی مرۆڤ پرۆژەکانی بوونێتی، کە ئەو مرۆڤە خۆی بڕیاریان لەسەردەدات و بە بەردەوامی دایاندەمەزرێنێت، ناوەڕۆکی یان چیەتی ئەم بوونە بەو پرۆژانە دەناسرێت. بۆیە گرنگە مرۆڤ بەتێگەیشتنەوە ڕووڵە پرۆژەکانی بکات و هەڵێانبژێرێت. تێگەیشتن لە پرۆژەکان تیگەیشتنە لە بوون و ناسینی خۆ. هاوکات (تێگەیشتن) مەرجێکی لەپێشترە بۆ باسکردن لە پرۆژەیەک و (تەفسیر) کردنی واتاکەی. **تەفسیر** Interpretation لە تێگەیشتنەوە سەرهەڵدەدات. ئەگەر مرۆڤ لە پرۆژەیەک یان لەبابەتێک تێنەگات، ناتوانێت واتاکەشی لێکبداتەوە. بۆ هایدیگەر تەفسیرکردن دەستبەسەرداگرتنی بابەتەکەیە لەلایەن تیگەیشتنەوە و

تێگەیشتنە لەواتاکەی.[72] بێجگە لەوەی تەفسیرکردن پاش تێگەیشتن دەکەوێت و تیگەیشتن دەبێتە جێگەزای تەفسیر، هایدیگەر ئاماژە بۆ بونیاد یان سترەکچەرێکی لەپێشتر دانراو بۆ تەفسیردەکات. ئەمەش جیاوازییەکی دیکە لەنێوان میتۆدە فینۆلۆجیەکانی هوسرڵ و هایدیگەردا دەهێنێتەکایەوە. بۆ هوسرڵ میتۆدی فینۆمینۆلۆجی پێشبیرو پێشبڕیارەکان ڕەتدەداتەوە ڕاستەوخۆ بابەتەکە بەرانبەر ئاگامەندی ڕادەگرێت. ئاگامەندیش بەبێ ئەوەی خۆی بە پێشبیرەکانەوە مەحدود بکات لەواتای بابەتەکە دەکۆڵێتەوە. بەبیروڕای هایدیگەر دەتوانرێت تاکو ڕادەیەک نەک بەتەواوی لەو زەمینەوە لێکۆڵینەوەوتەفسیرەکەمان دەستپێبکەین، کە هیچ پێشبیرو بیردۆزەیەکی ئامادەکراوی لەسەر دانەنرابێت و تەفسیرەکەش زادەی بیری خۆمان بێت. بەڵام ئەمەش خۆدەربازکردنێکی تەواو نیە و ئێمە بۆ تەفسیرکردنەکەمان بەسترەکچەرێکی لەپێشترەوە بەستراوینەتەوە (For-structure).[73] (گادامەر) ئەم دووخاڵە؛ پێشدانانی تێگەیشتن لەئاستی تەفسیرکردنداو سترەکچەری لەپێشتر بۆ تەفسیر، بەگۆڕانێکی گرنگ لە میتۆدی فینۆمینۆلۆجیدا دادەنێت و جیاکردنەوەی فینۆمینۆلۆجی

[72] Martin Heidegger. *Being and Time*, p. 188

[73] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ١٩١



هایدیگەریشە لەوەی هوسرڵەوە.[74]

سترەکچەری لەپێشتر بۆ تەفسیر لە سەر سێ کۆڵەکە دامەزراوە: هەیەی لەپێش Fore-having ، پێش بینین Fore-sight ، پێش چەمکەکان Fore-conception.[75] ئەگەر بمەوێت لە پارچەیەک هۆنراوەی (نالی) بکۆڵمەوە بۆ تەفسیرکردنی واتاکەی پێویستیم بە چەمکەکان هەیە، کە لەوەوپێش هەن و منیش لە ڕوانگەی حەزوئارەزوومەوە دەڕوانمە پارچە هۆنراوەکە و ئەو ئارەزووەم پێش بینینە لە تەفسیرکردنی پارچە هۆنراوەکەدا و لەسەرو ئەمانەشەوە ئەو پارچە هۆنراوەیە خۆی بە سترەکچەرێکی لەپێشترەوە بەستۆتەوە ئەویش جیهانی هۆنراوەیە بەگشتی، کە هۆنراوەکانی (نالی) تێدا دامەزراوە. تێگەیشتنی من لە هۆنراوەی نالی وابەستە بەتێگەیشتنم لە هۆنراوە و جیهانی ئەم شێوە داهێنانە هونەرییە بەگشتی، کە بۆ هایدیگەر بووە بە (هەیەی لەپێشFor-having). بەم جۆرە تێگەیشتن دەبێت

[74] Hans- Georg Gadamer. *Truth and Method*, translated by Joel Weinsheimer and Donald G. Marshall, London: Continuum, 2004. P. 269

[75] Martin Heidegger. *Being and Time*, p. 19

هەروەها بڕوانە:

Stephan Mulhall. *Heidegger and Being and Time*, London: Routledge, 1997. P. 86-89

بەزەمینە بۆ تەفسیرکردن و تەفسیرکردن بەتێگەیشتنەوە و بە یاریدەی سترەکچەرە لەپێشترەکە (واتا) ی بوون دەردەخات. تەفسیرکردن بۆ دەرخستنی واتای بوون (داکۆکی) کردنە Assertion لەو واتایە. وادەردەکەوێت، کە پەیوەندی نێوان تێگەیشتن و تەفسیر زەروری بێت. تێگەیشتن زەمینەیە بۆ تەفسیر و تەفسیریش لەهەمان کاتدا داکۆکیکردنی واتای بوونە بە تێگەیشتنەوە. تێگەیشتن و تەفسیر و داکۆکی کردن لە بوونی ڕەسەندا گرنگیەتی و ڕۆڵی سەرەکی (زمان) دیاریدەکات. بوونێکی ڕەسەن بەتێگەیشتنەوە لەواتای بوون دەکۆڵێتەوە و تەفسیریدەکات. زمان بۆ ئەم بوونە گوتنی لە کارکەوتوو نیە و لەو فاکتۆرە چەقیوانە نادۆێت، کە بوونە نارەسەنەکان بەبێ جیاوازی لە تێگەیشتنیاندا واتاکانی دەجونەوەو باسیدەکەن. لەبوونی ڕەسەندا زمان ئەو ناوەندیە یە(واتا) کانی بوونی تیدا دەردەبڕێت و بەڕێگەی زمانەوە یان (گوتارە) وە تەفسیرکردن و داکۆکیکردن لە واتاکان دەخرێنە بەررۆشنایی بوون. هەرچەندە تەفسیر خاوەنی سترەکچەرێکی لە پێشترەو ئەم سترەکچەرەش لەسەر سێ کۆڵەکە لەپێشترەکە دامەزراوە، کە ئاماژەمان بۆکردن، بەڵام گۆتاری بوونی ڕەسەن جیاواز و ڕەسەنەو ئاکامەکەشی لە داکۆکیکردنی واتای بووناخۆی دیاریدەکات. زمانی بوونی ڕەسەن لە هەنبانەی ئەو وشانە پێکهاتووە، کە لە کەسانی دیکە لەژیانی ڕۆژانەیاندا بەکاریاندەهێنێت. بەڵام واتای وشەکان لە دەربڕین و داکۆکیکردن لەسەر واتای بوون ڕەسەنانە جیاوازن. بۆ



نموونە (ڕاستی) بۆ بوونێکی ڕەسەن ئەو واتایەی نیە، کە بوونە نارەسەنەکان باسیدەکەن. واتای (ڕاستی) لەژیانی ڕۆژانەدا بۆ بوونە نارەسەنەکان(باوە) و واتایەکە بەسەردا سەپێنراو. بوونە نارەسەنەکان بەبێ- تێگەیشتن و لێکۆڵینەوە واتا لە پێشتر ئامادەکراوەکەیان هەڵگرتۆتەوە و خۆیان کردووە بەخاوەنی. ئەو واتایە بۆ هەموو بوونە نارەسەنەکان یەک واتای نەگۆڕ و هەمەکییەو جیاوازییەکانی سەرکوتکراوە. لەبەر ئەمەشە(زمان) بۆ بوونە نارەسەنەکان گوتە لەکارکەوتوەکانە و داکۆکی کردنێک نیە، کە لە ئاکامی تەفسیرکردنی بوون لەسەر زەمینەی تێگەیشتنەوە پەیدابووبێت. یەکێک لە خسڵەتەکانی (داکۆکیکردن) گەیاندنی واتای بوونە. لە پرۆزیشنی (سەری گۆچان چەماوەیە.) واتا یان ڕاستی بوونێکمان دەرخستوە، کە گۆچانە. مەبەست لە داکۆکیکردنە کە لەم پرۆپۆزیشتنەدا گەیاندنی ئەم ڕاستیە یە بەکەسانی دیکە. لەبەر ئەمە تێگەیشتن و تەفسیرکردن و داکۆکی پێویستی بەزمانە و بەبێ زمان ڕوونادەن. زمانیش، بۆ هایدگەر ، گوتە یان گوتارە.[٧٦] گوتار بناخەی ئۆنتۆلۆجی زمانە، نەک نوسین. بوون لەگەڵ کەسانی دیکەدا

[76] لەپێشتر ئاماژەم بۆ ئەو خالە کرد، کە بە دیدی هایدیگەر یۆنانیەکان زاراوەی (زمان) یان بەکارنەهێناوە و Discourse ، گوتاریان بۆ زمان داناوە. هایدیگەر دەیەوێت ئەوەبسەلمێنێت، کە زمان پێش ئەوەی (نوسین) بێت(گوتە یان گوتار *Rede*) بووە. بڕوانە: Martin Heidegger. *Being and Time*, p. 203

داکۆکیکردن، ڕەتدانەوە، ڕاگەیاندن و ڕاوێژکردن دەسەپێنێت، کە بەڕێگەی گوتنەوە دەکرێن. گوتن هەمیشە گوتنە لەبارەی بوونێکەوە.[٧٧]

گوتار، بەتایبەتی لە داکۆکیکردندا، پێویستیەکی کۆمەڵایەتیە. مرۆڤ بەگوتن واتای بوون دەردەبڕێت و داکۆکیدەکات یان ڕەتیدەداتەوە. مەبەستیش لە دانانی(گوتن) بەبناخەی زمان لەوێدایە، کە بۆ هایدیگەر(زمان) گوتنە و بەبێ گوتن نابێت. پێش ئەوەی منداڵ فێربێت وشەی (دایک) بنوسێت، فێری ئەو گوتە یە دەبێت، کە (دایک) ە و هاوکات ئەوگوتەیە ئاماژە بۆ ئەو بوونە دەکات، کە بە(دایک) بۆمنداڵەکە ناسراوە. لە جەختکردن لەسەر (گوتن) و ڕۆڵی گوتن بۆ دامەزراندنی زمان ئەوەناگەیەنێت، کە (بێدەنگی) و (نەگوتن) لەگەڵ ئەم بۆ چوونەدا دژانە ڕاوەستێت و بناخەکەی هەڵوەشێنێتەوە. ئەگەر زمان گوتن بێت، ئەوا(بیستن) و (نەگوتن) یش دەبن بەدوو خەسڵەتی دیکەی بوون- لەگەڵ- کەسانی دیکەدا. داکۆکیکردن لەواتای بوون لە هەردووشێوەکەدا بە(گوتن) و (نوسین) پەیوەندی بە گەیاندنی واتای بوون بەکەسانی دیکەوە هەیە. لە شێوەی یەکەمدا بۆ مەبەستی گەیاندنەکە بەگوتن(بیستن) گرنگە. هاوکات نەگوتنی ئەو واتایەش دەگونجێت و نەبوونی زمان دەرناخات. نەگوتنیش یان بێدەنگبوون لەئاستی ڕاستیەکدا یان واتایەکی بووندا

77 هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٢٠٤



گوتنە. مرۆڤ تەوانای گوتن و نەگوتنی هەیە. لە هەردوو حاڵەتەکەدا، لە گوتن و نەگوتندا واتای بوون بە شێوازی جیاواز داکۆکی لە سەرکراوە.

بێگومان بۆچوونی هایدیگەر لەسەر زمان و دانانی(گوتە) بە بناخەیەکی ئۆنتۆلۆجی بۆ زمان بەرەو مشتومڕی بەرفراوانی واتای زمان وەکو نوسین یان گوتەماندەبات، کە بیریارانی پاش- بونیادگەری بۆ نموونە دێریدا لەسەری دواوە. بۆیەکەم جار دێریدا لە نوسراوێکیدا بەناوی "Structure, Sign and Play in the Discourse" لە کۆڕێکدا لە زانکۆی جۆن هۆپکنس لە ئەمەریکا لەساڵی ١٩٦٦ ئەم کێشەیەی باسکردووەو لە دواییدا لە پەڕتووکی *Of Gramatology* بە درێژی لەسەرینوسیوە.

دێریدا لەم خاڵەدا لەگەڵ هایدیگەرنیە و ڕەخنەی لە کێشەی پێشخستنی (گوتە) گرتووە. بۆ ئەم بیریارە لە فەلسەفەی ڕۆژئاواوەو بەتایبەتی لەسەردەمی ئەفلاتونەوە وابیر لە(سترەکچەر) کراوەتەوە، کە چەق یان بنکەیەکی هەبێت. هەموو شتێک خزێنراوەتە نێو ئەو سترەکچەرەوە و لەوێدا لەواتاکەی کۆڵراوەتەوە. بەڵام چەقەکە یان بنکەی سترەکچەرەکە لەژوور سترەکچەرەکەو هەموو لێکۆڵینەوەیەک دانراوەو بەنەگۆڕ ئاماژەی بۆ کراوە. ئەم هەڵوێستە، کە مێتافیزیکیانەیە بۆ دێریدا(Logocentrism) ە یان (وشەگەرایەتی) یە.

بۆ نموونە زمان سترەکچەری خۆی هەیە بەڵام واتای وشەکان بۆ  زۆربیریار لە دەرەوەی سترەکچەرەکە دایەو پەیوەندی بە چەقەکەوە هەیە. هەروەها وشەیەک، کە لە زاری گوتەکەرەوە دەردەچێت خەسڵەتی تایبەتی خۆی هەیە. یەک لەو خەسڵەتانە ئامادە بوویی گوتەکەرەکەیە، کە ڕاستەوخۆ واتای وشەکە بەبیسەر دەگەیەنێت و بیسەر تەفسیری جیاوازی بۆ ناکات. ئەمەش لێرەدا جارێکی دیکە(گوتە) لە (نوسین) بەپێشتر دادەنێت و ئەم پێشخستنەش کە خەسڵەتی وشەگەرایەتیە دێریدا ناویدەنێت Phonocentrism دەنگەرایەتی .[٧٨]
دەنگەرایەتیPhonocentrism نوسین بە فۆرمێکی نالەبارو نەرێی دەربڕین دادەنێت. هەرچەندە بەنوسین واتای بوون تۆمار دەکرێت و بەردەوام دەمێنێتەوە و لە داهاتووشدا خوێنەر دەتوانێت لەو واتایە تێبگات، بەڵام (نوسین) خەسڵەتی ئامادەبوویی نیە. نوسەر ڕاستەوخۆ لەگەڵ خوێنەردا نادوێت. لەڕێگەی ناوەندی نوسینەوە ئەو پەیوەندییە نا- ڕاستەوخۆیە دروستدەکات.

لەبەرئەمە(نوسین) لە بەردەستی خوێنەردا دانراوەو واتاکەی بۆ تێگەتشتنی خوێنەر بۆ دەقەکە دەگەڕێتەوە. خوێنەریش یان باشترواییە بڵێین خوێنەرەکان

[78] Jacques Derrida. *Of Gramatology*, translated by Gayatri Chakravorty Spivak, Baltimore: The John Hopkins University Press, 1997. Pp. 21-26



تێگەیشتنی(جیاواز) و جۆراوجۆر بۆ دەقەکە دەکەن. (نوسین) نەک(گوتە) خەسڵەتی(جیاوازی) difference لەگەڵ خۆیدا دەهێنێتەکایەوە، کە بۆ دێریدا کاتیگۆرییەکی گرنگە، بەڵام (گوتە) ڕێگە بە سەرهەڵدانی جیاوازییەکان نادات. حەزدەکەم لەوەڵامدانەوەی دێریدا پێشەکی ئەو خاڵە ئاماژە بکەم، کە ئەم بیریارە لەژێر کاریگەرێتی هایدیگەردا ئەو میتۆدەی بەکاریهێناوە میتۆدی هەڵوەشاندنەوە Deconstrution، کە هایدگەر دایهێناوە و لە سیستەمە ئۆنتۆلۆجیەکەیدا بۆ هەڵوەشاندنەوەی بیرکردنەوەی مێتافیزیکی ڕۆژئاوا خستۆتیەگەڕ. پاش ئەم کارتێکردنە، لەوە دەدوێم، کە لەتێگەیشتنی مندا بۆ فەلسەفەی هایدیگەر ئەگەر بەوردی سەرنجی بونیادی ئۆنتۆلۆجی بوونی مرۆڤ بدەین لە بنەڕەتەوە کێشەی(جیاوازی) و نەبوونی(ناسنامە) یەکی نەگۆڕ لەم بوونەدا خۆی دەسەپێنێت. من لە نوسراوێکی دیکەشدا جەختم لەسەر کێشەی(جیاوازی) و گرنگی ئەم کێشەیە لە فەلسەفەی هایدیگەردا کردووە. کە بۆ بیریارانی پاش- بونیادگەری و پاش- تازەگەری بووە بەزەمینە بۆ پێشخستنی گوتارەکانیان .[٧٩] بوونێک، لە بنەڕەتەوە بەجیاوازییەوە پەیدابووبێت و جیاوازبێت و جیاواز بژی گوتەکانیشی جیاوازدەبن، چونکە ئەو بوونە چەق یان ناوەندێکی نەگۆڕو وەستاوی نیە. بوونێک نیە، وەکو ناوەڕۆکی هۆشەکی دێکارت

[79] Muhammad Kamal. “Heidegger and Post-Modernism”, *Indian Philosophical Quarterly*, vol. 29. No. 1, 2002. P. 52

خاوەنی ناسنامەبێت. ناکرێت (دازاین) و ناوەڕۆکی هۆشەکی دێکارت هاوتەراز دابنرێن و لەبەررۆشنایی نەریتی مێتافیزیکی ئەفلاتونیدا لەواتاکانیان بکۆڵرێتەوە. (دازاین) بەتایبەتی لەشێوە ڕەسەنەکەیدا، کە خاوەنی گوتەی خۆیەتی(جیاوازی) لەبوونیدا جێگەی (ناسنامە) بەسەرداسەپێنراوەکەی نەریتی مێتافیزیکی ئەفلاتونی گرتۆتەوە. بوونی ڕەسەن لەبەرئەوەی بێ ناوەڕۆک و بێ ناسنامەیەو هەمیشە لە گۆڕاندایە واتای ڕاستیەکانیش لە گوتەکانیدا دەگۆڕێن . هیچ واتایەک بۆ ئەم بوونە نیە، وەکو فۆرم یان ئایدیاکانی نێو جیهانی بەرزی نەگۆڕی ئەفلاتون بن. چونکە بۆ بوونی ڕەسەن ڕاستی نەگۆڕ نیە. هایدیگەر لەسەرەتاوە، لەگەڵ شیکارییە بوونگەرایەتیەکەی بۆ مرۆڤ بوونی ئەو چەقەی هەڵوەشاندۆتەوە، کە دێریدا ئاماژەی بۆ کردووە. لێرەدا، ئەگەر خوێنەر سەربەست بێت لەوەی تەفسیری جیاواز بۆ دەقێک بکات ، چونکە نوسین خەسڵەتی ئامادەبوونی نوسەرەکەی لابردووە، بیسەریش سەربەستە لەوەی بەگوێرەی بۆ چوونەکان و ویستی خۆی لە گوتەکان تێبگات. گوتەکەر و بیسەرەکە دوو بوونی جیاوازن، چەقێکی هاوبەش و نەگۆڕیان بۆ واتاکان نیە. ناسنامە و سەپاندنی واتای نەگۆڕ لە ژێر بارودۆخی شێوەی بوونی ناڕەسەندا ساختەیە و بونیادی ئۆنتۆلۆجی نیە. ئەوەی هەیە جیاوازییەکانە.



## نیگەرانی

بوونی مرۆڤ ناتەواوە. بوونێکە بەو ناتەواوییەوە پەیدابوەو دەیەوێت خۆی تەواوبکات. ئەمەش دینامیکیەت و گۆڕانکارییەکانی نێو ئەم بوونە بەرەو تەواوکۆیی دەسەلمێنێت. لەبەرئەمە مرۆڤ بوونێکە بەرەو(داهاتوو) یان ئەو بوونەیە پێش خۆی دەکەوێت و پڕۆژەکانی خۆی لەداهاتوودا دادەمەزرێنێت. ڕوو لە داهاتووکردن و هەڵبژاردنی پڕۆژەکان بۆ خۆتەواوکردن، مرۆڤ توشی (دوودڵی) لەئاستی هەڵبژاردنەکەیدا دەکات، چونکە ئەو دەزانێت، کە بێ ناوەڕۆکە و دەبێت خۆی ناوەڕۆک دابهێنێت. ڕاوەستان لەبەردەم ئەم نەبوونەی بووناو هەستکردن بەم جۆرە بەبوون داهێنەرانە مرۆڤ دەخاتە نێو دوودڵی و مشتومڕی لەگەڵ خۆیدا. ئەمەش(ترس) و ترسنۆکی ناخاتەڕوو. دوودڵی، کە هەڵوێستێکی ڕەسەنانەی بوونە لەئاستی بووندا لە ترسەوە جیاوازە. ترس لای مرۆڤی ناڕەسەن سەرهەڵدەدات و بابەتێکی دیاریکراوی هەیە. بۆ نموونە تاکێک لە گورگ دەترسێت. بەڵام دوودڵی بابەتێکی دیاریکراوی نیە. مرۆڤی ڕەسەن لە داهاتووی، یان لەئاستی بووندا دوودڵە. هاوکات(دوودڵی) لە بوونی مرۆڤدا ئاماژە بۆ(نیگەرانی) ئەم بوونە دەکات. مرۆڤ بۆ بوون نیگەران و خەمخوارە بۆیە دوودڵە. (نیگەرانی) بارودۆخێکی دەروونی (سایکۆلۆجی) نیە، پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجیە بۆ بوونی مرۆڤ. ئەم پێشمەرجەش، وەکو پێشمەرجەکانی پێشوتر، لە بوونیادی ئۆنتۆلۆجی ئەم بوونە دایە و دەمانگەیەنێتە ئەو

باوەڕە فەلسەفیەی ئەگەر مرۆڤ هەبێت ئەوا دەبێت نیگەران بێت. لەڕوونکردنەوەی واتای ئەم پێشمەرجەدا هایدیگەر چیرۆکێکی نێو ئەفسانەی یۆنانیەکانی بەم شێوەیە لە پەڕتووکی (بوون و کات) دا گێڕاوەتەوە:

**ڕۆژێک خوای (نیگەرانی) تۆپەڵێک قوڕ دەدۆزێتەوە و پەیکەرێکی لێدروستدە کات. لەوکاتەدا خوا جۆبیتەر دێت و بە خوای نیگەرانی دەڵێت، کە دەتوانێت گیانی بەبەردابکات و گیانی بەوپەیکەرە دا. بەڵام کە نیگەرانی ویستی ناوی خۆی لێبنێ جۆبیتەر ڕازی نەبوو. داوای کرد، کە ئەو پەیکەرە ناوی جۆبیتەر بێت. کاتێک ئەم دووخوایە لە نێو مشتومڕدا بوون(تیلۆس) خوای زەوی پەیدابوو. داوای کرد پەیکەرەکە ناوی(زەوی) بێ چونکە لە قوڕ دروستکراوە و قوڕیش بەشێکە لەزەوی. ئەم خوایانە پەنایان بۆ(زوحەل) خوایەکی دیکە برد، کە چارەیان بکات. ئەم خوایەش بەم جۆرە چارەسەری کێشەکەی کرد: (ئەی جۆبیتەر مادامەکی تۆ گیانت پێبەخشیوە ئەوا لەکاتی مردندا گیانی بۆ تۆ دەگەڕێتەوە. زەوی لەشی داوەتێ و لەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو. بەڵام خوای نیگەرانی ئەم پەیکەرەی داتاشیوە، لەبەرئەمە تاکو ئەو ڕۆژەی دەمرێت ئەم پەیکەرە بۆ نیگەرانیە. لەبەرئەوەی کەستان لەسەر ناوەکەی ڕێکناکەون و ئەمیش لەقوڕ دروستکراوە ئەوا ناوی دەنێم (*homo*) مرۆڤ چونکە (*humus*) قوڕە.**[٨٠]

80 Martin Heidegger. *Being and Time*, p. 242



لەم چیرۆکە ئەفسانەییەدا دووکێشە بۆ ئێمە گرنگن، یەکەم کاتیەتی بوونی مرۆڤ و دووەمیش نیگەرانی. مرۆڤ، تاکو ئەو ڕۆژەی دەمرێت، نیگەرانە. هیچ مرۆڤێک بەبێ نیگەرانی نیەونابێت. تاکێک نیە خەمخوار و نیگەران نەبێت. لەبەرئەوەی بوونی مرۆڤ لەنێو-جیهاندا و لەگەڵ-کەسانی دیکەدایە نیگەرانبوونی بەرانبەر جیهان و کەسانی دیکە دووشێوازی وەرگرتووە. ئەم دووشێوازە لەزمانی ئەڵمانی و ئینگلیزیدا دووزاراوەی جیاوازی بۆ دانراوە. جیاوازی نێوان دووشێوەکەی نیگەرانی وابەستە بە جیاوازی نێوان دووبابەتەکەوە(جیهان) و (کەسانی دیکە) لە بوونی مرۆڤدا. نیگەرانی مرۆڤ بۆ کەلوپەلەکانی بەردەستی و کەسانی دەوروبەری وەکو یەکدی نین. مرۆڤ زیاتر خەمخواری کەسانی دەوروبەرێتی لەوەی نیگەرانی کەلوپەلەکانێتی. نیگەرانی و خەمخۆری کەسانی دیکە لای هایدیگەر *Fürsorge* یەو نیگەران بوونیش بۆ جیهان بە *Sorge* دادەنرێت.[٨١] جیاوازی نێوان دووشێوەی نیگەرانی، کە لەجیاوازی نێوان

[81] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٢٣٧. هایدیگەر مەبەستی تایبەتی لە دانانی ئەو دووزاراوەیە (*Fürsorge*) و (*Sorge*) هەیە. لەزمانی ئینگلیزیشدا زاراوەی Solicitude بەرامبەر نیگەرانی و خەمخۆری مرۆڤ بۆ مرۆڤێکی دیکە Concern بۆ نیگەرانی بەرامبەر جیهاندانراوە. هەردوو ئەم زاراوانە بنەڕەتەکەیان نیگەرانی یان(Care) ە. جۆوان ستەمبۆ ئەم دووزاراوەیەی بە ئینگلیزی بە (Concern) و(Care) داناوە. ( بڕوانە: بوون و کات، جۆوان ستەمبۆ وەریگێڕاوە بۆ ئینگلیزی، لاپەرە ١٨٠)

بابەتەکانەوە سەریانهەڵداوە بنەڕەتێکی ئۆنتۆلۆجییان هەیە. دووبابەتەکەی نیگەرانی سەربەدوو ناوچەی جیاوازی ئۆنتۆلۆجیین و جیاوازن. هەروەها بابەتی یەکەمیان، کە جیهانە بە پێچەوانەی بابەتی دووەمەوە بێئاگایە یان بوونێکی ئاگامەندنیە. نیگەرانی مرۆڤ بۆ بوونێکی ئاگامەند وەکو خۆی جیاوازە لەنیگەران بوونی بۆ کەلوپەلێکی بەردەست.

نیگەرانی مرۆڤانەیە و تەنیا مرۆڤ بەنیگەرانیەوە دەژی. ئەمەش پەیوەندییەکی دیکە، بێجگە لە پەیوەندییە ئەپستمۆلۆجی و کردەگیەکە، لەنێوان ئاگامەندی و بووندا دەخاتەڕوو. بوونی مرۆڤ لەنێوجیهاندا و لەگەڵ کەسانی دیکەدا دەکات بە بوونێکی نیگەران و خەمخۆر، کەلەسەربنەما ئۆنتۆلۆجیەکانی بوونی مرۆڤ دامەزراوە. بوونی مرۆڤ هەمیشە بوونێکە لە نێوجیهان و لەگەڵ کەسانی دیکەدا. ئەم بوونە جیهانییە وبەبێ جیهان و کۆمەڵ نابێت. جیهان و کۆمەڵ دوولایەنی دژوەستاونین یان جیهان بۆ مرۆڤ مەنفانیە، بەڵکو نیشتمانە، بۆیە نیگەرانێتی. لەلایەکی دیکەوە ئەم بوونە بڕاوەیە، مرۆڤ دەمرێت، بوونی لێرەدا لەنێو جیهان و لەگەڵ کەسانی دیکەدا کاتییە و بەنیگەرانیەوە مامەڵە لەگەڵ دەوروبەرییدا دەکات و هەوڵی تەواوکردنی پرۆژەکانی بوونی دەدات. ئەگەر بوونی مرۆڤ نەبڕاوەو هەمیشەیی بوایە و نەمردایە بێگومان هەڵوێستی لەئاستی خۆتەواوکردن و هەڵبژاردنی پرۆژەکانی و نیگەرانبوونی بۆ



جیهان و کەسانی دیکە جیاوازتر دەبوو. باشترین نموونەش نیگەرانبوونە بۆ ژینگەو پاراستنی ژینگە. مرۆڤ دەزانێت بەرەوپێشەوە چوونی پیشەسازی گەیشتۆتە ڕادەی نەرێ و نزیکبوونە لە ڕووخان و لە ناوچوونێکی کتوپڕ و کۆتایی ژیان لێرەدا. لەبەرئەمە بۆ دوورخستنەوەی ئەومەترسییە بۆ ژینگە نیگەرانە. بەڵام لە ناوچوون و بڕانەوەی ژیان بەم کارەساتەی مێژووەوە گرێنەدراوە و فینۆمینۆلۆجیانە نیە. بڕانەوەی ژیان و کاتیەتی بوونی مرۆڤ لە بونیادی ئۆنتۆلۆجی ئەم وشەی (Human) مرۆڤ لە زمانی ئینگلیزیدالە وشەی لاتینی (*Homo*) وە هاتووە و ئەم وشەیەش لە (*humus*) وە وەرگیراوە، کەواتای خۆڵ یان قوڕ دەبەخشێت.

بوونەدایە، بۆیە لەبنەڕەتەوە، بوونی مرۆڤ نیگەرانییە. نیگەرانی لایەنێکی ئەرێ (پۆزەتیڤ) ی بوونی مرۆڤ دەردەخات. بەڵام هەندێکجار نیگەرانی مرۆڤ بۆ مرۆڤێکی دیکە دەبێت بە هێزێکی (نەرێ) و بوونی مرۆڤەکەی دیکە داگیردەکات. نیگەرانی و خەمخۆری دایکێک یان باوکێک بۆ منداڵەکەی دەبێتە هۆی پەرژینکردن و سنورکێشان بەدەوری سەربەستی منداڵەکەدا. ئەمەش بەپێچەوانەی هەڵوێستی گوێنەدان و بایەخنەدانە بەکەسانی دیکە، کە فینۆمینۆلۆجیانە ڕوودەدات.

لەهەردووحاڵەتەکەدا زۆرکردن و کەمکردنی پلەی نیگەرانبوون، کە ئاکامی نەرێیان لەدوایە مرۆڤ لەسەر

زەمینەیەکی مێژوویی نەک ئۆنتۆلۆجی ئەو هەڵوێستە هەڵدەبژێرێت. مرۆڤێک زیادەڕۆکی لە نیگەرانیدابکات یان بایەخ بەکەسانی دیکەنەدات هەڵوێستێکی خۆیەتی و خۆی هەڵیبژاردووە. بەڵام ئەو مادامەکی لەنێوجیهاندایە و لەگەڵ کەسانی دیکەدا دەژی و بوونیکی بڕاوەی هەیە، نیگەرانیشە. ئەوەی لێرەدا پێویستە ئامازەی بۆبکرێت، پەیوەندییە فرەلایەنیەکانی ئاگامەندییە لەگەڵ جیهاندا. لەنەریتی دێکارتیدا لایەنی ئەپستمۆلۆجی یان (زانین) بە تاکەڕێگەو لەپێش مامەڵەکردنی کردەگییەوە دادەنرێت. بۆ دیکارت و شوێنکەوتوانی نەریتەکەی مرۆڤ بە(زانین) پەیوەندی بە جیهانەوە دەبەستێت و مامەڵەی لەگەڵدا دەکات، چونکە جیهان بابەتێکی دەرەکییە. پەیوەندی نێوان ئاگامەندی و بابەتیش ئەپستمۆلۆجییانە یە. بۆ ناسینی جیهان. ئاگامەندی بەڕێگەی بیرکردنەوە تیشک دەخاتە سەر بابەتەکەو لایەنە ڕووناکەکانی دەبینێت و پاش ئەو ناسینە مامەڵەی لەگەڵدادەکات. ئەگەر ئاگامەندی بابەتەکە نەناسێت و تیشکی بیرکردنەوەی نەخاتەسەر ئەوا بابەتەکە ناناسێت و ئەو بابەتەش بەشاراوەیی دەمێنێتەوە. ئاگامەندی هەرجۆرە پەیوەندییەک لەگەڵ بابەتەکەیدا ببەستێت، پەیوەندییەکە لەسەر(زانین) ڕادەوەستێت. هایدیگەر نکۆڵی لەگرنگی زانین بۆ دامەزراندنی پەیوەندی نێوان ئاگامەندی و جیهان ناکات، بەڵام (زانین) بە تاکە ڕێگەو پەیوەندی لەپێشتر دانانێت. بەگوێرەی میتۆدی فینۆمینۆلۆجی، مرۆڤ لەژیانی ڕۆژانەیدا ڕاستەوخۆ لەگەڵ جیهانی دەوروبەرو کەلوپەلەکانی



بەردەستیدا مامەڵە دەکات و ئەم هەڵوێستە کردەگییە یان پراکتیکیە لەپەیوەندییە ئەپستمۆلۆجیەکە لەپێشترە. من لە پێشتر نموونەی ئەو زانستکارەم هێنایەوە، کەلە تاقیگەیەکدا ڕۆژانە لولەیەکی شوشە بۆ تاقیکردنەوەکانی بەکاردەهێنێت. بەڵام ناپرسێت لولەی شوشە چیەوچۆن دروستکراوە. یان، دارتاشێک ڕۆژی چەندجارێک چەکوشەکەی بەردەستی بۆ مێخ داکوتان بەکاردەهێنێت و بیرلە(چیەتی) چەکوش ناکاتەوە. ئەم پەیوەندییە کردەگییە(پراکتیکە) لە پێش ئەوپەیوەندییە ئەپستمۆلۆجیەوەیە، کەدێکارت بەپەیوەندییەکی لەپێشتری دادەنێت. لەسەروئەمەشەوە مرۆڤ لەژیانی ڕۆژانەیدا مەزاجی و عاتیفییەو لەوێوە مامەڵە لەگەڵ دەوروبەریدا دەکات و لەهەمووشیان گرنگتر نیگەرانی مرۆڤە بۆ جیهان و کەسانی دیکە. بوونی(هەموو) ی مرۆڤ لەگەڵ ئەم پێشمەرجە ئۆنتۆلۆجیەدا بەرجەستە دەبێت و بوونێکە، کەتاکو ئەو ڕۆژەی دەمرێت بەنیگەرانیەوە دەڕوانێتە جیهان و خەمخۆری کەسانی دیکەیە. بەم شێوەیە مرۆڤ بەڕێگەی چەند پەیوەندییەکەوە مامەڵە لەگەڵ جیهاندا دەکات. نیگەرانی بوونی مرۆڤ بە تێگەیشتنی بە واتای جیهانەوە بەستراوە.

جیهان، لەڕوانگەی بوونگەرایەتییەوە بابەتێکی دەرەوەی بیرکردنەوەنیە و بەرانبەر بیرکردنەوەش دژوەستاو نیە. کێشەی دژوەستانی بیرکردنەوەو بابەتی بیرکردنەوە هەڵقوڵاوی نەریتی دێکارتیەو لەسەر ئەو بناخە دووەلیستیە

مێتافیزیکیە دامەزراوەکە بیرکردنەوە و بابەتی بیرکردنەوە، یان ئاگامەندی و جیهان بەدوو ڕاستەقینەی جیاواز دادەنێت. لەوسیستەمە ئۆنتۆلۆجیەی بوونگەرایەتی هایدیگەردا ئاگامەندی و جیهان دووڕاستەقینەی جیاواز و لەیەکدی دابڕاونین. بوونی ئاگامەندی بەبوونی جیهانەوە گرێدراوە و جیهان پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجیە بۆ بوونی ئاگامەندی. ئاگامەندی و جیهان وەکو دوولایەنی دژوەستاو بەرانبەر یەکدی دانەنراون. ئاگامەندی بوونێکی جیهانی هەیە و بەشێکە لەجیهان. پەیوەندییەکەیان پەیوەندی لایەنێکە بەهەمووەوە، چونکە ئاگامەندی لایەنێک یان پارچەیەکی هەمووەکەیەو ناکرێت لەیەکدی دابڕێن و جیاببنەوە. ئاگامەندی لەهەرچ شێوازو قۆناخێکی گەشەکردنیدابێت، هەمیشە لەجیهاندایەو جیهانییە. بێجگەلەوەی، کە هەمووبیرکردنەوەیەک بیرکردنەوەیە لەبابەتێکەوە، بیرکردنەوەی بێ ناوەڕۆک یان بێ بابەت نیە، ناتوانین بیرلەبوونی ئاگامەندیش بەبێ جیهان بکەینەوە. ئەمەش گەڕانەوە بۆ پەیوەندییە ئەپستمۆلۆجیەکەنیە. دروستە بیرکردنەوەی بێ بابەت نیە، بەڵام جیهان پێشمەرجە بۆ بوونی ئاگامەندی. ئاگامەندی بەبێ جیهان نیەو نابێت. ئەمەش، هاوکات، بەڵگەیەکی ئۆنتۆلۆجیە بۆ سەلماندنی بوونی جیهان و دوورخستنەوەی بوونگەرایەتی لە ڕاڕەوی سۆلێپسیزم(خۆ-ویستی). بوونی ئاگامەندی، کە بەبێ جیهان نیەو نابێت دەبێت بە زەمینە بۆ سەلماندنی بوونی جیهان. ئەم پەیوەندییە زەرورییە ئۆنتۆلۆجییەی نێوان ئاگامەندی وجیهان زۆرمان لێدەکات



نەک تەنیا بیرکردنەوەی فەلسەفی بەڵکو زمانە فەلسەفیەکەشمان بگۆڕین. لەبەر ڕۆشنایی ئۆنتۆلۆجی بوونگەرایەتیدا(جیهان) بەداکەوتێکی(دەرەکی) دانانرێت. بوونی ئاگامەندی لەنێوجیهاندا بوونێکی دەرەکی و ژیانی مەنفانیە. بوونێکە لە نێو نیشتماندا. جیهان نیشتمانی ئاگامەندییە. نیگەرانی دیاردەیەکی مێژوویی نیە. لەنێو مێژوودا بوون و نەبوونی نیگەرانی تاکێک بەرانبەر بابەتێک زەمینەی بۆچوونە ئۆنتۆلۆجیەکەمان هەڵناوەشێنێتەوە. ئەگەر تاکێک بۆ کەسێک یان بابەتێک نیگەران نەبێت یان نیگەرانی خۆی دەرنەبڕێت ئەوەناگەیەنێت، کە ئەو(نیگەران) نیەو بەهیچ شێوەیەکیش خەمخۆرنیە. هایدیگەر لەم بارەیەوە دەنوسێت،

> نیگەرانی، وەکو سترەکچەری گشتگیری ئەم بوونە پێش {"*Vor*"} هەموو فاکتۆرو هەڵوێستێکی دازاین دەکەوێت، پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجیە. ئەمەش ئەو واتایە دەبەخشێت، کە ئەم بوونە هەمیشە نیگەرانە.[٨٢]

هەروەها لەهەمان شوێندا دەڵێت،(نیگەرانی ئۆنتۆلۆجیانە پێش ئەو دیاردانە دەکەوێت، کەئاماژەمان بۆکردن.)[٨٣] مەبەستی هایدیگەر لە(سترەکچەری گشتیگر) یان باشترواییە

---

[82] هەمان سەرچاوەی پێشو، لاپەڕە ٢٣٨

[83] هەمان سەرچاوە.

بلێین(هەموو) ی بوونی دازاین(مرۆڤ) تاکو ئەو کاتەی دەمرێت لەنێو بوخچەی نیگەرانیدا کۆدەبێتەوە و دەپێچرێتەوە. بوونی مرۆڤ لە- نێو- جیهاندا و لەگەڵ- کەسانی دیکەدا و بەتێگەیشتنەوە لە دامەزراندنی پرۆژەکانی بوونی بەنیگەرانیەوە دەژی. ئەگەر بەرانبەر بوونێکیش نیگەران نەبێت، کە ئەو بوونە دیاردەیەکی مێژوویی و فینۆمینۆلۆجیە، هێشتا مرۆڤ نیگەرانە و بەنیگەرانیەوە مامەڵە لەگەڵ بووندا دەکات. لەگەڵ توێژینەوە ئۆنتۆلۆجیەکەی هایدیگەر بۆ بوونی مرۆڤ کێشەی (دوولایەنی) Dichotomy خۆ و بابەتی خۆ چارەسەرکراوە. ئەم کێشەیە لە مێژووی فەلسەفەدا بۆ نەریتی مێتافیزیکی ئەفلاتون و پاش ئەوەش دێکارت دەگەڕێتەوە. لەونەریتە مێتافیزیکییەدا خۆ و بابەتی خۆ یان باشتر وایە بلێین ئاگامەندی و بوون بە دووشتی جیاواز و دوولایەنی لەیەک دابڕاو دادەنرێن، کە یەکەمیان هەوڵی ناسینی دووەمیاندەدات. سەرکەوتنی هەوڵدانەکەش دەکەوێتە سەرتەواناو بڕستی ئاگامەندی و میتۆدی گەیشتن بە بابەتەکەی. لەلای زۆر فەیلەسوفیش هەوڵدانەکە سەرکەوتنێکی تەواو دەستگیرناکات و بابەتەکە یان لایەنێکی بەلای کەمەوە بە نەناسراوی دەمێنێتەوە. ئەمەش ئاکامێکی نەرێی هەیە و ئاگامەندی ناتوانێت بوون بناسێت. دوولایەنی Dichotomy خۆ و بابەتی خۆ زەمینەی ئۆنتۆلۆجی هەیە. لەو بۆچوونەوە سەریهەڵداوە، کە خۆ و بابەت بە دوو ڕاستەقینەی جیاواز و لەیەکدی داپچڕاو دادەنێت. ئەم بۆچوونە لە ئەفلاتونەوە دەستیپێکرد و ئەریستۆ گەشەیپێدا



و دێکارتیش لەگەڵ گۆڕانکارییە فەلسەفەکانیدا ئەم بۆچوونە دووەلیستییە مێتافیزیکییەی لەنێو سیستەمەکەیدا هێشتەوە. کانت بۆچارەسەرکردنی ئەم کێشەیە و لەهەوڵدانەکەیدا بۆ دامەزراندنی ڕێگەیەک بۆناسینی بابەت بە ئاکامێکی نەرێ گەیشت. لە توێژینەوە ئەپستمۆلۆجیەکەیدا لە پەرتووکی یەکەمیدا لەوباوەڕەدایە کە(خۆ) میتۆدێکی لەباری بەدەستەوە نیە بۆ ناسینی ناوەڕۆکی بابەتەکە(نومینە) بەکاریبهێنێت. ئەزموونەکانی خۆ بۆ ناسینی بابەتەکە کورت بین و سنوردارن چونکە لەلایەکەوە بەستراون بەو کەرەسەی زانینانەوە، کە هەستکردن دەیانگەیەنێت، لەلایەکی دیکەوە ئەزموونەکان لەنێو کات و شوێندا ڕوودەدەن. بەڵام ناوەڕۆکی بابەتەکە(نومینە)، کەڕاستەقینەی بابەتەکەیە هەستەکی نیە [٨]. ئەوەی خۆ دەیناسێت دیاردە و ڕواڵەتی بابەتە نەک ناوەڕۆکی. ئەگەر دێکارت و بیریارانی پێش دێکارت هەوڵیاندابێت دەستەڵاتێک بە (خۆ) بۆناسینی (بابەت) بدەن، ئەوا کانت ئەودەستەڵاتەشی لە(خۆ) سەندۆتەوە و دیوارێکی ئەستوری بە چواردەوری ناوەڕۆکی بابەتەکەدا بەرزکردۆتەوە. خۆ ناتوانێت خۆی بەودیو بگەیەنێت و ڕاستی بابەتەکە بدۆزێتەوە. ئەوەی سەبارەت بابەتەکە دەیزانێت دیاردەکەیەتی نەک ناوەڕۆکە شاراوەکەی ئەودیو دیاردەکە. کانت نکۆڵی لە بوونی ڕاستیەکی ئەو دیو

---

[84] Immanuel Kant. *Critique of Pure Reason*, transtlated by Norman Kemp Smith, London: Macmillan, 1963. Pp. 257- 266

دیاردەکان (نومینە) ناکات. ئەو بەبێ ئەوەی زانیارییەکی لەبارەوە هەبێت باوەڕی بە (نومینە) هەیە. لەهەمان کاتیشدا ناتوانێت ئەو ڕاستیە بناسێت. بێگومان ئەمەش جۆرێکە لە ناکۆکی لەنێو بیرکردنەوەی فەلسەفی کانتدا. سیستەمە ئۆنتۆلۆجیەکەی هایدیگەر بنەمای کێشە دوولایەنەکەی خۆ و بابەت هەڵدەوەشێنێتەوە. (بوون) دەبێت بە بنەمایەکی یەکانەگی هەموو هەبووە جیاوازەکان و سەرچاوەی خۆ و بابەتی خۆ. لەم ڕووەوە ئەوەی (بوون) هەیەتی هەبووەکانیش هەیانە و ئەوەی لە بووندا نیە لەهەبووەکانیشدانیە. ئەمەش وەکو ئەوکێشە لۆجیکییە وایە، کە ئەریستۆ بۆ دەستەواژەی هەمەکی دایناوە و بەزمانی لاتینی پێیدەوترێت *Dictum de omni et nullo*.[85] بوون تەنیا ڕاستیەکی ئۆنتۆلۆجیە. بێجگەلە بوون هیچ شتێکی دیکە نیە خاوەنی ڕاستیبێت. . بوونیش خاوەنی دیاردە و Phenomenon و شێوازی Modality جیاوازە و فرە لایەنە. هەموو دیاردە و شێواز و فرەلایەنەکانی بوون، لەگەڵ

[85] کێشەیەکی لۆجیکییە واتە(پرنسیپاڵی هەموو شتێک و هیچ شتێکیش). ئەگەر بابەت لە دەستەواژەیەکدا خەسڵەتێکی هەمەکی هەبێت ئەوا ئەوخەسڵەتە هەموو ئەو شتانەش دەگرێتەوە، کە لەوبابەتەن یان سەربە(جنس) ی ئەو بابەتەن *Dictum de omni* خەسڵەتی دەستەواژەی (پرۆپۆز یشنی) هەمەکی پۆزەتیڤە. *Dictum de nullo* خەسڵەتی دەستەواژەی هەمەکی نێگەتیڤە ئاگامەندەی بوون(دازاین) لەگەڵ هەبووەکانی دیکەدا یەکەو جیاوازیشە.



جیاوازییەکانیاندا بەتایبەتمەندێتی خۆیانەوە بناخەیەکی (یەکانەگی) یان هەیە، کە بوونە. یەکێک لەلایەنەکانی بوون(خۆ) یە، کە ئاگامەندانە دەڕوانێتە بوون. ئەم لایەنە لەلایەکەوە بوونێکی ئاگامەند و ناتەواوە و لەلاکەی دیکەوە، وەکو هەبووەکان یان بابەتی بیرکردنەوەی سەر بە یەک ڕاستییە و بەشێکە لەبوون. لەدەرەوەی ئەم ڕاستیەدا(بەبێ بوون) بیرلەبوون ناکرێتەوە. لەم بۆ چوونەوە ئاگامەندی و بوون دوولایەنی لەیەکدی دانەبڕاوی ڕاستیەکن و دژوەستاونین و ناکرێت لەیەکدییان جیابکەینەوە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت، کە لەکاتێکدا من بیر لە مێزەکەی بەردەمم دەکەمەوە و دەیکەم بەبابەتی بیرکردنەوەم من و مێزەکە دەبین بەیەک بوون و جیاوازییمان لە نێواندا نامێنێت. من و مێزەکە جیاوازیین، لەهەمانکاتدا هەردووکمان دەگەڕێینەوە بۆ بوون و سەربە یەک ڕاستیین. یەکێتی نێوان من و مێزەکە ئۆنتۆلۆجیانەیە، چونکە هەردووکمان بۆ(بوون) دەگەڕێینەوە. بەڵام نابێت ئەوخاڵەش فەرامۆش بکرێت، کە یەکێتیە ئۆنتۆلۆجیەکەمان تەنیا لە گەڕانەوەماندایە بۆ یەک سەرچاوە و تەنانەت ئەم یەکێتیە ئۆنتۆلۆجیەمان لە جیاوازی ئۆنتۆلۆجیش بێبەش نیە. بونیادی ئۆنتۆلۆجی(من) وەکو (دازاین) لەبوونیادی ئۆنتۆلۆجی (مێز) ە کەوە جیاوازە. من بوونێکی ئاگامەند و ناتەواوم، هەیەو نیەم. مێزەکە بێ ئاگاو پڕە و هەیەیەکی ڕووتە. لەوەزیاتر بەهیچی دیکە نابێت. (چیە) تیەکی پڕو وەستاوی هەیە. بێگومان دەتوانین مێزەکە لە چەند شێوازێکدا ببینین، بەڵام لەوشێوازە جیاوازانەشیدا

چیەتیەکەی نەگۆڕە. بەپێچەوانەی ئەمەوە، بوونی من هەرچ شێوازێکی هەبێت، چیەتیەکەی ناتەواوە و پڕنەبۆتەوە و بەو ناتەواوییەوە دەمێنێتەوە. لەبەرئەمەشە بوونی دازاین لەگۆڕانێکی بەردەوامدایەو بوونی هەبووەکانیش نەگۆڕە.

هەرچ شتێک بوونێکی چڕوپڕی هەبێت و چیەتیەکەی تەواوبێت گۆڕانی تێدا ڕوونادات و بەچی دیکە نابێت. مێز بەمێزی دەمێنێتەوە بە شتێکی دیکە نابێت. پڕی ناوەڕۆک یان چیەتیەکی نەگۆڕو تەواو لە بووندا (پێویستی) گۆڕانکاری لادەبات. بوونێکیش خاوەنی چیەتیەکی ناتەواوبێت هەمیشە پێویستی بەگۆڕان و(داهێنان) ی ئەوناوەڕۆکەیە. بوونی من، وەکو دازاین، زۆررانبازییەکی بەردەوامە بۆ پڕکردنەوەی پێویستیەکانی بوونم و گەیشتن بەو ناوەڕۆکە چڕوپڕەی خۆم دەیخوازم و دایدەهێنم. مرۆڤ بۆ گەیشتن بەتەواوکۆیی داهێنەرانە دەژی. (داهێنان) لەبوونی مرۆڤدا دیاردەیەکی مێژوویی نیە یان فینۆمینۆلۆجیانە نیە. پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی بوونی مرۆڤە، کەهایدیگەر باسینەکردووە و من بەدرێژی لەپەرتووکی (بوون و داهێنان) دا ڕوونمکردۆتەوە. بۆ چوونەکەی من، (کەدژوەستان بەرابنەر هایدیگەر نیە، ئەوەندە دەڵێم دەبوایە هایدیگەر داهێنانیشی بە پێشمەرجی ئۆنتۆلۆجی دابنایە)، لەوبەستێنەوە سەرهەڵدەدات، کە مرۆڤ بەبوونێکی بێ ناوەڕۆک و ناتەواو دادەنێت. بوونێکی ناتەواویش بۆ پڕکردنەوەی ناتەواوی



بوونی پێویستە داهێنەربێت و خۆی ناوەڕۆک بۆ خۆی دابهێنێت. ئەگەر بوونی مرۆڤ لەئاستی بوونی مێزەکەدا پڕوتەواوبوایە، ئەوا داهێنەرانە نەدەژیاو پێویستی نەدەکرد بەردەوام خۆی بگۆڕێت و ناوەڕۆکی خۆی دابهێنێت.[٨٦] مرۆڤ بوونێکی داهێنەرانەی هەیە، چونکە ناتەواوە. لەبەرئەوەی لەگەڵ کەسانی دیکەدادەژی دەشێت شێوازی بوونەکەی ناڕاسەنانەبێت و ئەو تاکە(دازاینە) لەناوکۆمەڵدا نامۆکرابێت. لەژێر بارودۆخی فینۆمینۆلۆجیانەی نامۆبوون و شێوازی ناڕەسەنییدا، تاک دەستەڵاتی(داهێنان) دەدۆڕێنێت. ئەو ناتوانێت، یان ڕێگەی پێنادرێت داهێنەرانە پڕۆژەکانی بوونی بەئەنجام بگەیەنێت.

کەسانی دیکە بڕیار لەسەردامەزراندنی ناوەڕۆکی دەدەن و دەبێت بەو بوونەی کەسانی دیکە دەیانەوێت. شێوازی ناڕەسەنی، کە بە فینۆمینۆلۆجیانە ناوزەدم کرد، دیاردەیەکی مێژووییە و مرۆڤ لەبنەڕەتەوە یان لە بونیادە ئۆنتۆلۆجیەکەیدا نامۆو ناڕە سەن نیە. هەمووتاکێک جیاواز و تایبەتمەندە. لەنێوکەسانی دیکەدا تایبەتمەندییەتێکەی و جیاوازییەکەی لەناودەچێت. لەکاتێکدا دەڵێم (داهێنان)

[86] هایدیگەر لەهیچ نوسراوێکیدا ئاماژەی بۆ(داهێنان) وەکو پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی نەکردووە. لەنوسراوەکانیدا لەسەرهونەری شیعر لە داهێنان دەدوێت بەڵام ئاماژە بۆ داهێنان بەو شێوەیەی من ڕوونمکردۆتەوە ناکات. ئەمەجیاوازی بۆ چوونێکی منە لەگەڵ هایدیگەردا.

پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجیە بۆ بوونی مرۆڤ، بەبێ جیاوازی ئەم پێشمەرجە لەنێو بونیادی ئۆنتۆلۆجی هەموو تاکێکدا دەبینم. جیاوازییەکە لە بونیادە ئۆنتۆلۆجیەکەدا لەنێوان تاکێکی ڕەسەن و ناڕەسەندانیە، بەڵکو لە دیاردە مێژووییەکەدایە. لەوێدا بوونێک داهێنەرە یان داهێنەرنیە، کە لە نێو کۆمەڵدا بە دووشێواز مامەڵە لەگەڵ بوونی خۆیدادەکات: ڕەسەن و ناڕەسەن. مرۆڤی ڕەسەن دەستەڵاتی داهێنانی خۆی نەدۆڕاندووەو هەوڵدەدات خۆی ناوەڕۆک دابهێنێت. مرۆڤی ناڕەسەنیش خۆی بە خاوەنی دەسەڵاتی داهێنان(کە لە بونیادی ئۆنتۆلۆجی ئەودایە) ناکات و لاسایی کەسانی دیکە دەکاتەوە. مرۆڤ داهێنەرە، بەڵام لەوانەیە داهێنەرانە نەژی. بوونی لەگەڵ کەسانی دیکەدا ناچاریدەکات داهێنەرانە لە بووندا نەبێت. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت، کە بوونێکی داهێنەر لەگەڵ کەسانی دیکەدا ناژی و لە کۆمەڵەوە دوورەپەرێزەو تاکێکی تەنیایە. بوون لەگەڵ کەسانی دیکەدا پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجیە و مرۆڤ هەمیشە لەنێو کۆمەڵدایە. سەپاندنی شێوازی ناڕەسەنی بوون بەسەر مرۆڤدا ئەومرۆڤە لەدەستەڵاتی داهێنان دادەبڕێت. بەپێچەوانەشەوە، بوونێکی ڕەسەن لەنێو کۆمەڵدا بوونێکی داهێنەرە. داهێنان، کەوابووە بەپێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی بۆ بوونی مرۆڤ لە(هەیەونیە) ی ئەم بوونەدایە. لەگەڵ دەربڕینی ئەم ڕاستیەدا بەرانبەر دووکێشەی نێو مێتافیزیکی پارمەنیدس و ئەریستۆ دژانە ڕادەوەستین. کێشەی یەکەم، کە بەداهێنانەوە بەستراوە جەخت لەسەر پرۆسەی داهێنانی بوونێک لەنەبوونەوە



دەکات. بۆ پارمەنیدس لەبەرئەوەی تە نیا بوون هەیەو(نەبوون) نیە ئەوا مەحاڵە باس لە داهێنان و گۆڕانیش بکرێت. ئەریستۆ لە پەرتووکەکەیدا *On Interpretation* یاسای ناسنامە Identity یان non-Contradiction نیەی ناکۆکیاکان بەگرنگترین یاسای بیرکردنەوە و بنەڕەتی مێتافیزیک دادەنێت. بەگوێرەی ئەم یاسایە ناکرێت دوولایەنی ناکۆک لەیەک کاتدا بەبوونێک بدرێت .[٨٧] بۆنموونە دەستەواژەی(بەفرسپیە.)، (سپی)، کە بارە بۆ بارهەڵگری(بەفر) ناسنامەیەک بە بارهەڵگرەکە دەدات. ناگونجێت لەهەمانکاتدا بوترێت، کە بەفرسپیە و سپیش نیە. دەستەواژەکەی ئێمە بۆ واتای بوونی مرۆڤ، وەکو (بوونێکی هەیە و نیە) پەیڕەوی یاساکەی ئەریستۆ ناکات. بەبیروڕای من یاساکەی ئەریستۆ لایەنێکی ئەم بوونە دەردەخات و ڕووناکی ناخاتە سەر لایەنەکانی دیکەی. ئەمەش پەیوەندی بە دووجۆر بۆچوونی مێتافیزیکی جیاوازە وە هەیە و دەگەڕێتەوە بۆ چۆنیەتی تەفسیر کردنی بوونی مرۆڤ و بونیادە ئۆنتۆلۆجیەکەی.

87 Aristotle. “On Interpretation” in *Complete Works of Aristotle*, vol.1, Section 6, p. 27

# بەشی چوارەم
# بوونی ڕەسەن و تراجیدیای (کۆتایی) و کات

شێوازی نارەسەنی لە بوونی مرۆڤدا فینۆمینۆلۆجیانەیە. شێوازێکە لەگەڵ پەیدابوونی مرۆڤدا ڕوودەدات و کەسانی دیکە بەسەر ئەم بوونەدا فەرزیدەکەن. مرۆڤ لەژیانی ڕۆژانەیدا و مامەڵە کردنی لەگەڵ کەسانی دیکەدا دەشێت بکەوێتە ژێر کاریگەرێتی(ئەوان) و ئەوان بڕیار لەسەر شێوازی بوونی بدەن. لەپێشتریش باسمانکرد، لەگەڵ سەرهەڵدانی شێوازی نارەسەندا جیاوازییەکانی نێوان تاکەکان و تایبەتمەندێتی هەریەکێک لەوتاکانە دەشاردرێنەوە و ڕێگە نادرێت سەرهەڵبدەن. دەستەڵاتی(ئەوان) دەبێت بەدەستەڵاتێکی داگیرکەر و تاک ناچاردەکات ملکەچی ئەودەستەڵاتەبێت و واز لە تایبەتمەندێتی و پرۆژەکانی بوونی بهێنێت و ببێت بە (ئەوان). لە نێو (ئەوان) دا جیاوازییەکان دەتوێنەوە و تاکەکان وەکو یەکدی بیردەکەنەوە و لە واتای بوون تێدەگەن و لەڕاستی دەکۆڵنەوە. باوەڕی (ئەوان) دەبێت بە باوەڕی تاکەکە و (ڕاستی) ئەوانیش بەڕاستی بۆ ئەو.[88]

[88] بەبیروڕای من شێوازی بوونی نارەسەن و دەستەڵاتی(ئەوان)، کە هایدیگەر نێگەتیڤانە باسیدەکات کێشەیەکی گرنگە بۆ



سڕینەوەی جیاوازییەکان و بەپەراوێزکردنی تایبەتمەندێتی تاکەکان لە بۆچوونی مێتافیزیکی دێکارتیدا جێگەی خۆی گرتووە و بووە بەکێشەیەکی بنەڕەتی لە بیرکردنەوەی فەلسەفی تازەگەرێتیدا. لەنەرێتی دێکارتیدا ناسنامەیەکی هەمەکی و نەگۆڕ بۆ بوونی مرۆڤ(بەگشتی) لایەنێکی فەلسەفی زەق و دیارە. لەم پێگەیەشەوە بیریارانی تازەگەری زەمینەیەکی پتەویان بۆ سەرکوتکردنی جیاوازییەکان خۆشکردووە. نارەسەنی و ڕەسەنی، نامۆیی و خۆ- ناسین لەگەڵ سڕینەوەی جیاوازییەکان و پێکەوەژیانی جیاوازییەکاندا سەرهەڵدەدەن. بیروباوەڕێکی فەلسەفی باوەڕی بە پێکەوەژیانی جیاوازییەکان نەبێت بیروباوەڕێکی خۆبەحەقزان و فاشیستە. هەڵوێستی فاشیستانە بەتەنیا دیاردەیەکی ئایدۆلۆجی فەلسەفی یان ڕامیاری نیە، کە ڕێز بۆ جیاوازییەکان دانانێت و لە ناویاندەبات. ئەگەر تاکێکیش هەوڵی داگیرکردنی بەرابنەرەکەی بدات و جیاوازییەکانی نێوان خۆی و بەرانبەرەکەی بسڕێتەوە ئەو تاکە فاشیستە. نموونەی ئەم جۆرە هەڵوێستە فاشیستانەیە بەئاشکرا لەنێوان کۆمەڵێکی سەربەکەلتوورێکی خێڵگەری و

تێگەیشتنمان لە بیروباوەڕی ڕامیاری هایدیگەر. لەڕوانگەی ئەم بۆچوونەوە دەتوانین بڵێین، کە دەستەڵاتی(ئەوان) بۆ لەناوبردنی جیاوازی و تایبەتمەندێتی تاکەکان دەستەڵاتێکی ڕامیاری فاشیستانەیە و هایدیگەر دژی ڕادەوەستێت. ئەمەش بەڵگەیەکە بۆ دوورخستنەوەی فەلسەفەی هایدیگەر لە ئایدۆلۆجی نازییەکانەوە، کە لەبەشێکی دیکەی ئەم نوسراوەدا زیاتر ڕوونیدەکەمەوە.

ئایینی یان لە نێوان نێرینە و مێینەی کۆمەڵدا دەبینرێت. لایەنەداگیرکەرەکە بێ ئاوەڕدانەوە لە بوونی بەرانبەرەکەی بەهاکانی خۆی بەسەردا دەسەپێنیت و هەموو ئەو شتانە حەرام دەکات، کە خۆی حەزیانلێناکات و لەبەرژەوەندی ئەودا نین. لایەنەداگیرکراوە ناڕەسەنەکەش بەها بەسەردا سەپێنراوەکان بە بەهای خۆی دادەنێت و خۆی بەبابەتێکی حازلێکراو بۆ داگیرکەرەکەی دادەنێت. لەژێر بارودۆخی نەرێی داگیرکردندا بوونە ناڕەسەنەکە داهێنەرانە ناژی، چونکە نکۆڵی لە جیاوازی و تایبەتمەندێتی خۆی کردووە و لەهەمانکاتیشدا خۆی کردووە بە(بابەت) بۆ(ئەوان). بابەتیش بەپێچەوانەی (خۆ) وە خاوەنی (چیەتی) یەکی نەگۆڕە. لێرەدا بەناڕەسەنکردنی تاک گواستنەوەیەکی فینۆمینۆلۆجی (میژوویی) تاکە لە(خۆ) وە بۆ (بابەت). بەبابەتکردنی خۆ و بەنامرۆڤکردنی مرۆڤە.

ئەگەر لە پەیوەندی نێوان نێرومێدا، کەلەپێشتر ئاماژەمان بۆکرد، مێیەک بەتەنیا خواستی ئەوەبکات نێرەکەی بەرانبەری حەزیلێبکات و لێی ڕازیبێت ئەوا ئەومێینە خۆی کردووە بە بابەت بۆ نێرەکە و بوونی خۆی، وەکو(خۆ) یەکی ئاگامەندو جیاوازو تایبەتمەند خستۆتە پەراوێزی پەیوەندییەکەوە و لەبیریچۆتەوە، کە ئەو مرۆڤە یان خۆیە و نابێت بە بابەت. بەڕەسەنبوونی بوونێکی ناڕەسەن گەڕانەوەی ئەو بوونەیە بۆ(خۆ) و باوەڕهێنانە بە تایبەتمەندێتی و جیاوازییەکانی لەگەڵ بوونەکانی دیکەدا. لەبەرئەوەی بەناڕەسەنبوون لە ئاڵوگۆڕکردنی بونیادی ئۆنتۆلۆجی مرۆڤدا نیە. گۆڕانی فینۆمینۆلۆجیانەی



شێوازەکانی بوون کارناکەنە سەر زەمینە ئۆنتۆلۆجیەکە. (دازاین) لە هەرچ شێوازێکی بووندابێت، ڕەسەن یان ناڕەسەن، ئاگامەندو ناتەواوە. بۆگۆڕانی شێوازی بوونی لە ناڕەسەنیەوە بۆڕەسەن پێویستە دزاین ڕاستی بوونی خۆی بناسێتەوە و بزانێت، کە بوونێکی جیاوازو تایبەتمەندی هەیە. یەکێک لەوهۆکارانەی دازاین بەئاگابهێنێتەوە و بەرەو ڕەسەنی پەلکێشەی بکات ڕاوەستانێکی ئاگامەندایە لەبەردەم تراجیدیای بووندا. دازاین بوونێکی کاتی و بڕاوەی هەیە و کۆتاییەکەی حەتمیە. لەبەرئەمەشە دازاین بەنیگەرانیەوە لەنێو جیهاندا لەگەڵ کەسانی دیکەدا دەژی.

کۆتایی دازاین لە بڕانەوەی ڕووداوەکان و هەبووەکانەوە جیاوازە. یەکەم، کۆتاییەکە تراجیدیایە، چونکە مرۆڤ بەئاگاوە بەرەوکۆتاییەکەی دەڕوات. دووەمیش کۆتایی دازاین بڕانەوەیەکی هەمیشەییەو لەگەڕانەوە بەدەرە. بۆنموونە دەڵێین بارانەکە وەستا یان فلیمەکە تەواو بوو. باران جارێکی دیکە دەبارێتەوە و دەتوانین چەند جارێکیش فلیمەکە ببینینەوە. بەڵام ، کە مرۆڤ مرد، جارێکی دیکە ناگەڕێتەوە.

ئەو(کۆتایی) یەی باسیدەکەین، ئاماژە بۆ دازاین،
وەکو بوونێکی بڕاوە ناکات { *Zu- Ende- Sein*} ،
بەڵکو دەمانەوێ بڵێین، کە ئەم بوونە ڕوولەکۆتاییە
{*Sein Zum Ende* }. مردن شێوازی ئەم بوونەیە و
لەگەڵ یەکەم ساتی بوونیەوە دازاین بووە بەخاوەنی

ئەم شێوازە و ئەوەندەش پیرە، کە بمرێت.[٨٩]

لێرەدا بۆ ڕوونکردنەوەی جیاوازی نێوان مردنی دازاین و وەستانی باران. هایدیگەر دوو زاراوەی جیاوازی بەکارهێناوە، (بوونی بڕاوە) *Zu- Ende- Sein* و بوونێکی(ڕوو لە کۆتایی) یان (بەرەو کۆتایی) *Sein Zum Ende*. ئاگایی و ناتەواوی دازاین واتایەکی تایبەت بەکۆتایی ئەم بوونە دەدەن. لەبەرئەوەی دازاین ناتەواوە و لە ناوەڕۆک بەدەرە بەردەوام هەوڵی خۆتەواوکردن دەدات. ئەم هەوڵدانە بەردەوامە بەدرێژەدانی ژیانی خۆگەیاندنە بەکۆتایی چونکە خۆتەواوکردن و دامەزراندنی ناوەڕۆکێکی پڕ لەکۆتاییدا دەستدەکەوێت. ژیانی ئەم بوونە ناتەواوە، بەم شێوەیە، بەم بونیادە ئۆنتۆلۆجیەوە، ڕەوت و گۆڕانکارییەکی بەردەوامە بەرەو کۆتایی. هەرچەندە دازاین هەمیشە لەبەردەم مردندا ڕاوەستاوە، بەڵام نایەوێت ئێستا بمرێت چونکە هێشتا خۆی تەواو نەکردووە و پڕی بەناوەڕۆکی نەداوە. ئەو هەیە و نەبووە بەوشتەی خۆی دەیەوێت. کەوابوو، توێژینەوەکەمان لە واتای کۆتایی بۆ بوونی دازاین جیاوازترە لە باسکردن لەسەر ڕاوەستانی باران و تەواوبوونی فلیمەکە. دازاین بەئاگاوە دەیەوێت خۆی تەواوکات، ئەمەش دازاین بەو کۆتاییە تراجیەیاییە دەگەیەنێت، کە بە(مردن) ناوزەدی دەکەین. لەم ڕووەوە، بوون- بەرەو- کۆتایی بوونە بەرەو خۆتەواوکردن. لەگەڵ

[89] Martin Heidegger. *Being and Time*, p. 289



کۆتاییهێنان بوونی دازاین پڕوتەواو دەبێت. ئەمەش شێوازێکی دیکەی بوونی دازاین، وەکو بوونێک، کە پێش خۆی دەکەوێت و ڕوولەداهاتوو دەکات، دەردەخات.

تەواوبوون لەم کۆتاییە تراجیدییەدا گەیشتن بە دواپلەی(تەواوکۆیی) نیە دازاین بیخوازێت. لە هیچ قۆناخێکی بوونیدا دازاین خۆی بەپڕ و تەواو دانانێت و هەمیشە بەم هەژارییەوە دەژی. لەگەڵ مردندا دازاین ناتوانێت لەوەزیاتر پێش خۆی بکەوێت و ڕوولەداهاتوو بکات. مردن کۆتایی بەپڕۆژەداهێنانەکانی دەهێنێت و تەواویدە کات. لێرەدا، لەگەڵ کۆتایی هێناندا پێناسکردنی ئەم بوونە دەگونجێت و بەتەواوی دەناسرێت، چونکە بوونی دەبێت بە(هەبوو)، وەکو بوونی مێزەکە بەچی دیکە نابێت. (هەیەو نیەی) دازاین دەبێت بەهەیەیەکی نەگۆڕو چەقیو. دەبینین بەدووشێوە دازاین خەسڵەتی بنەڕەتی خۆی، وەکو بوونێکی ئاگامەند و ناتەواو وندەکات; لەکاتێکا ناڕەسەنانە دەژی و هەروەها بەمردنیش. لەهەردوو شێوەکەدا (دازاین) دەستەڵاتی داهێنان دەدۆڕێنێت و دەبێت بە(هەبوو). بەڵام جیاوازی نێوان ئەم دووشێوەیە لەوێدایە، کە دازاینێکی ناڕەسەن دەتوانێت بۆ ڕەسەنی بوونی بگەڕێتەوە بەڵام لەمردن دەربازنابێت.

مردن بە جۆرێکی دیکە بوونێکی ناڕەسەن بەرەو ڕەسەنیەت دەگەڕێنێتەوە. ئەویش لەڕوودانی مردنەکەدا نیەو بەتێگەیشتنە لەواتای بوون، وەکو بوونێک بەرەوکۆتایی و

حەتمیەتی تراجیدیای بڕانەوە. بوونی ناڕەسەن لە جیاوازی و تایبەتمەندێتی و تاکی خۆی بێئاگایە. وەستانی لەبەردەم مردندا، یان ئاگاهاتنەوەی لەم تراجیدیایە دەیگەیەنێت بەو باوەڕەی، کەئەو(تەنیا) بەبێ کەسانی دیکە ڕووی لەمردنەو تامی تراجیدیاکە دەکات. کەسانی دیکە ناتوانن تراجیدیاکەی بوونی بگۆڕن، لەمردندا (دازاین) ڕووبەڕووی بوون دەبێتەوە. مردنی ئەو (گونجاندنەیە)، کە دازاین لەنێوجیهان هەڵدەکێشێت..... هەموو پەیوەندییەکانی لەگەڵ دازاینێکی دیکەدا دەپچڕێنێ. ئەم گونجاندنە نا-پەیوەندییە حەتمییە.[٩٠]

لەم ئەزموونەدا، یان تێگەیشتن لە تراجیدیاکە تاک بە تەنیا ڕادەگرێت و تایبەتمەندێتی بوونی خۆی و جیاوازییەکانی بۆ دەردەکەون. تراجیدیاکە، هەیدیگەر گوتەنی، هەمووپەیوەندییەکانی مرۆڤ لەگەڵ بووندا هەڵدەوەشێنێتەوە و دەیانبڕێت. ئەگەر مرۆڤ لەهەموو ژیانیدا لەنێو تۆڕی پەیوەندییەکاندا ژیابێت و هەمیشە بەم پەیوەندییانەوە خۆی ناساندبێت، لەمردندا بیر لەو پەیوەندییانە ناکاتەوە و بە(تەنیا) بەبێ کەسانی دیکە دەمرێت. کەسانی دیکە ناتوانن گۆڕانکاری بەگەیشتن بەوکۆتاییە بهێننەکایەوە. بێگومان نکۆڵی لەوەناکرێت، کە

[90] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٢٩٤. زاراوەی(گونجاندن) م بۆ Possibility داناوە و مەبەستی هایدیگەر لەوەدایە، کە مردن ئەشێ ڕووبدات، هەروەها پڕۆژەکانی بوونیش بە Possibility دادەنێت.



نەخۆشێک پاش تیمارکردنی لەلایەن پزیشکەوە لەمردن ڕزگاری دەبێت. پێویستە ئەو پرسیارە ش بکرێت، ئایا ئەو نەخۆشە لەمردن ڕزگاری دەبێت یان کاتی مردنەکەی دوادەخرێت؟ مرۆڤ لەمردن ڕزگارینابێت چونکە بوونێکی تراجیدی هەیە و بڕاوەیە. ئەم نەبوونەی لێرەدا باسیدەکەین لایەنێکی گەورەیە لەبوونی. ئەو بوون و نەبوونە. لەنەبوونەوە هاتۆتە بوونەوە و لەم بوونەوە بەرەو نەبوون دەڕوات. بەگەیشتن بەم نەبوونە ناوەڕۆکی تەواو دەبێت و دەبێت بە خاوەنی چییەتیەکی نەگۆڕ. بوونی حەتمی کۆتایی ئەگەر بەشتێکی گونجاو دابنرێت ئەوا گونجاندنی مردن لەگەڵ خۆیدا گونجاندنی هەمووپڕۆژەکانی داهاتوو دەپێچێتەوە و کۆتاییان پێدەهێنێت. ڕێگەنادات دازاین لەوەزیاتر ببێت بەشتێکی دیکە و پڕۆژەکانی دابهێنێت. مردن دەبێت بەدوا پڕۆژەیەکی گونجاوی حەتمی لەبووندا، کەهەموو کەسێک بیەوێ و نەیەوێ دەبێت پێیبگات.

خسڵەتێکی دیکەی ئەزموونی وەستان لەبەردەم تراجیدیای بووندا، بێجگە لەپەیوەندییە نا- پەیوەندییەکان بەکەسانی دیکەوە، گەڕانەوەیە بۆ (دوودڵی). لەپێشتر لەوخاڵە دواین، کە هایدیگەر(ترس) بەبوونی ناڕەسەن و(دوودڵی) بەبوونی ڕەسەنەوە گرێدەدات. مرۆڤی ناڕەسەن ترسنۆکە، لەبەرئەمەشە(تەسلیم) بووە و سازش بۆ دەستەڵاتە داگیرکەرەکە دەکات. بەپێچەوانەی ئەمەوە، بوونی ڕەسەن چاو نەترسە، بەڵام لەئاستی بووندا بەگشتی(دوودڵە).

ئەودەزانێت خۆی خاوەنی پرۆژەو بەهاکانی بوونیەتی بۆیە پێش هەڵبژاردنی پرۆژەیەک و بڕیاردان لەسەردامەزراندنی دوو دڵە. مردنیش جارێکی دیکە ئەم دوو دڵییە لای دازاین پەیدادەکاتەوە. دازاینێک بیرلەمردن بکاتەوە یان لەبەردەم ئەو ئەزموونەدا ڕاوەستابێت، (کەهەمووکاتێک لەبەردەم ئەم ئەزموونەدایە) لەئاستی بووندا دوودڵە. ئەوپرسیارەی لێرەدا خۆی دەسەپێنێت ئەوەیە، چۆن بزانین دەمرین، کەهێشتا بەو ئەزموونەدا تێنەپەڕیوین؟ یان چی لەبارەوە دەزانین؟ ئەگەر لەبەستێنێکی ئەزموونگەرانەوە بڕوانینە ئەم دوو پرسیارە ناتوانین وەڵامیان بدەینەوە، چونکە ئەزموونی مردنمان نیە، کاتێکیش، کە دەمرین ناتوانین لەو ئەزموونە بدوێین. لەگەڵ ئەمەشدا هەندێک زانینمان لەبارەوە هەیە. دازاینێک مردنی دازاینێکی دیکە دەبینێت، باشتروایە بڵێین، کە کەسێکی دیکە پێش ئێمە دەمرێت. ئێمەش لەناشتنی بەشداری دەکەین و دەزانین ئەوکەسە جارێکی دیکە نابینینەوە. بەڵام ئەمە تێگەیشتنی مردنە لەدەرەوەی ئەزموونی مردندا. بۆئەوەی لەناوەڕۆکی ئەزموونەکە بەتەواوی تێبگەین دەبێت بمرین. ئەی ئەوە جۆرێک لە زانین نیە، کە مرۆڤ دەزانیت دەبێ بمرێت؟ مرۆڤ، لەوانەیە، لەدامەزراندنی پرۆژەیەکیا، لەسەرکەوتنێک، لە بینینی هاوڕێیەکی، لەگەشتێک، لەگەڕانەوەی بۆ نیشتمان دڵنیانەبێت. بەڵام دڵنیایە لەوەی، کە دەمرێت. مردن بۆ بوونێکی ڕەسەن، وەکو پرۆژەکانی دیکە خۆی دەرناخات. ئەم پرۆژەیە دواپرۆژە و ڕێگری سەرهەڵدانی پرۆژەکانی دیکەیە. پرۆژەیەکە، کە



کۆتایی بەپرۆژەدانان دەهێنێت. بوونەڕەسەنەکە تەواو و پڕدەکات. مەبەستی من لێرەدا ئەوەنیە، کە تەنیا بوونێکی ڕەسەن دەمرێت. مردنی بوونی ڕەسەن لەمردنی بوونی ناڕەسەنەوە جیاوازە. بوونێکی ڕەسەن ئەزموونێکی ناوەکی لەگەڵ مردندا هەیە، بەدواپرۆژەی دادەنێت. بۆئەو بەم پرۆژەیە کۆتایی یەکی بنبڕ بە بوونی خۆی لەنێو جیهان و لەگەڵ کەسانی دیکەدا دەهێنێت و بەئاگاوەو دوو دڵییەوە ڕووبەڕووی ئەم پرۆژە بنبڕە تراجیدییە دەبێتەوە. ئەگەر بۆ پزیشکێک مردن لەوەستانی دڵدابێت، بۆ ئەم بوونە ڕەسەنە لە گەیشتن بە وێرانەخاکی نەبوون و کۆتایی بوونیدایە لەنێو جیهاندا. مردنی کۆتایی بوون و جیهانە و (نەگونجاندنی گونجاوەکانە).[٩١]

مردن بۆ بوونێکی ناڕەسەن لە نێو سترەکچەری کەلتوورە بازاڕییەکەی (ئەوان) دا ڕووداوێکی ڕۆژانەیە. لەبەرئەوەی (ئەوان) جیاوازی و تایبەتمەندی تاکەکانیان لە ناو بردووە و تاکەکان لەیەکدی دەچن و جیاوازییان لەنێواندا نەماوە، مردنی تاکێک ڕووداوێکی تراجیدی نیە یان لەناوچوونی تاکێکی جیاوازو تایبەتمەند نیە، کە کەسێکی دیکە نەتوانێت جێگەی بگرێتەوە یان، وەکو ئەو پەیدانەبێتەوە. بوونە ناڕەسەنەکان بە نا- مرۆڤ کراون و لە پەیوەندی و خسڵەتە مرۆڤانەکان دابڕاون. کەلتوورە بازاڕی و سەرکوتکەرەکە ئەوانی کردووە بەکەلوپەل. هەموو بەبێ

---

[91] هەمان سەرچاوە.

جیاوازی وەکو یەک دەوردەبینن و جێگە پڕدەکەنەوە. ئەگەر جێگەیەک بەمردنی یەکێک چۆڵ کرا، ئەوا یەکێکی دیکە هەیە ئەو جێگەیە پڕبکاتەوە. دەستەڵاتی داگیرکەری کەلتووری بازاڕی بیر لە بوون و ویستی تاکەکان ناکاتەوە و بەگوێرەی بەرژەوەندییەکانی خۆی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات.[92] مردنی تاکێک لەوێدا هەستیپێدەکرێت، کە زیان بە بەرژەوەندییەکانی دەستەڵاتە داگیرکەرەکە، یان(ئەوان) بگەیەنێت. ئەگەر مردن(گونجاندنی) بوون بێت، دەبێت پڕۆژەی ئەو بوونەش بێت. تاکو ئەوڕادەیەی کەسێک (مردن) دەکات بەپڕۆژەو لەپێش وەختا ئەو پڕۆژەیە بەئەنجامدەگەیەنێت دەتوانین مردن بەپڕۆژە دابنێین. مرۆڤ لەوێدا سەربەستە خۆی کاتی مردنەکەی پێشتربخات و بڕیاربدات ئێستا بمرێت.

بەلام هەرگیز ناتوانێت هەڵبژێرێت، کە نەمرێت. کۆتایهێنان

[92] گوایە زستانی ئەمساڵ لەم شارەی منی تێدادەژیم (ماڵبۆرن) زۆر سارد دەبێت و خەڵکێکی زۆر توشی نەخۆشی ئەنفۆلۆنزا دەبن. دەوڵەت داوا لە خەڵکی دەکات ڕووبکەنە خەستەخانەکان و خۆیان بکوتن. ئەگەر بەوردی بڕوانینە ئەم کێشەیە دەبینین، کە دەوڵەت لەبەر نیگەرانی بۆخەڵکی بەم کارە هەڵناسێت. گوایە خەرجی بۆ دەرمان و چارەسەرکردنی ئەوانەی توشی ئەم نەخۆشیە دەبن و لەماڵەوە دادەنیشن و ناچن بۆسەرکارەکانیان لەبەرئەوەی نەخۆشن لەوەزۆرترە، کە دەولەت بەبێ پارە خەڵکی دژی نەخۆشییە بکوتێت. دەوڵەت بیرلەبەرژەوەندی ئابووری خۆی دەکاتەوە نەک ژیانی خەڵکی.



بە بوون حەتمیەو نەگۆڕە. بەبۆچوونی من، بەپێچەوانەی بۆ چوونەکەی هایدیگەرەوە، بوون- بەرەو- مردن یان کۆتایهێنانە تراجیدیەکە، وەکو بوون- لەنێو- جیهان و لەگەڵ- کەسانی دیکەدا، پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجیە بۆ مرۆڤ نەک (گونجاندن Possibility). لەکاتێکدا مردن دەبێت بە Possiblity، کە بتوانین بڵێین(مردن) ڕوودانێکە دەشێت، یان لەوانەیە دازاین بمرێت. پڕۆژەکانی بوون، کە بەگونجاو Possibility هایدیگەر ناوزەدیاندەکات ڕوودانێکی حەتمی نین و سەربەستانە مرۆڤ هەڵیاندەبژێرێت. بۆنموونە بوون بە شاعیر پڕۆژەیەکی بوونە کەسێک هەڵیدەبژێرێت هاوکات ئەو کەسە دەتوانێت پڕۆژەکە هەڵوەشێنێتەوە. پڕۆژەی(مردن) تەنیا لە لایەکەوە بەستراوە بە سەربەستی مرۆڤەوە، لەو لایەنەوە، کە مرۆڤ دەتوانێت خۆی بکوژێت، نەک مردن ڕەتبداتەوە. لەبەرئەمە من(بوون- بەرەو- مردن) بە پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی بۆ بوونی مرۆڤ دادەنێم. مادامەکی مرۆڤ هەیە، ئەوا دەبێت بمرێت. بوونی مرۆڤ لەنێو جیهاندا بوونە بەرەومردن. بێگومان هایدیگەر لەوباوەڕەدایە، کەبوونی مرۆڤ بوونێکە بەرەومردن، بەلام مردن بە پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی دانانێت و بە دواگونجاو یان(ناگونجاندنی گونجاوەکان) دایدەنێت.

بەڵگەکانی من بۆ سەلماندنی بۆچوونەکەم سەبارەت بەدانانی مردن بە پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی بۆ بوونی مرۆڤ ئۆنتۆلۆجیانە و فینۆمینۆلۆجیانەیە. بەڵگەی یەکەم لەسەر زەمینەی بونیادی ئۆنتۆلۆجی ئەم بوونە ڕادەوەستێت.

لەوپێگەیەوە دەکەوێتەگەر، کە بوونی مرۆڤ لە بنەڕەتەوە بە کاتی و ناتەواو دادەنێت. لەبەرئەمەشە مرۆڤ بەپێچەوانەی هەبووەکانەوە لە گۆڕانکارییەکی بەردەوامدایە. بەڵام بەردەوامیەکەی هەناسەکورت و بڕاوەیە، چونکە بوونەکەی کاتییە. مەبەستمان لە بوونی کاتی مرۆڤ ئەوەنیە، کەئەم بوونە لەنێوکاتدایە. (کات) پانتایی نیە تاکو مرۆڤی تێدابێت، بەڵکو بوونی مرۆڤ کاتە، یان بوونێکی بڕاوەو دینامیکیە، کە هەرگیز وەکو خۆی نامێنێتەوە و کۆتاییشی پێدێت. کات بۆ ئەم بوونە، لەم بونیادە ئۆنتۆلۆجیەوە واتایەکی جیاوازی هەیەو لە واتای کات بۆهەبووەکان جیادەبێتەوە. لەلایەکەوە ڕەوتی دینامیکی ئەم بوونە بەرەوپێشەوەچوون و بوونە بەرەو تەواوکۆیی، لەلایەکی دیکەوە گەیشتن بەتەواوکۆیی مەحاڵە و ڕەوتە دینامیکیە ئاگامەندانەکە بەکۆتاییەکی حەتمی دەگات، کە دەبێت بە دوا ویستگەی گەشەکردنەکە. لەم ڕوانگەیەوە دەبینین مرۆڤ نیە بەم ڕەوتە دینامیکیەدا بەرەو تەواوکۆیی نەڕوات و لە ویستگەیەکدا کتوپڕ کۆتایی بەگەشتەکەی نەیەت. بێگومان ئەم توێژینەوەیەمان بەسەر شێوازی بوونی ڕەسەندا دەسەپێت و لەمەڕبوونی نارەسەن نادوێت. بۆچوون و تێگەیشتنی نارەسەنانەی بوونی نارەسەن بۆ واتای کات و ڕەوتە دینامیکیەی بوونی مرۆڤ دەگۆڕێت. لەشێوازی بوونی نارەسەنانەدا تایبەتمەندێتی بوونی تاکەکان گوم دەبێت و لەمردنی ئەم بوونانەشدا گۆڕستانێکی پڕگۆڕی بێ ناوونیشان دادەمەزرێت. مردنی تاکێک لە(ئەوان)، وەکو مردنی هەموو تاکێکی دیکە دەبێت



بەڕووداوێکی ئاسایی ڕۆژانە. هەمووتاکێکیش بەپێ ی نەریتی بازاڕی و باو دەنێژرێت و لەبیردەچێتەوە. بەڵگەی فینۆمینۆلۆجیانە، کەلێرەدا ئاماژەم بۆ کردووە، وابەستە بە ئەزموونی ڕۆژانەمان لەئاستی مردنی کەسانی دیکەدا. ڕۆژانە هەواڵی مردنی کەسانی نزیک و دەوروبەرم بەمن دەگات، یان لەبەرچاوی من دەمرن. مردنەکەشیان کۆتاییەکی بنبڕی ئەو بوونەیە و ناگەڕێتەوە. مردنی تاکێک ماڵئاواییەکی کاتی نیە. کەسانی دیکەش، وەکو من بوونێکی ئاگامەندن و مرۆڤن. لەم لێکچوونەوە (Analogy) دەگەمە ئەو باوەڕەی، کە مرۆڤ دەمرێت و کۆتایی بەبوونی دێت. هەرچەندە من هێشتا زیندووم، بەڵام دڵنیام لەوەی، کە مادامەکی منیش هەم ئەوا دەبێت بمرم. من لێرەدا بەڵگە فینۆمینۆلۆجیەکەم خزانۆتە نێو سیلۆجیزمێکی (Syllogism) لۆجیکمەندانەوە، کە بەرێگەی دووپێگەوە، یەکێکیان هەمەکی و ئەوی دی هەندەکی، بەئاکامێکی دروست گەیشتوم.[٩٣] ئەم بەڵگە فینۆمینۆلۆجیە، لەبەرئەوەی لە دەرەوەدا دەڕوانێتە مردن لەوانەیە ئەوڕەخنەیەمان

[93] ئەم جۆرە سیلۆجیزمە لەلۆجیکی ئەریستۆدا دوو پێگەو ئاکامێکی هەیە. پێگەیەکیان هەمیشە دەستەواژەیەکی هەمەکییە، چونکە بەگوێرەی یاسای لۆجیکی ئەریستۆ ناکرێت ئاکامێکی دروست لە دوو دەستەواژەی هەندەکی دەربهێنرێت. باشترین نموونەی ئەم جۆرە سیلۆجیزمەش ئەمەیە: هەموو(ئەلف) ە کان (ب) ێن. (ج) یمیش (ئەلف) ە. کەوابوو، (ج) یمیش (ب) ێیە. بڕوانە:

Aristotle. “Prior Analaytics” in *Complete Works of Aristotle*, vol. 1, p. 41

بێتەپێش، کە گوایە ڕوانینێکی دەرەکی بۆ مردن ناڕەسەنانەیەو ئەوە ناگەیەنێت، کە دازاین توانیویەتی ڕەسەنانەو لەناوەوە لەو ئەزموونە تێبگات. ئەم ڕەخنەیە تاکو ڕادەیەک دروستەو هایدیگەریش لە شیکردنەوەکەیدا بۆ مردن لەلای دازاینی ناڕەسەن ئاماژەی بۆکردووە. تێگەیشتن لەڕاستی لەدەرەوەی یان لەناوەوەی ئەو ڕاستیەدا دوو ڕێگەن جیاوازی بنەڕەتییان لەنێواندا هەیە. دازاین، ئەگەر لەشێوازێکی بوونی ڕەسەندابێت لە دەرەوەی ڕاستی ناژی و (لە نێو ڕاستیدا) یە.[94]

ڕاستی و ڕاستی ناسین خەسڵەتێکی بوونی ڕەسەنانەیە. دازاین، تاکە بوونێکە بەدوای ڕاستیدا دەگەڕێت و دەیدۆزێتەوە. بەبێ گەڕانی دازاین بەدوای ڕاستیدا، ڕاستی لەخۆیەوە خۆی دەرناخات. خۆدەرخستنی ڕاستی بوون لەهیچ فۆرمێکدابێت بۆ دازایینە و دازاینیش بوونە لەنێو ڕاستیەکەدا. بوونی دازاین لەنێو ڕاستیدا و خۆدەرخستنی ڕاستی بۆ دازاین دوو لایەنی لەیەکدی دانەبڕاون و هەردووکییان سەربە داکەوتی بوونن. دازاین لەنێو ڕاستیدا

[94] Martin Heidegger. *Being and Time*, p. 300

هەروەها بڕوانە:

Rodolphe Gasche. "Tuned to Accord: On Heidegger's Concept of Trurh", in *Heidegger Toward the Turn*, (ed.) James Risser, New York: State University of New York Press. 1999. P. 47



دەستەڵاتی دۆزینەوەو زانینی ڕاستی بە دازاین دەدات و ئەم بوونە دەکات بە خاوەنی ڕاستی و دەیگەیەنێتە دڵنیایی.

> لەبنەڕەتەوە دازاین لەنێو ڕاستیدایە ؟ دڵنیاییش لەسەرزەمینەی ڕاستی دادەمەزرێت. وشەی "دڵنیایی"، وەکو "ڕاستی" دوو واتای هەیە. لەڕاستیدا دازاین ڕوولە دەرخستنی ڕاستیەکەدەکات و ڕاستیەکەش خۆی بۆ دازاین دەردەخات. بەهەمان شێوەش، لە دڵنیاییدا دازاین دڵنیادەبێت و دڵنیابووکەشی سەبارەت بەشتێکە، کە لێ ی دڵنیادەبێت.[95]

ئەگەر دازاین لەنێو ڕاستیدا بژی و پەیوەندییەکی دەرەکی بەڕاستیەوە نەبێت دڵنیابوونەکەشی لەو ڕاستیە ڕەسەنانەیە. بوونێکی ڕەسەن، ئەگەر ویستی ڕوانینێکی فینۆمینۆلۆجیانەشی بۆ مردن هەبێت، ئەوا ڕوانینە باوەڕو دڵنیابوونی داگیرناکات و ڕەسەنانە دەڕوانێتە مردن و بەڕاستیەکی بوونی خۆی دادەنێت، کە تیایدا دەژی. بەپێچەوانەی ئەمەشەوە (دڵنیایی) لەڕاستی مردن لەنێو بوونە ناڕەسەنەکاندا لەدەرەوەی بوونیاندا پەیدابووە. بوونێکی ناڕەسەن خاوەنی راستی و دڵنیایی خۆی نیە. هەموو ڕاستی و بەهایەکی لەدەرەوەیداو(ئەوان) پێکیانهێناوە، لەم ڕوانگەیەوە بوونێکی ناڕەسەن دڵنیایە

[95] هەمان سەرچاوە.

لەوەی دەمرێت، چونکە(ئەوان) دەڵێن هەموو تاکێک دەمرێت. ئەو ئەزانێت ڕاستی مردن هەیە. چونکە(ئەوان) باوەڕیان بەو ڕاستیە هەیە. بەم شێوەیە بوونی ناڕەسەن لەنێو سترەکچەرە فینۆمینۆلۆجیەکەیدا بۆ ناسینی ڕاستی بۆ سەنتەر و سەرچاوەیەکی ژوور ئەو سترەکچەرە دەگەڕێتەوە. داوا لەو سەرچاوەیە دەکات(ڕاستی) پێبناسێنێت. ئەو سەرچاوەیەش دەستەڵاتێکی (نەناسراو)[96] و داگیرکەرانەی (ئەوان) ە. ڕاستی مردن، وەکو هەواڵەکانی نێو ڕۆژنامەکان و دەنگ وباسی ڕۆژانەی سەرتەلەفزیۆن و ویستگەی ڕادیۆکان هەموو کەسێک دەیزانێت و باوە. هەموو کەسێکیش لە(ئەوان) دەتوانێت باسیبکات.

لێرەدا دەمەوێت لەچەند خاڵێکدا توێژینەوە بوونگەرایەتیەکەی هایدیگەر لەسەرمردن لەچەندخاڵێکدا کۆبکەمەوە. یەکەم، بوونی مرۆڤ ڕەوتێکی دینامیکیە بەرەو کۆتایی و لەبنەڕەتەوە یان لەسەرەتاوە ئەم بوونە بەوکۆتاییەوە پەیدابووە. دووەم گەیشتن بەوکۆتاییە بوونی مرۆڤ پڕوتەواو دەکات و لەهەمموو پڕۆژەکانی داهاتووی ڕووتدەکاتەوە. چیەتی مرۆڤیش بەگەیشتن بەم کۆتاییە پێناسدەکرێت. سێیەم، کۆتایهێنان بە بوونی مرۆڤ هەمیشەیی یەو گەڕانەوەی نیە. چوارەم لەگەڵ گەیشتن بەکۆتایی مرۆڤ هیچ پەیوەندییەکی بەجیهان و کەسانی

96 مەبەستم لە(نەناسراو) ی ئەم دەستەڵاتەی سەنتەری سترەکچەرەکە ئەوەیە، کە دەستەڵاتی تاکەکەسێکی ناسراو نیە.



دیکەوە نامێنێت و خۆی بەتەنیا دەبێت بەخاوەنی ئەو ئەزموونە .

پێنجەم مرۆڤ لەڕاستی(بوونی- بەرەو-کۆتایی) دڵنیایە. مردن کێشەیەکی گرنگە لەژیانی مرۆڤدا و لە ڕووە ئۆنتۆلۆجیەکەشەوە لایەنی (نەبوون) ی ئەم بوونەیە. بونیادی ئۆنتۆلۆجی مرۆڤ لە فەلسەفەی بوونگەرایەتییدا جیاوازییەکی بنەڕەتی لەنێوان مردنی ئەم بوونە و هەبووە زیندووەکانی دیکە دیاریدەکات. هەروەها، واتای مردنی مرۆڤیش لەشێوازی بوونی ڕەسەنەوە بۆ ناڕەسەن دەگۆڕێت. گرنگی مردن بۆ مرۆڤ یەکێکە لەو هۆکارانەی هایدیگەر و بیریارانی دیکەی بوونگەرایەتی نەتوانن ئاوەڕی لێنەدەنەوە و لەواتاکەی نەکۆڵنەوە. لەم هۆکارەش گرنگتر ئەوەیە، کە بەدیدی هایدیگەر، بوون- بەرەو- کۆتایی و ئاگابوون لەمردن بوونێکی ناڕەسەن و نامۆ بۆ تایبەتمەندی و جیاوازییەکانی بوونی خۆی دەگەڕێنێتەوە. یارمەتی ئەوبوونەدەدات خۆی وەکو تاکێکی جیاواز دابنێت. سەرهەڵدانی جیاوازییەکان لە دامەزراندنی بوونی ڕەسەنانەدا پێویستە. لەگەڵ هەستکردن بە ڕەسەنیەت و ناسینەوەی جیاوازییەکان و تایبەتمەندی بوون، تاکی ناڕەسەن و نامۆ هەوڵدەدات ڕەسەنانە بژی. هەوڵدانەکەی پرۆسەیەکی ئاگامەندی ئاڵۆزو مێژووییە. پرۆسەیەکە بەبێ بەرەنگاری و ڕووبەڕوو بوونەوە سەرهەڵنادات.

بوونی ڕەسەن بەرەنگارییە *Polemos* جەنگێکی بەردەوامە

له پێناوی مانەوەی ئەو شێوازەی بوون و گەیشتن بەو ناوەڕۆکەی بوونە ڕەسەنەکە دەیەوێت بیگاتێ. دازاین هەمیشە لەنێو بەرەنگاریدایەو جەنگاوەرە.[97] تەنانەت هایدیگەر لەکۆڕەکانیدا لەسەر هیراکلایدس بایەخێکی زۆری بەزاراوەی(بەرەنگاری)،(جەنگ)، *Polemos* داوەو واتاکەی ڕوونکردۆتەوە.[98] بوونی ڕەسەن لە دامەزراندنی پرۆژەکانی بوونیدا، لەناسین و دۆزینەوەی ڕاستیدا یان بەگشتی و لەسەر زەمینە فەلسەفیە بوونگەرایەتیەکەدا دەتوانین بڵێین، کە بوون لەنێو جیهاندا و لەگەڵ کەسانی دیکەدا ڕووبەڕووبوونەوەیە بۆ سەقامگیرکردنی ڕەسەنیەتی بوون و هەڵبژاردنی ئەو بوونە. لەبەرئەوەی بوون لەگەڵ کەسانی دیکەدا و لەژیانی ڕۆژانەدا لەنێو سترەکچەرێکی کۆمەڵایەتی دەخزێنرێ و زانین و بەهاوڕاستیە باوەکانی بەسەردا دەسەپێنرێت، ئەوا ڕووبەڕووبوونەوەکە دەکەوێتە نیو زۆرزنبازی لەنێوان دازاین و(ئەوان) دا. (ئەوان) دەستەڵاتی خۆیان بۆ فەرزکردنی باوەڕی خۆیان بەسەر دازایندا بەکاردەهێنن. دەیانەوێت دازاین بکەن بەو بوونەی(ئەوان) مەبەستیانە. دازاینیش هەوڵدەدات ڕەسەن بێت و خۆی پرۆژەکانی بوونی هەڵبژێرێت. من لێرەدا

[97] Gregory Fried. *Heidegger's Polemos*, New Haven: Yale University Press, 2000. Pp. 43- 47

[98] زاراوەی *Polemos* یۆنانیە و واتای جەنگ، بەرەنگاری، ڕووبەڕووبوونەوە، شەڕەنگێزوەستان، دژوەستان، پەلاماردان ، دەبەخشێت.



نامەوێت تەفسیرێکی ڕامیاری بۆ فەلسەفەی هایدیگەر بکەم و لە کاڵایەکی ڕادیکاڵدا بیرازێنمەوە. هەڵوێستی(پۆلێمیک) ی یان ڕووبەڕوو بوونەوەی دازاین دیاردەیەکی ڕیالیستانەی مێژووە. دازاین لەنێو مێژوودا بۆ سەقامگیرکردنی بوونی ڕەسەنی خۆی ڕووبەڕووی کۆمەڵێک کۆسپ و گرفت لە لایەن (ئەوان) ەوە دەبێت. (ئەوان)، کە خاوەنی سترەکچەرە دامەزرێنراوەکەن و سەرهەڵدانی جیاوازییەکان بەکارەسات و هەڕەشەکەردادەنێن. ڕێگە بە دازاین نادەن ڕەسەنانە بژی. بۆ ئەوان بەهێزکردنی بناخەی سترەکچەرەکە و بەردەوام بوون بەو کەلتووره بازاڕییە و دەستەڵاتەکە یان بەستراوە بە ناڕەسەنکردن و نامۆکردنی تاکەکانی کۆمەڵەوە. چەند تاکەکان نامۆ بکرێن و یەک ناسنامەی نەگۆڕیان بەسەردا بچەسپێت ئەوەندەش کەلتووره بازاڕی و باوەکەی نێو سترەکچەرەکە بەهێزتر دەبێت.

لەگەڵ هەڵبژاردنی بوونی ڕەسەنانەدا دازاین (خۆ) ی ئەدۆزێتەوە. لە شێوازی وونبونەوە بۆ خۆ دۆزینەوە دەڕوات. ئەمەش ئەو واتایە نابەخشێت، کە دازاینە ناڕەسەنەکانی نێو کەلتووره باوەکەی (ئەوان) خاوەنی (خۆ) نیە. خۆی ناڕەسەن(ئەوان) دایانمەزراندووەو بڕیاریان لەسەرداوە. (خۆ) یەک نیە دازاین دایهێنابێت.[99] (خۆ) یەکە لە دەرەوەی ئەوبوونەدا بەو بوونەوە چەسپاوە و ناگۆڕێت. ئەگەر دازاین هەوڵی گۆڕانی(خۆ) نەگۆڕ و هەمەکییەکەی بدات ڕووبەڕووی

[99] Martin Heidegger. *Being and Time*, p. 313

دەستەڵاتی (ئەوان) دەبێتەوە و بەرەنگارییان دەکات. (ئەوان) یش لە سزادانی ئەم جۆرە سەرکێشی و یاخیبوونەدا درێغی ناکەن. بێبەزەییانە دژی ڕادەوەستن و بە (ڕیزپەڕ) ناوزەدی دەکەن.

ڕەتدانەوەی (خۆ) یە دامەزرێنراوەکەی نێو سترەکچەرە دەرەکییەکە لەلایەن تاکێکەوە بەرێگەی ئاگاهاتنەوە یان هەستکردنە بە(بوون) ی ئەو تاکە و جیاوازی و تایبەتمەندێتی خۆی. ئاگاییەکەش بانگەوازێکی (*Ruf*) و یژدانیە، کەداوالە تاکەکە دەکات بەرەو بوونی ڕەسەنی خۆی بگەڕێتەوە. بانگەوازەکە لە ئاکامی ئاگابوونەوەکە لە شێوازی نارەسەنانەی بوون، تاکەکە توشی هەستکردن بە تاوانباری(*Schuld*) دەکات.[١٠٠] لێرەدا دووکێشە هەن پێویستە زیاتر واتاکانیان شیبکەینەوە: بانگەوازەکە و هەستکردن بەتاوان. بانگەوازەکە دەنگی ناوەوەی دازاینە، کە هایدیگەر بە (ویژدان) ی دادەنێت. لەم بانگەوازەدا جیاوازی لەنێوان (بانگکەر) و (بیسەر) دانیە و هەردووکیان یەک کەسن. دازاین لەم بانگەوازەی ویژداندا خۆی بەرەو خۆی بانگدەکاتەوە. ئاگاداری دەکات، کە شێوازی بوونی نالەبارەو خۆی ونکردووە و پێویستە ڕوولە خۆ دۆزینەوە بکات. پەلکێشکردنی دازاین لە ونبونەوەو لەنێو کەلتووری بازاڕی (ئەوان) دا بەرەو ڕەسەنی و ناسینەوەی تایبەتمەندی خۆی لە بانگەوازی ویژدانەوە سەرهەڵدەدات.

---

[100] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٣١٤



هایدیگەر (ویژدان)، وەکو مەزاج و تێگەیشتن بەپێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی بۆ مرۆڤ دادەنێت. بەڵام بۆچی بانگەوازە ویژدانیەکە دازاین توشی ئازاری ویژدانی و هەست بەتاوانکردن دەکات؟ پێش وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە حەزدەکەم ئەوخاڵە بخەمەڕوو، کە(هەست بە تاوانکردن) سەرچاوەو واتایەکی ئایینی نیە. لەبیروباوەڕی ئاینییدا مرۆڤ لەلادان لەفەرمانەکانی خوا لەئاستی خوادا هەست بە تاوان و پەشیمانی دەکات. ئەم هەستکردنە لەئاکامی(ترس) ەوە پەیدا دەبێت چونکە کەسێکی خواناس لەدەستەڵاتی خوا دەترسێت و سزادانی بێبڕواو لادەرو گوناهکەرەکانیش لەئایینەکاندا بۆ خەفەکردنی دەستەڵاتی تاکەکان بنەڕەتییە. ئەگەر(ترس) لەنێو ئاییندا نەبێت، تاکێکی بڕواکەر توشی هەستکردن بەتاوانباری و پەشیمانی لەئاستی دەستەڵاتی خوادا نابێت. توێژینەوە بوونگەرایەتیەکە بۆ (هەست بەتاوانکردن) لەسەرچاوەی ترس و ڕاوەستان لەئاستی دەستەڵاتی خواوە سەریهەڵنەداوە. هەستکردنێکە لەئاکامی (فرێدان) ی دازاین بۆ ناو سترەکچەرو کەلتووری بازاڕی (ئەوان) ەوە بەرجەستە دەبێت.

دازاین پاش فرێدانی بۆ ئێرە، لەشێوازی بوونی خۆی بەئاگا دەبێتەوە و دەزانێت(ئەوان) بوونی ئەویان داگیرکردووە و شێوازێکی نارەسەنانەیان بەسەردا سەپاندووە. ڕێگەیان نەداوە سەربەستانە پڕۆژەو بەهاکانی هەڵبژێرێت و بڕیاریان لەسەربدات. ئەو بووەبە (وەرگیراو) ی ئەوان و

جیاوازی و تایبەتمەندێتی یەکانی سڕاوەنەتەوە. بەکورتیەکەی، ئەو بووەبە (بوون-بۆ-ئەوان) نەک (بوون-بۆ-خۆی) ، کە خەسڵەتی کەلوپەل و شتە هەبووەکان وەردەگرێت و کاڵای بوون بە مرۆڤی لەبەر دادەکەنرێت. هەست بەتاوانکردنی بوونگەرانە لەگەڵ ناسینەوەی بوونی ڕەسەن و قێزکردنەوە لە داگیرکردن و ناڕەسەنی و نامۆییدا سەرهەڵدەدات و دەبێت بە هاندەرێک بۆ گەڕانەوە بەرەو ڕەسەنی. بوونخوازێک لە ترسا پەشیمان نیە و هەست بەتاوانباری ناکات. پەشیمانی و تاوانەکەی لەوەدایە، کە نەیتوانیوە ڕەسەنانە هەڵوێست وەرگرێت و پرۆژەکانی هەڵبژێرێت. نەیتوانیوە بەو شێوەیەی خۆی دەیەوێت بژی. بوونی داگیرکراوە و ناوەڕۆک و(خۆ) یەکی ساختە بەسەریا سەپێنراوە، کە خۆی خاوەنی ئەو ناوەڕۆکە نیە، چونکە داینەهێناوە. دزاین لە بەرڕۆشنایی بانگەوازی ویژدانەوە خۆی بۆ(بڕیاردان) ئامادەدەکات. لەگەڵ بڕیاردانەکەدا (resoluteness) گۆڕانکارییە بنەڕەتیەکان بەسەر بوونیدا دێت و ڕووبەڕووی (ئەوان) دەبێتەوە. بڕیاردانەکەی پرۆژەیەکی شۆڕشگێڕانە و ڕادیکاڵە لە پێناوی گەڕانەوە بەرەو شێوازە ڕەسەنەکە، کەلەم خاڵانەدا کۆدەبێتەوە:

**یەکەم**، ڕەتدانەوە و ڕەتکردنی کەلتووری بازاڕی و باو.
**دووەم**، هەڵوەشاندنەوەی(خۆ) ی بەسەردا سەپێنراو لەلایەن (ئەوان) ەوە.
**سێیەم**، هەڵوەشاندنەوەی بەهابەسەرداسەپێنراوەکان.
**چوارەم**، دامەزراندنی(خۆ) یەکی نوێ لەسەربناخەی



بوونێکی ڕەسەن، کە لەئاکامی بڕیاردان بەسەرپرۆژە نوێکاندا پەیدادەبێت.
**پێنجەم**، ناسینەوەی جیاوازییەکان و تایبەتمەندی بوون.
**شەشەم**، گەڕانەوەی دەستەڵاتی داهێنان بۆ خۆ.

پرۆژەی گەڕانەوە بەرەو بوونی ڕەسەن لەم شەش خاڵەدا کۆبۆتەوە. ئەم خاڵانەش پەیوەندییەکی پێویست و بنەڕەتییان لەگەڵ یەکدا هەیە. لەهەموویان گرنگتر خاڵی شەشەمییانە. دەتوانم بڵێم، کە واتای هەموویان لەنێو خاڵی شەشەمدا بەڕووناکی دەردەکەوێت و ئاشکرا دەبێت. بوونی ڕەسەن داهێنەرو خاوەنی دەستەڵاتی داهێنانە. بوونی ناڕەسەنیش ئەم دەستەڵاتەی بە(ئەوان) دۆڕاندووەو ناتوانێت داهێنەرانە بژی. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت (ئەوان) داهێنەرو ڕەسەنن. ئەوانیش ناڕەسەنانە دەژین، چونکە خۆیان لەنێو سترەکچەرێکدا گیرکردووەو بۆ هەموو زانین و بەهاو ڕاستیەک بۆ چەق یان سەنتەری سترەکچەرەکە دەگەڕێنەوە. هەمووشتێک لەنێو سترەکچەرەکەدا دەبینرێت و هەڵدەسەنگێنرت، بەڵام سەنتەرەکە لەژوور هەموو هەڵسەنگاندنێکەوە دادەنرێت. بۆ ئەوەی دازاین ڕەسەنانە بژی و ببێت بەخاوەنی دەستەڵاتی داهێنان و سەرچاوەی زانین و بەهاو ڕاستیەکان لەڕووبەڕووبوونەوەکەیدا سەنتەرەکە ڕەتدەداتەوە. بەبێ ڕەتدانەوەی سەنتەرە بەرزو هەمەکییەکە دازاین ناتوانێت ڕەسەنانە بڕیار لەسەر دامەزراندنی پرۆژەکانی بوونی بدات. ڕۆڵی ئۆنتۆلۆجیانەی بانگەوازی ویژدانی لێرەدا لەگەڵ ڕەتدانەوەی سەنتەر و

هەوڵدان بۆ گەڕانەوەی دەستەڵاتی داهێنان بۆدازاین واتایەکی فەلسەفی دەبەخشێت.

تەوانای(بیستن) لەبوونی نارِەسەندا وابەستە بە بانگەوازی (ئەوان) ەوە، نەک دەنگی ناوەوەی ویژدانی. ئەو تەنیا دەنگی (ئەوان) دەبیسێت و گوێ ی لە دەنگی خۆی نیە. بانگەوازای ئەوان بەپێچەوانەی بانگەوازی ویژدانییەوە، بەرەو نامۆیی و خۆ- وونکردن دەیبات. کاتێکیش بانگەوازی ویژدانی دەبیستێت گوێ ی لە دەنگی خۆی دەبێت و ئەم دەنگەش بەسەر دەنگی(ئەوان) دا زاڵ دەبێت،

وونبون لە نێو(ئەوان) و گوتە لەکارکەوتووەکانیان { Idle Talk }،
نایە لێت دازاین دەنگی خۆی ببیسێت { *uberhort*} وگوێ ی لەوانە.
بۆ ئەوەی دازاین جارێکی دیکە بتوانێت گوێ ی لەدەنگی خۆی بێت،
دەبێت خۆی بدۆزێتەوە. ئەوە بزانێ ، کە نەیتوانیوە دەنگی خۆی ببیسێت و تەنیا (ئەوان) ی بیستوە.[١٠١]

لێرەدا دووجۆر(بیستن) دەردەکەوێت. جۆری یەکەمیان بیستنی دەنگێکی دەرەکییە و دووەمیان ناوەکی. بۆ بیستنی دەنگەکەی ناوەوە دەبێت بیستنی یەکەم ڕەتبدرێتەوە. تاکو

[101] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٣١٥



ئەو کاتەی دازاین گوێڕایەڵ و مل کەچی ئەوانە و بوونێکی نارەسەن و داگیرکراوی دەبێت، گوێ ی لەدەنگی خۆی نابێت. بێجگەلەم جیاوازییە چەند جیاوازییەکی دیکەش لەنێوان ئەم دووجۆر بیستنەدا دەبینرێن. بانگەوازی ئەوان و بیستنی بانگەوازەکەیان دازاین بەرەو هەبوویەکی دیاریکراو پەلکێشدەکات. دەیەوێت بوونی بکات بە شتێکی هەبوو، کە ئەوان دەیانەوێت. بانگەوازی ویژدانی و بیستنی دەنگی ناوەوە دازاین بەرەو(هەبوو) یان شتێکی چەقیو و نەگۆڕ ڕانامالێت و بەڵکو بەرەو(هیچ) ی دەبات. ئەم(هیچ) ە ش تەوانایی دازاینە لەبوونیدا، کەئەم بوونە بەناتەواو ودینامیک دادەنیت. داواکارییەکەی بانگەوازی ویژدانی بەم شێوەیە لێپرسینەوەیەکی گەورەیە، چونکە ئەم بوونە لەبەردەم(هیچ) دا ڕادەگرێت. ئەو هیچە و دەبێت لەو هیچەوە هەوڵ بدات ببێت بەو بوونەی خۆی دەیەوێت. جیاوازییەکی دیکەی نیوان دووبانگەوازەکە لەوێدایە، کە دووەمیان (بانگەوازی ویژدانی) بە (زمان) دا دەرنابڕێت و دەنگێکە بەبێ(وشە). ئەوەی دازاین لە بانگەوازی ویژدانیدا بانگدەکات، دازاین خۆیەتی. لەم بانگەوازادا لەناوەوە بێ بەکارهێنانی زمان و دەربڕین داوا لە دازاین دەکرێت خۆی بناسێتەوە و جارێکی دیکە ڕوولە بوونی خۆی بکات.[١٠٢]

ژیانی مرۆڤ جە نگێکی بەردەوامە بۆ سەقامگیرکردن و بە

[102] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٣١٨

ردەوامی بە بوونێکی ڕەسەنانە. ڕووبەڕوو بوونەوەیە بەرانبەر هەموو دەستەڵات و لایەنێکی داگیرکەر، کە دەیەوێت بوونە ڕەسەنەکە لەناوبەرێت. ڕەسەنیەتی بوونیش خەسڵەتێکی ئۆنتۆلۆجی هەیە و بەستراوە بە بونیادی ئۆنتۆلۆجی مرۆڤەوە. بوونی ناڕەسەنانە لەسەرئەم بونیادە دانەمەزراوە و فینۆمینۆلۆجیانەیە. لەبەرئەمەشە هایدیگەر گەیشتۆتە ئەو باوەڕەی، کە(ویژدان) نیش پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی مرۆڤە. لەبەرئەوەی مرۆڤ لەنێو کۆمەڵدا یان لەگەڵ کەسانی دیکەدا دەژی ناچاردەکرێت ناڕەسەن بێت، بەڵام جیاوازی و تایبەتمەندی بوونی بناخەیەکی ئۆنتۆلۆجی هەیە و لە بناخە فینۆمینۆلۆجیەکە بەهێزترە بۆیە دەبێت ویژدانیش سەربەو بناخە ئۆنتۆلۆجیە بێت.

مرۆڤ لەسەر سەربەستی و بوونی ڕەسەنی خۆی سورە و کۆڵنەدەرە. دەستەڵاتی داهێنان لەبوونی ڕەسەندا ڕووداوەکانی مێژوو پێکدەهێنێت. مەبەست لە( مێژوو) بەتایبەتی پاش بەستنەوەی بەدەستەڵاتی داهێنانی بوونی ڕەسەنەوە، نوسینەوەی داستانی(ڕابردوو) نیە، کەبە مێژوونووسین Historiography ناسراوە. مێژوو، لەم بۆچوونەدا،(Historicity ) یەو دەستەڵاتی داهێنانی دازاین دەیهێنێتەکایەوە. بوونی دینامیکی دازاین و ڕەوتەبەردەوامەکەی بەرەو داهاتوو لەمێژوودا بەرەو کێشەی(کات) مان دەبات. توێژینەوەکەمان لەسەر بوونی(دازاین) ڕاستەوخۆ بەکێشەی(کات) ەوە گرێمان



دەدات. تێگەیشتنمان لە مرۆڤ، وەکو بوونێکی دینامیکی و ناتەواو ئاماژەکردنە بۆ بوونی کاتیی مرۆڤ. هایدیگەر بێجگە لە نێو(بوون و کات) دا دووبەرهەمی دیکەشی بۆ توێژینەوە لەسەر(کات) تەرخان کردووە. یەکەمیان *The Concept of Time* لەساڵی ١٩٢٤ نوسیوێتی هەروەها چەند وانەیەکیشی لە ساڵی ١٩٢٥ بەناوی *History of the Concept of Time* گوتەوە، کە لەدواییدا لەچاپدران. ئەوەی لێرەدا گرنگە و بۆچوونی هایدیگەر ئاشکرادەکات توێژینەوە ئۆنتۆلۆجیەکەی ئەم بیریارە بۆ کات و لەدواجاریشدا دانانی(بوون) ە بە(کات). بۆ هایدیگەر گەورەترین پرسیاری فەلسەفی سەبارەت بە واتای(بوون) ە. (بوون) بەگشتی بنەڕەتی هەموو شتێکە.

وەڵامی ئەم پرسیارە گەورەترینەش ئۆنتۆلۆجیەکمان بۆ دادەمەزرێنێت، کە هەیدیگەر بە(ئۆنتۆلۆجی بنەڕەتی) ناوزەدیدەکات. ئەگەر بوون بنەڕەتی هەموو شتێک بێت، ئەوا ئۆنتۆلۆجیەکەشی بنەرەتی هەموو جۆرە زانینێکە، کە بەزانینی ئێمە سەبارەت سروشت و میژوو دادەنرێت. زانینە سروشتیەکانمان (زانستە سروشتیەکان) و زانینی مێژووش (زانستە کۆمەڵایەتیەکان) پێکدەهێنن. ئەم دوو بوارەی زانینیش لە زمانی فەلسەفی هایدیگەردا بە (ئۆنتۆلۆجی ناوچەگەری) دادەنرێن و هەریەکێک لەمانە لە ناوچەیەکی یان لایەنێکی بوون دەکۆڵنەوە. (بوون) بەم شێوەیە، پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی و لۆجیکی و بنەڕەتی سروشت و مێژووە. ئۆنتۆلۆجی بنەڕەتیش دەبێت بە پێشمەرجێکی

پێویست بۆ ئۆنتۆلۆجیە ناوچەگەرییەکان. گەڕان بەدوای پێشمەرجی پێویست بۆ ئۆنتۆلۆجیە ناوجەگەرییەکان تاکو ڕادەیەک هەڵوێستێکی (کانت) بیە. کانت لە فەلسەفە ڕەخنەکاربیرکەیدا هەوڵی دۆزینەوەی کۆمەڵێ پێشمەرجی پێویستی بۆ زانین و ڕەوشت و بەهای جوانی داوە. لە هەموویان گرنگتر بۆ توێژینەوەکەمان، دامەزراندنی (کات) و (شوێن) ە، وەکو دوو پێشمەرجی پێویست بۆ ڕوودانی ئەزموونە هەستەکییەکان وپەیداکردنی زانینی هەستەکی. هایدیگەریش، بەهەمان شێوە، ئۆنتۆلۆجی بنەڕەتی بە پێشمەرجێکی پێویست بۆ هەموو زانینەکانی مرۆڤ لەبارەی سروشت و مێژووەوە دادەنێت. تەنانەت زاراوەی پێشمەرجی پێویست Apriori necessary condition (کانت) بیە. ئایا دۆزینەوەی ئەم پێشمەرجە پێویستە چی پەیوەندییەکی بە کێشەی (کات) ەوە هەیە؟ لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەدا، من لە دوولاوە دامەزراندنی پێشمەرجە ئۆنتۆلۆجیە بنەڕەتیەکە (سیستەمی ئۆنتۆلۆجی بنەڕەتی) بە (کات) ەوە دەبەستمەوە. یەکەم، لە پێشتر ئەو خاڵەم باسکرد، کە (بوون) کاتە. لەبەرئەمەشە هایدیگەر ناوی شاکارەفەلسەفیەکەی بە (بوون و کات) داناوە. توێژینەوە لەسەر (بوون) هاوکات، لەسە ر(کات) یشە. دووەم، ئۆنتۆلۆجی بنەڕەتی لەئاکامی پرسیاکردنی دازاین سەبارەت بەواتای بوون دامەزراوە. (پرسیار) کردن خەسڵەتێکی مرۆڤانەیە و ئەو کەناڵەیە مرۆڤ تێیداو لەوێوە ڕاستیەکان دەدۆزێتەوە و دەیەوێت بە داهاتوو بگات. پرسیارکردن هێزێکە مرۆڤ بەرەوداهاتوو دەبات و



ڕێگەنادات لەنێو سترەکچەرە چەقوەستاوەکاندا بمێنێتەوە. ئەمەش تەوژمێکی ژوورکێش لە بوونی مرۆڤدا دەردەخات، کە هایدیگەر بە ecstatic و transcendence ناوزەدیاندەکات .[١٠٣] مەبەست لە ecstatic، کە واتای (لەدەروەستان) یان (لەخۆ-دەرچوون) دەبەخشێت پەیوەندییەکی واتایی لەگەڵ وشەی دووەمدا (بەرزی) Transcendence هەیە. مرۆڤ لە ڕووبەڕوو بوونەوەی ژیانیدا بەرانبەر بوون لەناو خۆیدا ناوەستێت و دەردەچێت. ئەو دەیەوێت بگاتە سنوورەکانی ئەو دیوخۆی و بەو ڕاستیە دوورانە بگات، کەهێشتا نەیناسیون. مرۆڤ لەم ڕووبەڕوو بوونەوە و لەدەروەستانەدا، بە گەیشتن بەڕاستیە نەناسراوەکان پێشدەکەوێت و دەبێت بەو بوونەی خۆی دەیەوێت. بەرزێتی واتایەکی مێتافیزیکی ئەفلاتونی نیە. ڕاستیە نەناسراوەکانیش فۆرمە بەرزەکانی جیهانی بەرزی ئەفلاتونی نین. ئەو ڕاستیانەن هێشتا مرۆڤ ڕۆشنایی زانینی نەخستۆتە سەریان و لەداهاتوودا دەیاندۆزێتەوە. بەدیدی هایدگەر دامەزراندنی پرۆژەکانی بوون و ناسینی ڕاستیەکانی بوون بەرزێتییە، چونکە مرۆڤ بۆ دامەزراندنی پرۆژەکانی (ئێستا) بەجێدەهێڵێت و خۆی بە داهاتوو دەگەیەنێت. لەبەرئەمە هایدیگەر بوونی مرۆڤ و کات لەیەکدی جیاناکاتەوە و لەو باوەڕەشدایە لەبەستێنی تێگەیشتنمان لە بوونی مرۆڤ لە واتای (کات) یش دەگەین)

---

103 هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٣٨٧- ٣٨٦، هەروەها لاپەڕە ٤٨٨

، چونکە ئەم کاتییە.[١٠] جیاوازییەکانی نێوان (کات) ی بوونی مرۆڤ *Zeitlichkeit* و کاتی هەبووەکان(کاتی فیزیکی) لەسێ خاڵدا کۆدەبنەوە. یەکەم، لەبەر ئەوەی مرۆڤ ئاگامەندە، بەئاگاییەوە ڕوولەداهاتوو دەکات و خۆی بەو داهاتووە دەگەیەنێت. هەبووەکان لەم تەوژمەیان ڕووبەڕووبوونەوە ئاگامەندانەیە بێبەشن. نەمانی درەختێک، بێ ئاگابوون لە پرۆسەی گەشەکردن و لەناوچوون، گەورەدەبێت، بەردەگرێت، پیردەبێت و وشکدەکات. مرۆڤ، بە پێچەوانەوەی نەمامەکەوە، بەئاگاوە بەرەو دامەزراندنی پرۆژەکانی بوونی دەڕوات و بەرەو(کۆتایی) دەکەوێتەڕێ. دووەم، پرۆسەی گۆڕانکارییەکانی بوونی مرۆڤ، کە پرۆسەی کاتییە، ئەم بوونە بە بەردەوامی دەوڵەمەند و پڕ تردەکات. پرۆسەیەکە مرۆڤ لەهەژاریی بوونەوە بە دەوڵەمەندی دەگەیەنێت و کەلەبەری(نەبوون) بییەکانی پڕدەکاتەوە. لەگەڵ دامەزراندنی پرۆژەکانیدا لە داهاتوودا وگەیشتنی بەو داهاتووە، مرۆڤ بوونی خۆی تەواوتر دەکات. سێیەم کات لە

[104] هایدیگەر وشەی(*Zeit*) بەئەڵمانی و ( Time) بە ئینگلیزی بۆ کاتی دازاین بەکار ناهێنێت. بۆ جیاکردنەوەی(کات) ی دازاین و گرنگی ئەم (کات) ە وشەی(*Zeitlichkeit*) ی داناوە، کە لە زمانی کوردییدا زاراوەیەکی تایبەتیمان بۆ ئەم شێوە(کات) ە نیە. بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو، لاپەڕە، ٦٣، ٣٣٧ هەروەها:

Martin Heidegger. *History of the Concept of Time*, translated by Theodor Kisiel, Bloomigten: Indiana University Press, 1985. P. 319



بوونی مرۆڤدا بەردەوامییە و ساتەکانی پارچە ناکرێن. بەردەوامییەکە (ئێستا) ی تیایدا دەبێت بە (ڕابردوو)، (داهاتوو) شی بە (ئێستا). (ڕابردوو)، (ئێستا) و (داهاتوو) ی زنجیرەیەکی نەپچڕاون. ئەم سێ جیاوازییانەی نێوان کات لە بوونی مرۆڤ و کات بۆ سروشت (هەبووەکان) وابەستن بەو جیاوازییە بنەڕەتیەی نێوان سروشت و مێژوو یان ئۆنتۆلۆجیە ناوچەگەرییەکانی نێوان سروشت و مێژووە کە هایدیگەر بەپێچەوانەی شوێنکەوتوانی فەلسەفەی مارکسی و لۆجیکی پۆزەتیڤیزم، جیاوازی بنەڕەتی لە نێوانیاندا دەبینێت. زانستیە سروشتی و کۆمەڵایەتیەکان لەیەکدی جیادەکاتەوە و بوونی مرۆڤ لەژێر زەبری یاساکانی سروشتدا ناچارناکات.[١٠٥]

[105] بەوجۆرەی من لە هایدیگەر تێدەگەم، ئەم بیریارە بە دووشێوە جیاوازی نیوان سروشت و مێژوو دەردەخات، لەلایەکەوە جیاوازییەکە بە *Unterschied* {واتە: جیاوازی} دادەنێت و لەلایەکی دیکەوە بە *Differenz* {واتە: جیاوازی} ناوزەدیدەکات. زاراوەی یەکەمی بۆ شیکردنەوەی .بۆچوونەکانی بیریارەکانی دیکە(بۆنموونە کانت) لەسەرجیاوازی سروشت و مێژوو بەکار دەهێنێت. بەدیدی هایدیگەر ئەم بیریارانە نەیانتوانیوە جیاوازییەکی ئۆنتۆلۆجی *Ontologisch Differenz* لەنێوان سروشت و مێژوودا دیاریبکەن و تەنیا سەرزاری لە جیاوازییەکان *Unterschied* دواون. جیاوازییەکان، بۆ هایدیگەر، بنەڕەتی و ئۆنتۆلۆجین. دازاین لەبونیادە ئۆنتۆلۆجیەکەیدا لە بابەتێکی سروشتیەوە جیاوازە. ئەم جیاوازییەش ڕادیکاڵانەیە. بڕوانە : Martin Heidegger. *Being and Time*, p. 487

## بوونی ڕەسەن و ڕاستی

دوو زاراوەی فەلسەفی گرنگ ڕاستی(Truth) و ڕاستەقینە (Reality) هەن، کە لەگەڵ توێژینەوەکەمان بۆ بوونی ڕەسەن لەنێو ئۆنتۆلۆجی بنەرەتی هایدیگەردا دێنەپێش و پێویستە لەم قۆناخەی گەشتەکەماندا واتاکانیان ڕوونبکەینەوە. پێش ڕوونکردنەوەی واتاکانیان دەبێت ئەوپرسیارەش بکەین بۆچی ئەم دووزاراوەیە بۆ هایدیگەر گرنگن؟ لەپێش هایدیگەردا هەموو بیریارانی مێژووی بیرکردنەوەی فەلسەفیانە لە ئەفلاتونەوە مامەڵەیان لەگەڵ واتاکانی ئەم دوو زاراوەیە کردووە و لەسەر سیستەمە مێتافیزیکییەکەیان ڕوونیان کردۆتەوە. لەسەردەمی ئەفلاتونیشەوە کێشەی دوولایەنی dichotomy ئاگامەندی و ڕاستەقینە گەلێک بیردۆزەی جیاوازی بۆ لێکدانەوەی واتاکانی ئەو دووزاراوەیە هێناوەتەکایەوە و هاوکات بۆتە ڕێگریش لەئاستی تێگەیشتنێکی دروست لە واتاکانیان. ئەگەر ئاگامەندی لەڕاستەقینە جیاواز و دەرەکی بێت ئەوا هەرگیز ناتوانێت بە تەواوی ناخی بپێکێ و لە واتاکەی تێبگات. پەیوەندییە دەرەکییەکان ناوەوەی شتەکان نابینن و هەمیشە لەدەرەوەیاندا دەمێنێتەوە. لەسەرەتای توێژینەوەکەمان ئاماژەمان بۆ ئەوخاڵە کرد، کە مرۆڤ(دازاین) تەنیا بوونەوەرێکە ئاگامەندە و ئاگامەندانە لەواتای(بوون) دەکۆڵێتەوە و پرسیار سەبارەت واتاکەی



دەکات. هەوڵدەدات ڕاستی بوون بدۆزێتەوە. هەروەها لەم ڕووبەڕووبوونەوەیدا لەگەڵ ڕاستەقینەدا Reality بە بەردەوامی بەدوای ئەو ڕاستیەدا دەگەڕێت.[١٠٦] کەوابوو، مەحاڵە لە توێژینەوەکەمان بۆ بوونی ڕەسەن و هەڵوێستی ئەم بوونە بەرانبەر بوون پەنجە بۆ ڕاستی و ڕاستەقینە ڕانە کێشین و ڕەچاویاننەکەین. لەبەرئەمەشە هایدیگەر جێگەیەکی تایبەتی بۆ واتاکانی ئەم دوو زاراوەیە لەنوسراوەکانیدا دیاریکردووە و چەندجارێک لەسەری نوسیون.

ڕاستی لەنێو پرۆسە مێژووییەکەی بوونی ڕەسەندا سەرهەڵدەدات. شتێک نیە، وەکو فۆرمە بەرزەکانی ئەفلاتون لەژوور ئەم ڕاستەقینەیەی ئێمەوە هەڵواسرابێت و هەموو کەسێکیش نەتوانێت دەستی پێیانبگات و بیانناسێت. ئەگەر ڕاستی هەبێت ئەو ڕاستیە ڕاستی بوونە، کە خۆی بۆ دازاین دەرخستوە، یان ڕاستیەکە دازاین دۆزیویەتەوە و ناسیویە تی. بوونی ئاگامەندانەی دازاین و بوون بەگشتی دوولایەنی یەک ڕاستەقینەن، کە هەردووکیان پێکەوە لە دەرخستنی ڕاستیدا دەوردەبینن. جیاکردنە وەی ئەم دوولایەنەو

106 لەهەندێ نوسراوی دیکەدا وشەی(داکەوت) م بۆ(ڕاستەقینە) Reality یان بەعەرەبی (الواقع) بەکارهێناوە. لەم نوسراوەدا بەتایبەتی لەگەڵ توێژینەوەکە لەسەر(ڕاستی) وشەی (ڕاستەقینە) م لەبەر نزیکییان لە یەکدییەوە داناوە. بەبیروڕای من ئەم ئاڵو گۆڕکردنە کارناکاتە سەرناوەڕۆکی توێژینەوەکە.

تێگەیشتن لە پەیوەندییەکەیان بە پەیوەندییەکی دەرەکی مەحاڵە. بوونی ئاگامەندانەی دازاین بەڵگەیە بۆ سەلماندنی ڕاستەقینە و پێویست ناکات خۆمان بەسەلماندی بوونی ڕاستەقینەوە ماندووبکەین. بوون- لەنێو- جیهاندا و لەگەڵ- کەسانی دیکەدا، کە ئاماژە بۆ ڕاستەقینەی جیهان و مێژوو دەکەن، پێشمەرجی ئۆنتۆلۆجی بوونی مرۆڤن. بوونگەرایەتی بەتایبەتی لەسیستەمە ئۆنتۆلۆجیە بنەڕەتیەکەی هایدیگەردا، ڕیالیستانەیەو جیهانی دەرەوەی ئاگامەندی بە بوونی(خۆ) وە گرێنادات. مرۆڤ بەبێ ڕاستەقینە (داکەوت) و ڕاستەقینەش بەبێ مرۆڤ و خۆدەرخستن بۆ بوونی مرۆڤ هیچ ڕاستیەک دەرناخات و مرۆڤیش ڕاستی پەیداناکات. لەسەرەتاشەوە، پرسیارە ئۆنتۆلۆجیەکەمان سەبارەت(واتا) ی بوون پرسیارکردنە لەبارەی (ڕاستی) بوونەوە. هایدیگەر لەسەرەتاوە لە توێژینەوەکەیدا بەتایبەتی لە پەڕتووکی (بوون وکات) دا پرسیار لەبارەی واتای بوونەوە دەکات. لەبەرهەمەکانی دواییدا، کە پاش قۆناخی یەکەم نوسیونی(واتای بوون) بۆ (ڕاستی بوون) دەگۆڕێت. ئەم گۆڕانەش، بەگوێرەی ڕوونکردنەوەکەمان گۆڕانکاری لە بۆچوونە ئۆنتۆلۆجیەکەی هایدیگەر بۆ (دازاین) و (بوون) دروستناکات. هایدیگەر ئەو خاڵەمان بۆ ڕووندەکاتەوە، کە (واتا) و (ڕاستی) بوون وەکو یەکن و دۆزینەوەکەشی پرۆژەی ژیانی دازاییینە.[107]

---

[107] هایدیگەر لە پەڕتووکی(بوون وکات) دا باسی(واتا) ی بوون



ئەوکێشەیەی لێرەدا یەخەمان دەگرێت پەیوەندی بە ڕاستی و بوونی نارەسەنەوە هەیە. ئێمە، لە توێژینەوەکەمان بۆ فەلسەفەی هایدیگەر، جەختمان لەسەر بەستنەوەی ڕاستی بەبوونی ڕەسەنەوە کردووە. ئایا ئەمە ئەوە دەگەیەنێت، کە بوونی نارەسەن(ڕاستی) نەناسە؟ لەلایەکەوە وەڵامەکەمان(ئەرێ) یە. چونکە بوونی ڕەسەن دەتوانێت ڕەسەنانە پرسیار لە واتای بوون بکات و داهێنەرانە بەشوێن واتاکەیدا بێ و لێکیبداتەوە. بوونی ڕەسەن، کەخاوەنی پڕۆژەکانی بوونیەتی خۆی لەواتای بوون تێدەگات و نیتشە گوتەنی (سواری کۆڵی کەسانی دیکە نابێت.) بەڵام هێشتا، ناتوانین لە بڕیاردانەکەماندا بوونی نارەسەن لە ناسینی ڕاستی بێبەش بکەین. ئەو ڕاستیەی بوونێکی نارەسەن دەیناسێت(ئەوان) بەڕاستی دادەنێن و بەسەر ئەمدا دەیسەپێنن. ڕاستیەکە لە(ئەوان) ەوە دەرچووەو بوونە نارەسەنەکە ناتوانێت بیخاتە ژێر ڕۆشنایی هەڵسەنگاندن و ڕەخنەکارییەوە. ڕاستیەکە، وەکو بوونی نارەسەن. ئەگەر لە بوونێکی نارەسەن بپرسین بۆچی واتایەک بەڕاست دەزانێت؟ لەوەڵامدا دەڵێت، چونکە هەمووکەسێک واتاکە بەڕاست دادەنێت. بوونی نارەسەن لە پەنجەرەی باوەڕو بەهاو زانینەکانی ئەوانەوە دەڕوانیتە واتای بوون. بۆ بوونی ڕەسەنیش (ڕاستی) پڕۆژەیەکی

---

دەکات و لە *Contributions to Philosophy* واتای بوونی بۆ (ڕاستی) بوون گۆڕیوە. ئەوا بیرۆکەیەکی ڕاستە.

داهێنەرانەیە نەک لاساییکردنەوە و شوێنکەوتنی کوێرانەی کەلتوورە باوەکەی نێو سترەکچەرە دەرەکیەکە.

لە مێژووی فەلسەفەدا بیریاران لەسەردەمی ئەفلاتونەوە بەسێ شێوازی جیاواز لەواتای (ڕاستی) یان کۆڵیوەتەوە و پێناسیان کردووە. ئەم سێ شێوازە جیاوازەش سێ جۆر بیردۆزی (ڕاستی) یان دامەزراندووە، کە بە بیردۆزەی پەیوەندیدار Correspondence پێکەوەبەستن، Coherence و پراگماتیک Pragmatic ناسراون. بیردۆزەی پەیوەندیدار زیاتر(ڕاستی) دەکات بە خەسڵەتی دەستە واژەیەکی لۆجیکمەندانە و هەوڵدەدات(ڕاستی) لەسەر پەیوەندی نێوان دەستەواژەیەک یان بیرۆکەیەک و بابەتە دەرەکییەکەی دامەزرێنێت. ئەگەر توانیمان پەیوەندییەکە دامەزرێنین ئەوا ئەو دەستەواژەیە یان بیرۆکەکە ڕاستەو بەپێچەوانەشەوە ڕاست نیە. بۆنموونە لە دەستەواژەی(بەفرسپییە.) دا ئەگەر بەفر بەڕاستی سپی بێت ئەوا ئەم دەستەواژەیە ڕاستەو بیرۆکەکەی پەیوەندی بە دیاردە دەرەکییەکەوە (بەفر) و (ڕەنگی بەفرەکە) وە هەیە. ئەم بیردۆزەیە لەگەشەکردنی فێرگەی هەستەکی و فەلسەفەی شیگەرایەتیدا دەورێکی گرنگی بینیوە. شوێنکەوتوانی ئەم فێرگە فەلسەفیە پەیوەندیدارێتی دەستەواژەکان و دیاردەکانی نێو داکەوتی دەرەکی بەگرنگ و بنەرەتی دادەنێن. بیردۆزەی پێکەوەبەستن ڕاستی لە پێکەوەبەستن و ڕوانینێکی گشتگیرانە بۆ هەمووی بوونێک دادەنێت. تێگەیشتنمان لە ڕاستی بوونیک بەستراوە بە



ناسینی هەموولایەنەکانی ئەم بوونەوە و هیچ لایەنێکی بەتەنیاو ڕووتکراوەیی ڕاستی ئەوبوونە دەرناخات. بیردۆزی پراگماتیکیش دەڕوانێتە لایەنی پڕاکتیکی بیرۆکە. ئەگەر بیرۆکەیەک لەژیانی ڕۆژانەو بەکردەوە سودی هەبێت و زیان بەخش نەبێت، هایدیگەر پەیڕەوی ئەم بیردۆزانە ناکات. بۆچوونێکی بوونگەرانەی ئۆنتۆلۆجیانەی دامەزراندووە. بۆ یەکەمجار ئەم بۆچوونەی لە پەڕتووکی(بوون وکات) دا لە بەشی (٤٤) باسکردووە. لەساڵی ١٩٣١ چەند وانەیەکی بەناوی The Essence of Truth لەزانکۆی فرایبۆرگ گوتەوە، کە لە دووبەش پێکدێن. لەبەشی یەکەمدا مامەڵە لەگەڵ واتای(ڕاستی) لای ئەفلاتون دەکات. ئەم وانانە لەساڵی ١٩٨٨ لەبەرگی (٣٤) ی بەرهەمە کۆکراوەکانیدا *Gesamtausgabe* بڵاوکرانەوە. لەپەڕتووکی *Contributions to Philosophy* دا کێشەی(ڕاستی) جارێکی دیکە سەریهەڵداوەتەوە. ئەم پەڕتووکەی هایدیگەر لەساڵی ١٩٨٩ بەزمانی ئەڵمانی و لەساڵی ١٩٩٩ بەئینگلیزی بڵاوکرایەوە و لە بەرگی (٣) ی بەرهەمە بڵاوکراوەکانیشیدا دانراوە. دواجاریش لەساڵی ١٩٤٣، هایدیگەر نوسراوێکی *On The Essence of Truth* لە چەند کۆڕێکدا پێشکەشکردو چەندجارێکیش بەدەستکارییەوە بڵاوکراوەتەوە. لەم نوسراوەیەدا، هایدگەر بۆچوونە بوونگەرایەتیەکەی خۆی لەسەر واتای ڕاستی ڕووندەکاتەوە. ئەم نوسراوە لەبەرگی (٩) ی بەرهەمەبڵاوکراوەکانی

هایدیگەردا بڵاوکراوەتەوە.[108] لەساڵی ١٩٧٨ دا دەیڤید فارێل کرێل ئەم نوسراوەی لەگەڵ چەند نوسراوێکی دیکەدا بە ئینگلیزی و لەپەڕتووکێکدا بەناوی *Basic Writings* بڵاوکردەوە. لەزۆربەی نوسراوەکانی دیکەشدا بەتایبەتی ئەوانەی مامەڵە لەگەڵ کێشەکانی هونەرو تەکنەلۆجیا و زمان دەکەن هایدیگەر هەوڵیداوە لەسەر(ڕاستی) بدوێت.

ئەوەی دەمەوێت باسیبکەم ئەوەیە، کە ڕاستی کێشەیەکی لۆجیکی نیەو ئۆنتۆلۆجییە. ڕاستی خەسڵەتی دەستەواژە Proposition نیە، کە تیایدا پەیوەندی نێوان بارو بارهەڵگەرەکە بە ئەرێ یان نەرێ دەردەبڕین. لەبۆچوونی بوونگەرانەدا ئۆنتۆلۆجی لە ئەپستمۆلۆجی لەپێشترەو دووەمیان پشت بە یەکەمیان دەبەستێت، چونکە(بوون) بنەڕەتی هەمووشتەکانە. بۆئەوەی لەبارەی شتێکەوە بدوێین یان پەیوەندی نێوان بار و بارهەڵگرێک لەدەستەواژەیەکدا دەربڕین دەبێت بارو بارهەڵگر هەبن. بوونیان دەبێت بەپێشمەرج بۆ هەرچ شێوازێکی دەربڕین لەبارەیانەوە. هەروەها(ڕاستی)، کە لەئاکامی پرۆسەی بەردەوامی داهێناندایە خەسڵەتێکی مرۆڤانەیە. مرۆڤ بەبەردەوامی لەڕووبەڕووبوونەوەیدا هەوڵدەدات ڕاستی

[108] John Sallis. “Interrupting Truth”, in *Heidegger toward the Turn*, (ed.) James Risser, New York: State University of New York Press, 1999. P. 20



بناسێت. بۆ مرۆڤ ڕاستی هەیە، یان شتێک ڕاستە و ئەوی دیکە ناڕاست. لەسەرو ئەمانەشەوە ڕاستی نا- ڕاستیە. هەرچەندە ئەم کێشەیە ناکۆکە و خۆبەزێنە. بەڵام گرنگە و بۆچوونەکەی هایدیگەر لەو ڕوانینە مێتافیزیکیانە دووردەخاتەوە، کە ڕاستی بەهەمەکی و نەگۆڕدادەنێن. ئەم کێشەناکۆکەی (ڕاستی) لەسەرزەمینەی توێژینەوە ئۆنتۆلۆجیەکەی نێو(بوون وکات) بۆ بوونی مرۆڤ و دۆزینەوەی ڕاستی دامەزراوە و دەتوانین لەوێدا دەستنیشانی بکەین. هایدیگەر لە پەڕتووکی *Contributions to Philosophy* دا ئاماژەی بۆ دەکات.[109]

ئایا مەبەستی هایدیگەر لە(ڕاستی نا- ڕاستیە) چیە؟ چۆن ڕاستی ناراست دەبێت؟ بێگومان، ئەم کێشەیە دژی یاسای ناکۆکی یان ناسنامەی ئەریستۆیە. بەگوێرەی ئەریستۆ یەک شت نابێت ڕاست و ناڕاستیش بێت. ئەگەر گریمان بەفرسپییە، ئەوا ناکرێت لەهەمانکاتدا بڵێین بەفرسپییش نیە. ئەم یاسایەش لەسەردەمی هیگڵ و دامەزراندنی لۆجیکی دیالێکتیکی گۆڕانی بەسەرداهاتووە. هیگڵ و هایدیگەر لەوباوەڕەدان، کە یاساکەی ئەریستۆ بۆ دامەزراندنی ناسنامەیەکی ڕووتکراوە لە جیاوازییەکان بەکاردێت. یاسایەکە ڕێگە بە سە رهەڵدان و پێکەوە ژیانی

[109] Martin Heidegger. *Contributions to Philosophy (From Enowing)*, p. 249 and Martin Heidegger. “The Origin of the Work of Art”, in *Basic Writings*, p.179

جیاوازییەکان نادات. ئەمەش وابەستە بەبناخەی ئەو سیستەمە میتافیزیکیەوە ئەریستۆ لەژێر کاریگەرێتی ئەفلاتوندا پەیڕەویکردووە.[110] لەبەرئەوەی لەسیستەمی ئۆنتۆلۆجی هایدیگەردا هیچ شتێکی نەگۆڕو هەمەکی نیە و هیچ شتێک وەکو خۆی نامێنێتەوە، ناتوانین ناسنامەیەکی ڕووتکراوە لەجیاوازییەکان بەسەر شتەکاندا بچەسپێنین. لێرەوە، دەگەینە ئەوباوەڕەی، کە هەمووشتێک وەکوخۆیەتی (same) و جیاوازیشە (different) . هەمووشتێک وەکوخۆی بەوجیاوازییەوە دەمێنێتەوە. ئێمە هەرگیز ناگەینە ئەو قۆناخەی ناسنامەیەکی پڕ و ڕووتکراوە لەجیاوازییەکان دامەزرێنین و بانگەشەی ناسینی ڕاستیەکی ڕەهاو نەگۆڕبکەین. دۆزینەوەی ڕاستی پرۆسەیەکی لەکۆتایی بەدەرو بەردەوامە. تاکو ئەو ڕۆژەی دازاین هەیە ناتوانێت بگاتە دوا ویستگەی پرۆسەی داهێنانەکە.

لەڕوویەکی دیکەوە، لەکاتێکدا ئێمە دەڵێین(بەفر سپییە.) لەگەڵ دەرخستنی ئەم ڕاستیەدا، کە ڕەنگی شتە باسلێکراوەکە دەردەخات، لەهەمانکاتدا بەو بڕیاردانە لەسەر ڕەنگی شتەکە لایەنێکی دیکە یان ڕاستیەکی دیکەی

[110] بۆخوێندنەوەی زیاتر لەسەر یاساکەی ئەریستۆ بڕوانە:

Aristotle. "On Interpretation", in *Complete Works of Aristotle*, vol.1, Section 6, p.27



ئەوشتە دەشارینەوە.[111] بڕیاردانەکەمان لەسەر ئەوەی بەفرسپییە، ئەوەش دەگەیەنێت، کە بەفر تەنیاسپییە. ئەگەر بەفر ڕەنگی دیکەشی هەبێت، یان سپی نەبێت، ئەوا ئەو ڕاستیە لەم بڕیاردانەدا شاراوەتەوە. هەموو بڕیاردانێک لە ئەرێی دەستەواژەیەکدا هاوکات نەرێییە، یان هەموو بڕیاردانێکی پۆزەتیڤی نێگەتیڤەو نێگەتیڤیش پۆزەتیڤە. دەرخستنی ڕاستی، لەپرۆسەی داهێنانی دازایندا، شاردنەوەی ڕاستیە. دازاین بەناسینی ڕاستییەک و دەربڕینی ئەو ڕاستیە ڕاستیەکی دیکە دەشارێتەوە.

ئەو ڕاستیەی دازاین لە قۆناخێکی پرۆسەی داهێنانی بوونیدا دەیناسێت لایەنێکی بوونە و(هەموو) نیە. لەبەرئەوە بەڕاستییەکی نەگۆڕ و هەمەکی و(دوا) ڕاستی دانانرێت. گەڕانەوەشمان بۆ بوونی مرۆڤ ئەوڕاستییەمان بۆ دەردەخات، کە بەکۆتایی یان لەگەڵ مردنی ئەم بوونەدا دەتوانین بە(دوا) ڕاستیەکەی بگەین. بائەوخاڵەشمان لەیاد نەچێت، کە ڕاستی بوونێکی دەرەکی و بەرزی نیەو لەجیهانێکی دیکە دانە نراوە. مرۆڤیش تەماشاکەری ڕاستی نیە. ڕاستی لەنێو پرۆسەی داهێنانی بوونی مرۆڤدا سەرهەڵدەدات. لەبوونی مرۆڤدا ڕاستی و ڕاستەقینەی دەرەکی دوور لەیەکدییەوە نین. مرۆڤ ئەو بوونەیە، کە

[111] من لێرەدا زاراوەی (نا-ڕاستی) نەک (ناڕاست)م بۆ un-truth داناوە. واتای یەکەمیان لە دووەمیان جیاوازە. هایدیگەر ڕاستی بە(نا-ڕاست) دانانێت، دەڵێت، کە ڕاستی، نا-ڕاستییە.

لەنێو ڕاستیدایەو ڕاستیش لەنێو ئەودایە.[112] هایدیگەر لە نوسراوەکەیدا *On the Essence of Truth* لە سەرەتاوە پرسیار لە چیەتی ڕاستی دەکات. دەیەوێت لە(ناوەڕۆک) ی ڕاستی بکۆڵێتەوە. ئایا ناوەڕۆکی ڕاستی چیە؟ لە وەڵامدا، (ناوەڕۆکی ڕاستی سەربەستیە.)[113] مەبەستی هایدیگەر لە سەربەستی، وەکو ناوەڕۆکی ڕاستی چیە؟ ئایا سەربەستی چی پەیوەندییەکی بەڕاستیەوە هەیە؟ دەبینین، هایدیگەر نایەوێت لە سەر زەمینەی لۆجیک باسی ڕاستی بکات. ڕاستی خەسڵەتێکی لۆجیکی دەستەواژەیەک نیە و خەسڵەتێکی مرۆڤانەیە. ئەگەر ڕاستی هەبێت، ئەوا مرۆڤ ڕاستییەو ناڕاستیشە. تەنیا مرۆڤ تەوانای بڕیاردانی لەسەر ڕاستی و نا- ڕاستی هەیە. ئەگەر مرۆڤیش ناڕەسەن بێت و لە بوونێکی ئاگامەندو داهێنەرەوە بەکەلوپەل کرابێت و داگیرکرابێت، ناتوانێت ڕاستی بناسێت. ڕاستی ناسین مرۆڤانەیە، بەڵام مرۆڤی ناڕەسەن بە نا- مرۆڤ کراوەو بووە بەبابەت. لەپێشتر ئاماژەمان بۆ ئەو خاڵە کرد، کە مرۆڤی ڕەسەن ڕاستی ناسە. مرۆڤی ڕەسەنیش ئەو تاکەیە سەربەستانە لە پرۆسەی داهێنانی بوونیدا بڕیار لەسەر پرۆژەکان دەدات و ڕاستیەکانی بوون دەدۆزێتەوە. کێشەی دۆزینەوەی راستی پەیوەندییەکی بنەڕەتی

---

[112] Martin Heidegger. *Contributions to Philosophy (From Enowning)*, p. 249

[113] Martin Heidegger. “On the Essence of Truth”, in *Basic Writnigs*, p. 123



بە(سەربەستی) ئەم بوونەوە هەیە. مرۆڤی ڕەسەن سەربەستەو هاوکات ڕاستی ناسە. ئەگەر سەربەست نەبێت و ناڕەسەنانە بژی و بە نا- مرۆڤ کرابێت، ئەوا ڕاستی ناسیش نیە. کەوابوو ڕاستی پێویستی بە سەربەستیە، یان سەربەستی ناوەڕۆکی ڕاستیە. بە بیروڕای من ئەم بۆچوونەی هایدیگەر ئۆنتۆلۆجی و فینۆمینۆلۆجیانەشە. لەلایەکەوە جەخت لەسەر ئەوخاڵە دەکات، کە مرۆڤ لەبونیادی ئۆنتۆلۆجیەکەیدا بەڕێکەوت پەیدابووەو ڕسکاوە. هیچ سەدەمێکی هۆشەکی لەپێشتر بڕیاری لەسەربوونی نەداوە و داگیرینەکردووە. لەلاکەی دیکشەوە هایدیگەر لەو باوەڕەدایە، کە مادامەکی ڕاستی خەسڵەتێکی مرۆڤانەیە پێویستە لەمێژوودا یان لەداکەوتە فینۆمینۆلۆجیەکەشدا بۆ دۆزینەوەی ڕاستی دازاین بەمرۆڤی بمێنێتەوە. مانەوەش، وەکو مرۆڤ لەوەدایە، کەبوونی داگیر نەکرێت و سەربەست بێت. بوونێکی داگیرکراو بەدوو شێوە تەوانای دۆزینەوەی ڕاستی دەدۆڕێنێت. یەکەم، بوونی کراوە بە بابەت و دووەمیش هەر ڕاستیەک بناسێت، ئەواڕاستیە لە نێوسترەکچەری کەلتوورە زاڵبوەکەدا (ئەوان) بەسەر ئە مدا سەپاندوویانە و ڕاستیەک نیە خۆی دۆزیبێتەوە. پاش پێناسکردنی ناوەڕۆکی ڕاستی هایدیگەر لەواتای ڕاستی لەسەر زەمینەی ئەم ناوەڕۆکە دەکۆڵێتەوە، کە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە بۆچوونەکانی لەسەر ڕاستی و فینۆمینە لە(بوون و کات) دا هەیە. لە بەشی ٤٤ ی ئەم پەرتووکەدا بەکورتی واتای ڕاستی و لەبەشی ٧ دا فینۆمینەی لێکداوەتەوە. بۆ دامەزراندنی بناخەیەکی

بەهێزیش بۆ بۆچوونەکانی، هایدیگەر بۆ زمانی یۆنانی کۆن گەڕاوەتەوەو بنەڕەت و بەکارهێنانی زاراوە فەلسەفیەکانمان لەلای یۆنانیەکانەوە بۆ ڕووندەکاتەوە. لەو باوەڕەدایە، کە یۆنانیەکان زاراوەی *alêtheia* بۆ ڕاستیان بەکارهێناوە، کە بەواتای ئاشکراکردن، دەرخستن یان نیشاندان نەک (ڕاستی) دێت.[١١] مەبەست لە ئاشکراکردن چیە؟ چی ئاشکرادەبێت؟ کێ ئەوشتە ئاشکرا دەکات؟ ئاشکراکردن پرۆسەیەکە و سێ لایەنی هەیە، ئاشکراکەر، ئاشکراکراو، ئاسکراکردنەکە. کە بوونە(ئاشکراکردن) پێویستی بەبوونێکی ئاگامەندە (ئاشکراکەر)، کە بوونە نا-ئاشکراکە ئاشکرابکات و بیناسێت. ئەوبوونە ئاگامەندەش، مرۆڤە و هەولدەدات بوونێکی نا - ئاشکرا و شاراوە، ئاشکرابکات. ئەوەی ئاشکراش دەبێت (بوون) ە. بەم جۆرە(ڕاستی) لە فەلسەفەی هایدیگەردا، پیوەندیدارێتی نێوان بیر و بابەت و پێکەوە بەستن و ئەوئاکامە پراکماتیکیەنیە بیرۆکەیەک خۆی دەکات بەبارهەڵگری. ڕاستی ئاشکراکردنی لایەنە شاراوەکانی بوونەو لە پرۆسەی داهێنانی بوونی مرۆڤدا سەرهەلدەدات.[١١٥] مرۆڤ سە ر بەستانە لەبووندا ڕاستیەکانی بوون دەدۆزێتەوە. ئەم

---

[114] هەمان سەرچاوە، هەروەها بروانە:

Martin Heidegger. “The Origin of the Work of Art”, in *Basic Writings*, pp.176-77

[115] هەمان سەرچاوە، لاپەرە ١٢٦



پرۆسەیەش بوونی مرۆڤ لە بوونی هەبووەکان جیادەکاتەوەو دەیکات بە ڕەوتێکی ئاگامەندانە بەرەو(داهاتوو) یان ڕاستیە شاراوەکان.

# بەشی پێنجەم
# بیروباوەڕی فەلسەفی هایدیگەر پاش قۆناخی یەکەم (هایدیگەری دوا)

لەم بەشەوە توێژینەوەکەمان خۆی بەقۆناخی دووەمی بیرکردنەوەی فەلسەفی هایدیگەر دە گەیەنێت. من، لەسەرەتاوە ئاماژەم بۆ دوو قۆناخ کردووە: ئەوقۆناخەی (بوون و کات) ی تێدا نوسراوەو قۆناخی دوای ئەمەش. قۆناخی دووەم چەند ناوێکی بۆ دانراوە، هەندێک بەقۆناخی پاش ساڵانی سییەکان، قۆناخی وەرگێڕان *die Kehre* یان هایدیگەر دوا Later Heidegger دایدەنین. ئەم سێ ناوە بۆ ئەوبەرهەمانەی هایدیگەر دانراون، کەپاش(بوون و کات) نوسراون. هایدیگەر بە ڕێگەی ئەم بەرهەمانەوە هەوڵیداوە پرۆژە ئۆنتۆلۆجیەکەی تەواوبکات. هەندێک لە بیریاران لەو باوەڕەدان، کە(وەرگەڕان) ێک لە بۆچوونە فەلسەفیەکەی هایدیگەردا روویداوە. هایدیگەر لەڕێبازی توێژینەوە ئۆنتۆلۆجیەکەی قۆناخی یەکەمی لایداوە و خۆی بەکێشەی(بوون) ەوە ماندووکردووە. ئایا ئەم بیروڕایە تاکو چی ڕادەیەک دروستە؟ ئایا دەتوانین بڵێین دوو هایدیگەرمان هەیە(هایدیگەری قۆناخی یەکەم و دووەم)؟ ئایا هیچ پەیوەندییەکی فەلسەفی لەنێوان ئەم دوو قۆناخەدا نیە؟ ئەی هایدیگەر سەبارەت بەم بیروڕایە چی دەڵێت؟



بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە حەزدەکەم بیری خوێنەربهێنمەوە، کە پرۆژە فەلسەفیەکەی هایدیگەر لە(بوون و کات) دا ئامانجێکی دیاریکراوی هەیە. هایدیگەر بەدوای واتای(بوون) دا دەگەڕێت و دەیەوێت(بوون) نەک هەبووەکان بکاتەوە بەو ڕاستیەبنەڕەتیەی هەمووشتێکی لەسەر دادەمەزرێت. کەوابوو، هایدیگەر لەیەکەم هەنگاوی گەشتە فەلسەفیەکەیەوە دەیەوێت وەڵامی ئەوپرسیارەبداتەوە(بوون چی واتایەکی هەیە؟)[116] ئەو هەوڵی دامەزراندنی(ئۆنتۆلۆجی بنەڕەتی) دەدات، کەدەبێت بە پێشمەرج بۆ سیستەمە ئۆنتۆلۆجیەکانی دیکە. بۆ ئەم مەبەستەش توێژینەوەکەی لە سەرەتایەکەوە دەستپێکرد، کە بتوانێت بەو ئامانجەی بگەیەنێت. ئەوسەرەتایە لایەنێکی(بوون) بوو، کە لەلایەنەکانی دیکە لەپێشتربوو. سەرەتاکەش بوونی مرۆڤ(دازاین) بوو، چونکە مرۆڤ لایەنی ئاگامەندو گەڕۆکی بوونە بەدوای واتای بووندا. مرۆڤ پرسیار لەبارەی واتای بوونە دەکات و هەوڵی ناسینی ئەوڕاستیەبدات، کەبووە بەبنەڕەتی بوونی خۆی. کەوابوو، تێگەیشتنمان لەبوونی مرۆڤ یان لەم لایەنەی بوون سەرەتای گەشتەکەمانە بۆ تێگەیشتن لە واتای(بوون) بەگشتی. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت، کە تێگەیشتنمان لەواتای بوونی مرۆڤ وەڵامی پرسیارەگەورەکەمان سەبارەت واتای بوون دەداتێ. لەبەرئەمە پرۆژە فەلسەفیەکەی (بوون وکات) یان قۆناخی یەکەمی هایدیگەرسەرەتایە بۆگەشتە

[116] Martin Heidegger. *Being and Time*, p.29, p.487

فەلسەفیەکە. قۆناخی دووەمی هایدیگەریش لەگەڵ خۆماندووکردنی بە لێکۆڵینەوە لەواتای (بوون) بەگشتی، نەک جارێکی دیکە گەڕانەوە بۆ شیکردنەوە بوونگەرایەتیەکەی دازاین، تەواوکەری قۆناخی یەکەمە. پەیوەندی نێوانی ئەم دووقۆناخە لەسەرەتاوە لەلایەن هایدیگەرەوە باسکراوەو لەیەکدی جیانابنەوە.

دەشێ ئەم قۆناخە بە(هایدیگەری دوا)، وەکو دیاردەیەکی کاتی(زەمەنی) دابنرێت، بەڵام لەقۆناخی یەکەم جیانابێتەوە و پەیوەندییەکەی نێوانیان بەگەشەکردن و پرۆژە ئۆنتۆلۆجیەکەی هایدیگەرەوە گرێدراوە. لەچ روویەکەوە ئەم قۆناخە(وەرگەڕان) ە لەبیرکردنەوەی فەلسەفی هایدیگەردا؟ وەکو باسمکرد، قۆناخی دووەم بەردەوامییە نەک وەرگەڕان و پەشیمان بوونەوەی هایدیگەر لە بۆچوونەکانی قۆناخی یەکەمی. بەڵام هایدیگەر وشەی وەرگەڕانی لە دووشوێندا بۆ قۆناخی دووەمی نوسینەکانی بەکارهێناوە. ئێمە چۆن نکۆڵی لەوەرگەڕانەکە بکەین؟ ئایا مەبەستی هایدیگەر لەم وەرگەڕانە چیە؟

لەساڵی ١٩٤٦ فەلسەفەی بوونگەرایەتی(بوونخوازی) لەفەرەنسا بووبە نەریتێکی زاڵ و باوی نێو گەلێک لە رۆشنبیران و لاوانی ئەو وولاتە. جان پۆڵ سارتەر، کە بەپێغەمبەری ئەو بزوتنەوە فەلسەفیە دادەنرا، کۆڕێکی بەناوی (بوونگەرایەتی ومرۆڤایەتی) گرت و لەم کۆڕەدا هەوڵیدا پەیوەندییەکی پتەو لەنێوان بوونگەرایەتی و



مرۆڤایەتیدا دیاریبکات.

رۆژی ١٠ ی مانگی ١١ ی ١٩٤٦ جان بێوفرێت Jean Beaufret رۆشنبیرێکی فەرەنسی نامەیەکی سەبارەت بزوتنەوەی بوونگەرایەتی لەفەرەنسا و کۆڕەکەی جان پۆڵ سارتەر بۆ هایدیگەر نووسی. لەونامەیەدا چەند پرسیارێکی فەلسەفی لەهایدیگەر کردووەو داوای لێدەکات بیروڕای خۆی لەبارەی بوونگەرایەتیەکەی سارتەرەوە دەربڕێت. هایدیگەر وەڵامی نامەکەی جان بێوفرێتی بەنامەیەکی دوورودرێژ دایەوە، کەلەدواییدا پاش دەستکاریکردنی لەساڵی ١٩٤٧ بەناوی(نامەیەک لەسەر مرۆڤایەتی) Letter on Humanism بڵاویکردەوە. هایدیگەر لەم نامەیەدا بەم جۆرە باسی(وەرگەڕان) لەتوێژینەوە فەلسەفیەکەیدا دەکات:

وانەکەم لەسەر On the Essence of Truth لەساڵی ١٩٣٠ دا پێشکەشکرا، بەڵام لەساڵی ١٩٤٣ دا بڵاوکرایەوە. ئەم وانەیە تێڕوانینێکی سەبارەت وەرگەڕان لە(بوون و کاتەوە) بۆ (کات وبوون) تیایە. ئەم{وەرگەڕان} ە گۆڕینی بیروباوەڕەکانی نێو پەرتووکی(بوون وکات) نیە، بەڵکو رەهەندی ئەو ئەزموونەیە، کە(بوون) تیایدا لە بیرچۆتەوە.[١١٧]

117 Martin Heidegger. "Letter on Humanism"; in *Basic Writings*, pp. 231- 232

لەنامەیەکی دیکەدا هایدیگەر بۆ ولیەم ڕیچەردسەن William Richardson دەنوسێت:

بۆیەکەمجار لە نوسراوەکەمدا Letter on Humanism ئاماژەم بۆ وەرگەڕان{*die kehre*} کردوە. لەوکاتەوە واباسدەکرێت کە بۆچوونەکانی هایدیگەر گۆرانیان بەسەرداهاتووە، یان لەساڵی ١٩٤٥ وەشێوەیەکی دیکەیان وەرگرتوە. تێناگەن بیرێک چەندی پێویستە تاکو گۆڕانی بەسەردابێت. حەزدەکەم ئەوە ڕوونبکەمەوە دەساڵ پێش ١٩٤٧ کارم لەسەر وەرگەڕان لەبیرکردنەوەمدا کردووە. وەرگەڕانەکەش گۆڕانکارییە لەبیرکردنەوەمدا نەک پەشیمانبوونەوە لەبۆچوونەکانی پێشوترم، بەتایبەتی بۆچوونەکانی نێو(بوون وکات). لەوەرگەڕانەکەدالەگەڵ ناوەڕۆکی (بوون وکات) دا ماومەتەوە و هەوڵمداوە لە(کات وبوون) بکۆڵمەوە.[118] ئەم نامەیەی هایدیگەر لەپێشەکی ئەم پەرتووکەدا بڵاوکراوەتەوە.

ئەم دوو نامەیەی هایدیگەر بەڵگەن بۆ لانەدانی لە بیرکردنەوەی فەلسەفی قۆناخی یەکەم. هەروەها لە(بوون وکات) دا دەڵێت، وەکو ڕوونکرایەوە، توێژینەوە لە بوون لە ئۆنتۆلۆجی بنەڕەتیدا توێژینەوەیە لە (کات) ی بوونی

[118] William Richardson. *Heidegger Through Phenomenology to Thought*, Preface by Martin Heidegger, The Hague: Martinns Nijhoff, 1967. P. xvi



بوونیش.[119]

مەبەستی هایدیگەر ئەوەیە، کە گەڕان و لێکۆڵینەوە ئۆنتۆلۆجیەکەی بۆ دۆزینەوەی واتای بوون لەم قۆناخەدا(پێویستی) تێگەیشتن لە(کات) یش دەهێنێتە پێش. (بوون) ڕاستەقینەیەک نیە لەدەرەوە یان لەژوور کاتەوە بێت و لەنێو کاتیشدا نیە، بەڵکو بوون کاتە. مەبەستی لە وەرگەڕانەکەی لەنامەکانیدا ئاڵوگۆڕکردنی بوون و کاتە لەگەڵ یەکدیدا، نەک نکۆڵی کردن لەبۆچوونە فەلسەفیەکانی پێشو. هایدیگەر لەقۆناخی یەکەمدا سەرکەوتوانە بەڕێگەی هێرمنێوتیکی فینۆمینۆلۆجیەوە بوونی مرۆڤی شیکردۆتەوە. ئەوهەنگاوەش بۆمەبەستی تێگەیشتن بوو لە واتای بوون بەگشتی. لەقۆناخی دووەمدا بە بەردەوامی و بی پچڕان لە قۆناخی یەکەم دەیە وێت پرۆژە فەلسەفیەکەی تەواوبکات و واتای بوون بەگشتی، نەک لایەنێکی بوون بدۆزێتەوە. هەندێک بیریار ڕەخنەیەکی دیکە لە هایدیگەر دەگرن و بەبۆچوونی ئەوان هایدیگەری قۆناخی دووەم لەفەلسەفە نادوێت و خۆی بەکێشە نا- فەلسەفیەکانەوە ماندووکردووە. بەبیروڕای جولیان یۆنگ ئەم ڕەخنەیە پەیوەندی بەگۆڕان لە شێوەی نوسینی هایدیگەردا هەیە نەک ناوەڕۆکی بەرهەمەکانی

[119] Martin Heidegger. *Being and Time*, p.40

قۆناخی دووەمی.[120] زمانی هایدیگەر لەقۆناخی یەکەمدا بەتایبەتی لە(بوون وکات) دا فەلسەفیە و نوسراوەکانی قۆناخی دووەمی زیاتر(شاعیرانە) یە. ئەمەش بەڵگەنیە بۆ لادانی هایدیگەر. لەم قۆناخەدا واتای بوون بەڕێگەی جیاواتر، وەکو ڕێگەی هونەر و ڕەخنە لە تەکنەلۆجیا، ڕوونکراوەتەوە. هەوڵدراوە نزیکی فەلسەفە لە هونەرەوە دەرخریت. جیاوازی شێوەی نوسینی هایدیگەر لەم قۆناخەدا وابەستە بەناوەڕۆکی ئەم بابەتانەوە. بەڵام لە هەموونوسراوەکانیدا لەسەر هونەر و تەکنەلۆجیا بەڕێگەی ئەوشێوە نوسینە پەیامە فەلسەفیەکەی دەربڕیوە. بۆ نموونە، هایدیگەر سەبارەت بە لاوانەوە شیعریەکەی هۆڵدەرلن Home Coming (گەڕانەوە بۆ وڵات) لە وانەیەکییدا لەساڵی ١٩٤٣، کێشەی دوورە وڵاتی یان(بێ وڵاتی) بەکێشە فەلسەفیەکەی (بیرچوونی بوون) ی داناوە. وڵات بە بۆچوونی هایدیگەر، لەم لاوانەوە شیعرییەدا، پارچەیەک خاکی سنوردار نیەو بوونە بەگشتی. ناسینی ڕاستی بوون گەڕانەوەیە بۆ وڵات.[121] لە نوسراوێکی دیکەدا بەناوی (مرۆڤ شاعیرانە دەژی) لەساڵی ١٩٥١ نوسیویەتی، هایدیگەر ڕۆڵی هونەر بەگشتی و شیعریش بەتایبەتی بۆ ناسینی (بوون) ڕووندەکاتەوە و دەڵێت، (داهێنانی شیعری

[120] Julian Young. *Heidegger's Later Philosophy*, Cambridge: Cambridge University Press, 2002. P. 1

[121] Martin Heidegger. "Letter on Humanism"; in *Basic Writings*, p. 241



ژیان و دامەزراندنە.)[122]

ئایا مەبەستی هایدیگەر لەم دەستەواژەیە چیە؟ بۆچی داهێنانی شیعری ژیان و دامەزراندن بێت؟ بێگومان ئەمە دەربڕینێکی شاعیرانە یان هونەرمەندانەیە، بەڵام مەبەستێکی فەلسەفی لە دوایە، کەهایدیگەر بەم شێوەیە دەریبڕیوە. داهێنانی شیعری، داهێنانی هونەرییە. هونەر خاوەنی داهێنانەو هونەرمەند داهێنەرە. داهێنانیش لەگەڵ ئەنجامدانی پرۆژەکانی بوونێکی ڕەسەندا بۆ تێگەیشتن لە واتای بوون سەرهەڵدەدات. ژیان، لەم ڕووەوە، کات بەسەربردن نیە، داهێنانی بەردەوامە و دامەزراندنی ڕاستیەکانی بوونە. لەم سەردەمەی ئێمەدا، کەسەردەمی تەکنەلۆجییە، مرۆڤ ناڕەسەن و نامۆکراوەو تەکنەلۆجیا ناوەڕۆکێکی نا- مرۆڤانەی بەسەردا سەپاندووە، هونەر بەگشتی و شیعر بەتایبەتی، لەنێو بارودۆخی تەکنەلۆجی نامۆبووندا، ڕێگەیەکی دەربازبوون و ڕزگارکەرە. مرۆڤ لەداهێناندا بوونی ڕەسەنی خۆی دەسەلمێنێت.

ئێمە دەتوانین لەچەند خاڵێکدا وەرگەڕانەکەی *die Kehre* *هایدیگەر* لە چەند خاڵێکدا کۆبکەینەوە، یەکەم، لەقۆناخی دووەمدا شیکردنەوەی بوونگەرانە بۆناسینی بوونی

[122] Martin Heidegger. "... Poetically, Man Dwells…", in *Martin Heidegger's Philosophical and Political Writings*, Manfred Stassen, New York: Continuum, 2003. P. 266

مرۆڤ(دازاین) سەرهەڵنادات، چونکە شیکردنەوەکە لەقۆناخی یەکەمدا بەتایبەتی لە(بوون وکات) دا تەواوبووە. ئەم شیکردنەوەیەش سەرەتای گەشتە ئۆنتۆلۆجیەکەی هایدیگەرەو بیرکردنەوەی فەلسەفی هایدیگەر لێرەدا خۆی بەقۆناخێکی دیکە دەگەیەنێت. لەبەرئەمە قۆناخی دووەم بەردەوامییە بەقۆناخی یەکەم و تەواوکردنی ئەوپرۆژە ئۆنتۆلۆجیەیە، سەبارەت بە واتای بوون، کە لەبەشی یەکەمی (بوون وکات) دا ڕوونکراوەتەوە.

دووەم، لەهەندێک ڕووەوە زمانی فەلسەفی هایدیگەر گۆرانکاری بەسەردا هاتووە. لە(بوون وکات) دا زمانێکی فەلسەفی ڕەوان و لەقۆناخی دووەمدا زمانێکی(ئەدەبی) بۆڕوونکردنەوەی واتای بوون بەکارهێنراوە. بێجگە لەمە، هایدیگەرچەند زاراوەیەکی فەلسەفی گۆڕیووە. بۆ نموونە لەقۆناخی یەکەمدا لە(واتا) ی بوون دەکۆڵێتەوە و لەقۆناخی دووەمدا لە(ڕاستی) بوون. لەقۆناخی یەکەمدا تویژینەوەکەی لەسەر(دازاین) بوو، لەم قۆناخەدا لەسەر (بوون) ە. بێگومان ئەمەش پەیوەندی بە بازنە هێرمینۆتیکییەکەی هایدیگەرەوە هەیە، کە بۆ تێگەیشتن لە(هەموو) لە(بەش) ێکەوە دەکەوێتە گەڕو بەپێچەوانەشەوە دروستە. بەگوێری ئەم بازنە هێرمینۆتیکییە بۆ تێگەیشتن لەواتای بوون بەگشتی پیویستە لەواتای بەشێکی بوونەوە(وەکو دازاین) دەستپێبکەین. تێگەیشتنمان لەواتای بوونیش بەگشتی تێگەیشتنمان لەواتای ئەوبەشە بۆمسۆگەر دەکات.



هایدیگەر، بۆ ڕوونکردنەوەی جیاوازییە ئۆنتۆلۆجیەکانی نێوان شێوە و بەشەکانی بوون سێ زاراوەی سەرەکی لەقۆناخی یەکەمدا (*Sein*, *Seinden*, *Dasein*) داناوە. من ئەم سێ زاراوەیەم بەم جۆرە وەرگێڕاوە(بوون*Sein*) ،(هەبووەکان *Seinden*) و(بوونی مرۆڤ *Dasein*). لە قۆناخی دووەمدا، کە جەخت لەسەر دۆزینەوەی ڕاستی(بوون- *Sein*) دەکات هایدیگەر بەشێوەیەکی جیاوازتر بوونی نوسیوەو گەڕاوەتەوە بۆ شێوەی نوسینی ئەم زاراوەیە لەزمانی ئەڵمانی کۆندا وەکو(*Seyn*) .[123] گەڕانەوە بۆ ئەم شێوە نووسینەی بوون لەمەبەست بەدەرنیە. هایدیگەر دەیەوێت جیاوازییەک لە نێوان تێگەیشتنی سەردەمەکەمان بۆ ڕاستەقینە و بوون خۆی لەژوور ئەو تێگەیشتنەمانەوە دیارییکات. تێگەیشتنی ئێمە لە ڕاستەقینە Reality پەیوەندی

بە بۆچوون و حەزو بەرژەوەندییمانەوە هەیە. هەندێک جار تێگەیشینەکە لە ڕاستی ئەو ڕاستەقینەوەیەوە دوورە و ئەو(واتا) یەی ئێمە بەڕاستیەقینەی دەدەین لە(ڕاستی) یەوە جیاوازە. یۆنانیەکان (خۆر) یان بەکۆشک و تەلاری خواکەیان(زیۆس) دادەنا. ئەمە واتایەکە یۆنانیەکان بەخۆریان داوە، بەڵام(ڕاستی) ئەم تەنە گرگرتووە لەو(واتا) یەوە دوورە. گرفتی ئێمە بۆ بەکارهێنانی ئەم ووشە فەلسەفیانە نەبوونی زاراوەیە لە زمانەکەماندا. من (بوون)

123 Julian Young. *Heidegger's Later Philosophy*, p. 13

م بۆ *Sein* داناوە، کە بوونە بەگشتی و بنەڕەتی دازاین و هەبووەکانیشە. بەڵام زاراوەیەک بەکوردی بۆ *Seyn* نادۆزینەوە. ناچار، بۆ ڕوونکردنەوەی واتاکەی و جیاوازی ئەم بوونە لەگەڵ *Sein* دا پەنا بۆ شوبهاندن دەبەم. زاراوەی(*Sein*)، کە جێگەیەکی گرنگی لە قۆناخی یەکەمی بیرکردنەوەی هایدیگەردا داگیرکردووە، وابەستە بە تێگەیشتنی (دازاین) ەوە لەواتای بوون لەسەردەمەکەیدا. ئەگەر ئاوڕێک لە مێژووی بیرکردنەوەبدەین، ئەو خاڵەمان بۆ ڕووندەبێتەوە، کە لەهەمموو سەردەمێکدا مێتافیزیکی زاڵبوو بووەبە کەلتووری بیرکردنەوە. دازاین لە ڕوانگەی مێتافیزیکی سەردەمەکەیەوە لەواتای بوون تێگەیشتوە. لەمێتافیزیکی ئەفلاتوندا(بوون) فۆرمەبەرزەکانە و لەسەدەکانی ناوەڕاستیشدا بووە بە دەستەڵاتێکی هۆشەکی و بەرز و لەسەردەمی تەکنەلۆجیشدا زەخیرەیەکی دانراو بۆ وەبەرهێنان. ئەم بۆچوونانە لەناوەڕۆکدا وەکو بۆچوون و لێکدانەوەی یۆنانیە کۆنەکانە بۆ واتای خۆر. بەڵام بوون *Seyn* لەم واتایانەوە جیاوازە.

سێیەم، هایدیگەر لەقۆناخی دووەمدا خۆی لە هونەر بەگشتی و هۆنراوە بەتایبەتی نزیکدەکاتەوە. ئایا هۆی نزیکبوونەوەکەی چیە؟ نائومێدی هایدیگەر لەگەڵ بارودۆخی رامیاری و تەکنەلۆجیدایە یان پەیوەندی بە ناوەڕۆکی هونەرەوە هەیە؟ لەوەڵامدا، هەردووکییەتی، لەقۆناخی دووەمی هایدیگەردا ڕووداندێکی ڕامیاری گرنگ هەیە، کە هایدیگەری نائومیدکردووەو هاوکات



ڕەنگدانەوەیەکی نەرێی لەسەر هایدیگەر بووە. ئەوڕووداوانەش سەرهەڵدانی نازییەکان و پەیوەندی هایدیگەرە بەم بزوتنەوەیەوە، کە لەدواییدا ڕوونیدەکەینەوە. هەروەها، نوسینەکانی هایدیگەر لەسەرهونەر پەیوەندییەکی بنەڕەتی بەناوەڕۆکی هونەرو تێگەیشتنی هایدیگەر لە هونەر و بەرهەمی هونەری هەیە.

## هەڵەی ڕامیاری هایدیگەر

یەکێک لەوکێشانەی لە قۆناخی دووەمدا یەخەمان دەگرێت هەڵوێستی ڕامیاری هایدیگەرە بەرانبەر نازییەکان، کە من لێرەدا بە(هەڵە) ی ڕامیاری ناوزەدم کردووە. ئەم کێشەیەش مشتومڕی زۆری لەسەر کراوە و هەندێک لە بیریاران هەوڵیانداوە هایدیگەر و بیرکردنەوە فەلسەفیەکەشی تاوانباربکەن و هەندێکیش بەرگری لێدەکەن و هەڵوێستی هایدیگەر بە هەڵەیەک دادەنێن نەک هەڵوێستێک پەیوەندی بەبیرکردنەوەی بوونگەرایەتی هایدیگەرەوە هەبێت.

لەمێژووی فەلسەفەدا هەندێک فەیلەسوف بۆ مەبەستی جیاواز خۆیان لەڕژێمی ڕامیاری سەردەمەکەیان نزیک کردۆتەوەو توشی هەڵەی ڕامیاری بوون. ئەفلاتون لەگەڵ (دایۆنیسێوس) ی پاشای(سیراکۆس) بوو تاکو ڕۆژێک لەسەر گفتوگۆیەکی فەلسەفی دایۆنیسێوس ئەفلاتونی کردبە کۆیلە و لەبازاڕدا فرۆشتی. ئەریستۆ لە ئەسکەندەری مەکدۆنییەوە نزیک بوو. پاش مردنی ئەسکەندەر نەیارەکان ویستیان ئەریستۆ بکوژن. سنیکا فەیلەسوفی کۆشکی(نیرۆن) بوو.

بۆئەوەی خۆی لە ڕامیارییە چەوتەکانی نیرۆن دوورخاتەوە خۆی کوشت. هیگڵ پشتگیری فریدریکی دووەمی کرد. لەڕۆژهەڵاتیشدا، بەتایبەتی لە جیهانی ئیسلامیدا، ئەلفارابی لەدەرباری سەیف ئەلدەولە بوو، ئیبن سینا لەمیری(سەمەنیەکان) وە نزیک بوو. من ئەم نموونانە م هێنایەوە تاکو خوێنەر بزانێت، کە مرۆڤ چەند گەورەبێت لەهەڵەکردن بەدەرنیە. ئینجا لێرەدا ئەوپرسیارە دەکەم ئایا هایدیگەر نازی بوو؟ ئەگەر(نازی) بوونی کەسێک لەوەدابێت بۆچەند مانگێک پەیوەندی بەم پارتە ڕامیارییەوە هەبێت، ئەوا هایدیگەر(نازی) بووە، ئەگەر(نازی) بوونیش شوێنکەوتنی ئایدۆلۆجی ئەم پارتە ڕامیارییە و پشتگیریکردنی بێت لەهەموو سیاسەتەکانی، هایدیگەر (نازی) نەبوو.

لە ١٩٣٣ پاش هاتنی نازییەکان بۆسەرحوکم سەرۆکی زانکۆی فرایبۆرگ لابرا. یەکێک لەو مامۆستایانەی لەهەڵبژارنەکەدا بۆ سەرۆکی زانکۆ هەڵبژێردرا هایدیگەر بوو. هەڵبژاردنی هایدیگەر بڕیاری هەموو مامۆستاکان بووە. ئەم هەڵبژاردنە لەکاتێکی ڕامیاری زۆر نالەباردابوو، بەبیروڕای من هەڵەی هایدیگەر لە هەڵبژاردنەکەیەوە بەسەرۆکی زانکۆ دەستپێدەکات. ئێمە، ئێستا دەتوانین ئەم حوکمە بدەین چونکە سیاسەتی نا- مرۆڤانەی نازییەکانمان بینی. ئەوکاتە لەسەرەتاوە ئەم سیاسەتە ئاشکرا نەبوو. نازییەکان داوای گۆڕانکاریی شۆڕشگێڕانەیان دەکرد. زۆرکەس لەسەرەتاوە دڵیان بەم داواکارییانە خۆش بوو،



بەڵام زوو، وەکو هایدیگەر، نائومێدبوون و پەشیمان بوونەوە. پاش وەرگرتنی سەرۆکایەتی زانکۆ، هایدیگەر کەوتە ژێر پاڵەپەستۆی وەزارەتی خوێندنی باڵاو یەکێتی خوێندکارانی نازی بۆ دەرکردنی مامۆستاجوەکان و سوتاندنی ئەوپەڕتووکانەی نازییەکان دژی دەوەستان. بۆکەم کردنەوەی پاڵەپەستۆکەو پاراستنی مامۆستا جوەکان و پەرتووکەکانی پەرتووکخانەی زانکۆ، هایدیگەر بڕیاریدا بچێتە نێو نازییەکانەوە و ئەوەندە دەستەڵاتی هەبێت زانکۆ و مامۆستاکان لەو گەندەڵییە بپارێزێت. پاش نۆ مانگ هایدیگەر زانی، کە کارەکەی بێسودەو ناتوانێت دەستەڵاتی خۆی لەژوور دەستەڵاتی ڕامیارییەوە دابنێت، وازی لەکارەکەی هێنا. نازییەکانیش سزایان داو ڕێگەیان پێنەدا لەوانەگوتنەوە بەردەوام بێت و ناردیان بۆ چاڵ هەڵکەندن. هایدیگەر لە چاوپێکەوتنێکدا ئەم ڕووداوە بەم شێوەیە دەگێڕێتەوە،

من نازانم چۆن. وەڵامم بۆ ئەم پرسیارە نیە. من دەتوانم بیسەلمێنم، کە ئەمە بوختانە. کاتێک بووم بەسەرۆکی زانکۆ توانیم دوو مامۆستای جو، پرۆفیسۆر(تانهاوسەر) سەرۆکی کۆلیجی پزیشکی و پرۆفیسۆر(ڤۆن هێڤس)، کە لەدواییداخەڵاتی نۆبڵی لەفیزیا وەرگرت، لەسەرکارە کانیان
بهێڵمەوە. وەزارەت داوای دەرکردنیانی کرد، بەڵام من داواکارییەکەی وازارەتم ڕەتدایەوە. ئەمەش ئەوە دەردەخات،

کە ناماقوڵە من ئەم دوو مامۆستایە لەشوێنی خۆیان دانێم و
لەگەڵ هوسرڵدا، کە مامۆستای منە بەناشرینی مامەڵەی لەگەڵدا بکەم. تانانەت ڕێگەم بەمامۆستا وخۆێندکارەکان نەدا دژی پرۆفیسۆر(تانهاوزەر) خۆپیشاندانیان هەبێت. [١٢]

نازییەکان ئەوەندە لە هایدیگەر ناڕازبوون تەنانەت یەکێک لەخوێندکارەکانی پێشوی، کە پاش وەرگرتنی دکتۆراکەی لەژێردەستی هایدیگەردا، لەوزانکۆیە کرابەمامۆستا و ناوی(دکتۆر هانکە) بوو، کرابوو بە سیخوڕ بەسەر هایدیگەرەوە. دکتۆرهانکە ڕێزی هایدیگەری مامۆستای دەگرت، بۆیە کە هایدیگەر وانەکانی لەسەر فەلسەفەی نیتشە دستپێکرد و دژی نازییەکان لەوانەکانیا دەدوا، دکتۆر هانکە خۆی ئاشکراکرد. داوای لە هەیدیگەر کرد، کە ئاگای لەخۆی بێت.
دێرشپیگل : کەواتە پارتی نازی تۆی لەژێرچاودێریدا دانابوو؟
هایدیگەر: دوایی زانیم، کەڕێگەشیان نەدەدا خوێندکارەکان ئاماژە بۆ نوسراوەکانم بکەن، بەتایبەتی بڵاوکراوەکانم لەسەر بیردۆزی ڕاستی لای (ئەفلاتون) و وانەکانم لەسەر (هۆڵدەرلن)، کە لە ساڵی ١٩٣٦ لە خوێندنگای (جێرمەنیک)

[124] مارتن هایدیگەر، گفتوگۆیەک لەگەڵ هایدیگەردا، وەرگێڕانی لەئینگلیزییەوە، د. محەمەد کەمال، کتێبی گیرفان ژمارە ٧١، دەزگای چاپ وپەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٥، لاپەڕە ٣٦



لە (ڕۆما) پێشکەشم کردن.
هەروەها لە گۆڤاری *Wille und Macht* لەلایەن یەکێتی لاوانی هیتلەرەوە بڵاوکرایەوە هێرشم کرایەسەر. ئەوانەی دەیانەوێت زیاتر لەم بارەیەوە بزانن دەتوانن ئەو ڕەخنانەش بخوێننەوە، کە لەگۆڤاری *Volk im Werden* لەساڵی ١٩٣٤ لەمن گیران. لەساڵی ١٩٣٧ ناوی منیان لەلیستی بەشداربوونی کۆنگرەی دێکارت لە پاریس دەرهێنا. [١٢٥]

دێرشپیگل : (کارڵ بارت) یش بۆ چاڵ هەڵکەندن بۆ سنوری سویسرا برا.
هایدیگەر : ئەمەسەیر ڕوویدا. سەرۆکی زانکۆ[مەبەست ئەوسەرۆکی زانکۆیەیە پاش لاچوونی هایدیگەر دانرا.] داوای کۆبوونەوەی مامۆستایانی کرد. گوتارێکی بۆ خوێندینەوە، کە تیایدا جەختی لەسەر ئەو خاڵەدەکرد جیاوازی لەنێوان بۆچوونی پارتی و ئەودانیە و بڕیارەکانی ئەو بڕیارەکانی پارتین. لەوێدا مامۆستاکانی کرد بەسێ دەستەو تاقمەوە: دەستەی یەکەم ئەو مامۆستایانە بوون، کە دەبوایە وازیان لە

کارەکەیان بهێنایە. دووەم، ئەوانەی تاکو ڕادەیەک نەک بەتەواوی دەتوانن مامۆستایەتی بکەن و دەرناکرێن. سێیەم ، ئەومامۆستایانەی لەجێگای خۆیاندا دەمێننەوە و

[125] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٤٠- ٤١

دەرناکرێن. ئەوماموٚستایانە، کە دەبوایە بەتەواوی وازیان لە مامۆستایتی بهێنایەو دەرکران(هایدیگەر و ڕێنەر) بوون. لەزستانی١٩٤٤- ١٩٤٥پاش گەڕانەوەم لە چاڵ هەڵکەندن کۆڕێکم لەسەر(شێعرونوسین وبیرکردنەوە) بەست. بیری ئەم کۆڕە بەردەوامیەک بوو لەبیری نێو وانەکانم لەسەر(نیتشە) و دژوەستان بوو بەرانبەر پارتی نازی.[126]

بێگومان ئەوان لەگەڵ بیروڕافەلسەفیەکانی هایدیگەردا هاوڕانەبوون هەڵەڕامیارییەکەی هایدیگەریان کردبەداردەستێک بۆ ڕەخنەگرتن لەهایدیگەرو ناوزڕاندنی ئەم فەیلەسوفە، کە بۆپاراستنی زانکۆکەی خۆی توشی ئەوهەڵەیەکرد و، زووش خۆی لێ ڕزگارکرد. ئەوانەی دژی هایدیگەرن تەنیا هەڵەکەی هایدگەر دەبینن و ناڕواننە ئەو بارودۆخ و سزادانەی هایدیگەر تێیداژیا. نابینن چۆن نازییەکان مامەڵەیان لەگەڵ هایدیگەرداکردووەو زینیان پێگەیاندووە. هانا ئارنت، کە خوێندکارێکی هایدیگەر و کچە جولەکەیەک بوو لەگەڵ هایدیگەردا یەکدیان خۆشدەویست لەنامەیەکدا ڕەخنە لەهایدیگەر دەگرێت، گوایە هایدیگەر پەیوەندییەکۆمەڵایەتیەکانی خۆی لەگەڵ هاوڕێ و خوێندکارە جوەکاندا بڕیوە. هایدیگەر لەنامەیەکدا لەزستانی ١٩٣٣ دا لەنامەیەکدا بەم شێوەیە وەڵامی

[126] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٤٢- ٤٣



دەداتەوە.[127]

ئەوەی تۆ باسیدەکەیت و بیستوتە بوختانە.

...........

من ئێستا ڕوخسەتم وەرگرتووەو لەزانکۆنیم پێش ڕوخسەتەکەم خەڵکم ئاگادارکرد، کە دەمەوێت تەنیابم و هیچ پڕۆژەیەک وەرناگرم.

ئەوخوێندکارەی ئێستالامەو دەیەوێت دکتۆراکەی لەگەڵ مندابکات جولەکەیە.

ئەوخوێندکارەی هەموو مانگێک دێتەلام و ڕاپۆرت لە بارەی نامیلکەکەیەوە پێشکەش دەکات جولەکەیە.

ئەوخوێندکارەی هەفتەی پێشو نوسراوەکەی بۆناردم بیخوێنمەوەو سەرنجی خۆمی بدەمێ جولەکەیە.

ئەو دووخوێندکارەی(نۆت گیماین شافت) من لەزانکۆ جێگەم بۆ وەرگرتن جولەکەن.

ئەوخوێندکارەی لەڕێگەی منەوە زانکۆ بۆخوێندن بۆ ڕۆما ناردی جولەکەیە.

ئەوەی من بە نازی و دژی جولەکە دادەنێت بابێت ئەم کارانە بکات.

[127] هانا ئارنت(١٩٠٦-١٩٧٥) فەیلەسوفێکی ژنە و خویندکاری هایدیگەر بوو. لەگەڵ هایدیگەردا تاکو کۆتایی ژیانیان یەکدییان خۆشدەویست و پەیوەندییان هەبوو. هانا پاش هاتنی نازییەکان، وەکو زۆر ڕۆشنبیری جو بۆ ئەمەریکا کۆچی کرد و لەوێ ژیا. نامەکانی نێوان هایدیگەر و هانا چەندجارێک بەپەڕتووک بڵاوکراونەتەوە.

بێجگە لەمەش من دەساڵ لەمەوبەر لەزانکۆی ماربۆرگ
لەگەڵ جولەکەدا چۆن بووم، ئێستاش وام و نەگۆڕاوم.
ئەی پەیوەندیم لەگەڵ هاوڕێکانم(وەکو، هوسرڵ، مێش،
کاسیرەرو ئەوانی دی).[128]
لەسەرو ئەمانەشەوە پەیوەندیم لەگەڵ تۆدا تێکنەچووە.[129]

ئەوانەی لەژێر دەستی هایدیگەردا خوێندوویانە و ڕێزێکی زۆریان بۆ مامۆستاکەیان داناوە و ئەمرۆجێگایەکی دیاریکراویان لە جیهانی فەلسەفەدا هەیە، وەکو هەربەرت مارکۆز، هانا ئارنت، کارل لویس، هانس جوناس جولەکەن و هایدیگەر بە (نازی) لەقەڵەم نادەن. تەنانەت گادەمارو ڕۆتری و شومان و لێوناردو پوگلەرو دێریدا هەڵوێستەکەی هایدیگەر بەهەڵەیەکی ڕامیاری دادەنێن و هایدیگەر ناخەنە نێو بەرەی نازییەوە.[130]

لەپێشتر باسمانکرد، کە هایدیگەر، بۆ پاراستنی زانکۆکەی بووبەئەندامی پارتی دەستەڵاتمەدار. بەڵام ئەندامێتی ئەو

[128] ئەم هاوڕێیانەی هایدیگەر جولەکە بوون.

[129] Ursula Ludz (ed.). *Letters 1925-1975: Hannah Arendt and Martin Heidegger*, New York: Harcourt Inc. 2004. P. 52

[130] Iain D. Thomson. *Heidegger on Ontotheology*, Combridge : Combridge Universty Press, 2005. P. 80



تەنیا بەناو بوو، چونکە بیروباوەڕی ڕامیاری و فەلسەفی ئەو(نازی) نەبوو. ئەندامێتی یان ئەو هەڵەڕامیارییە بۆ بەرژەوەندی زانکۆکەی بوو. نازییەکانیش لە سەرکێش و بیرکردنەوەی سەربەخۆی هایدیگەر ناڕازبوون و هایدیگەریان بە یارودڵسۆزی خۆیان دانەدەنا. بۆیە پەیوەندی نێوان هایدیگەر و دەستەڵات لە (نۆ) مانگ زیاتری نەخایاند. پاش وازهێنانی هایدیگەر لەسەرۆکایە تی زانکۆ لەسەر ئەوەی بەوە ڕازی نەبوو مامۆستاجوەکان لەزانکۆ دەربکات، هایدیگەر سزادرا. لەسەرۆکی زانکۆ و مامۆستای فەلسەفەوە کرابە زەحمەتکێش و بۆچاڵهەڵکەنین ڕەوانەی سنووری سویسراکرا. پاش ڕوخاندنی نازییەکان جارێکی دیکە هایدیگەر بەتاوانی بوون بەنازی سزادرایەوە و تاکو ساڵی ١٩٥٠ ڕێگەی پێنەدرا لەزانکۆ وانە بڵێتەوە. ئەوانەی لەم کاتەشدا بەرگرییان لە هایدیگەر کرد چەند بیریارو خوێندکارە جوەکانی هایدیگەر بوو. ئەم ڕووداوە ئەوەندە ئازاری هایدیگەری دا، کە بۆماوەیەکی زۆر توشی نەخۆشی دەروونی کرد و نزیکەی دەساڵیش لەژوورێکی بچوکی نێو دارستانێکدا بەتەنیا ژیاو کەسانێکی کەم دەیانتوانی ببینن.[131]

[131] هایدیگەر لەساڵی ١٩٤٥ لەزانکۆ دەرکرا
ولەسەرهەڵەڕامیارییەکەی ڕێگەی پێنەدرا وانەبڵێتەوە و لەئاکامدا توشی نەخۆشی مێشک بوو. لەساڵی ١٩٥٠ مافی وانە گوتنەوەیان دایەوەو لەساڵی ١٩٥١ کرابە پرۆفیسۆری فەخری.

پێویستە ئەوخاڵەش بخەینەبەرچاو، کە هەندێک نوسەر هەوڵیانداوە بەنازیبوونی هایدیگەر بە بیرکردنەوەی فەلسەفی هایدیگەرەوە ببەستنەوە. ڤیکتۆر فاریاس لە پەرتووکەکەیدا بەناوی *Heidegger and Nazism* جەخت لەسەر پەیوەندی نێوان ئایدیۆلۆجی نازییەکان و فەلسەفەی هایدیگەر دەکات.[١٣٢] ئایا چی پەیوەندییەک لەنێوان ئایدیۆلۆجی نازییەکان و فەلسەفەی هایدیگەردا هەیە؟ بەبیروڕای من هەوڵدانەکەی ڤیکتۆر فاریاس بۆ سەپاندنی ئەم پەیوەندییە لە هەوڵدانی ئەوبیریارانە دەچێت، کە ویستیان فەلسەفەی نیتشە بکەن بەئایدیۆلۆجی نازییەکان. هایدیگەر لەئاستی ئەم بیریارانەدا و دژی هەوڵدانەکەیان چەند وانەیەکی لەسەرفەلسەفەی نیتشە لەساڵەکانی ١٩٣٦- ١٩٤٠ لە زانکۆ پێشکەشکرد. لەو وانانەدا بەئاشکرا دژی نازییەکان دەدوێت و دەیەوێت فەلسەفەی نیتشە لە و تاوانە دوورخاتەوە.[١٣٣] چۆن دەگونجێت هایدیگەر، کە هەوڵدەدات نیتشە و فەلسەفەکەی لە و تاوانە بپارێزیت و بەرگریلێبکات خۆی بەو تاوانەدا بڕوات و بێدەنگ بێت؟ هایدیگەر خۆی دەڵێت، (بیری ئەم کۆڕە بەردەوامییەک بوو لە بیری نێو وانەکانم لەسەرنیتشە و دژوەستان بوو

[132] ئەم پەرتووکە ڤیکتۆر فاریاس بەزمانی فەرەنسی لەساڵی ١٩٨٧ بڵاویکردەوە ولەساڵی ١٩٨٩ و پۆل باریل وەریگێڕا بۆ ئینگلیزی.

[133] بڕوانە : د. محەمەد کەمال، نیتشە و پاش تازەگەری، دەزگای سەردەم سلێمانی٢٠٠٦ لاپەرە ١٩٥- ٢٠٠.



بەرابنەر پارتی نازی.)[١٣]

بێجگەلەمە، شیکردنەوە بوونگەرایەتیەکەی بوونی مرۆڤ لە(بوون و کات) دا، کە باوەڕێکی نەگۆڕی هایدیگەرە بەبوونی مرۆڤ و لە قۆناخی دووەمیشدا هایدیگەر نکۆڵی لەم باوەڕەی نەکردووە، دژی ئایدۆلۆجی ڕامیاری نازییەکانە. لەم شیکردنەوەیەدا جەخت لەسەربوونی ڕەسەن و دامەزراندنی پڕۆژەکانی بوون کراوە. بۆ هایدیگەر، مرۆڤ دەبێت خاوەنی پڕۆژەکانی بوونی خۆی بێت و هەوڵبدات بەو ناوەڕۆکەی بگات، کە خۆی دەیەوێت. مرۆڤیش(دازاین) خۆیەکی هەمەکی هیگڵی نیە و خۆی تاکە کەسە. هەموو چەمکێک، وەکو چەمکی خۆی هەمەکی لەژوور خۆی هەندەکی تاکەکەسەوە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی ناڕەسەنی و نامۆیی. خۆی هەمەکی خاوەنی بەهای هەمەکی و نەگۆڕە و ڕێگەی سەرهەڵدانی جیاوازییەکانی نێوان تاکەکان دەبەستێت و نامۆیان دەکات. بزوتنەوەی ڕامیاری نازییەکان باوەڕیان بەجیاوازی نێوان تاکەکان نەبوو. کەلتوورێکی ڕامیاری بازاڕییان هێنایە کایەوە، کەهەموو تاکێک دەبوایە وازی لە تایبەتمەندێتی بوونی خۆی بهێنایە و شوێن ئەوکەلتووره ڕامیارییە بکەوتایە. ئەم شێوەی بوونە بۆ هایدیگەر ناڕەسەنانە و نامۆبوونە، کە بە

[134] مارتن هایدیگەر، چاوپێکەوتنێک لەگەڵ هایدیگەردا، وەرگێڕانی لەئینگلیزییەوە د. محەمەد کەمال، کتێبی گیرفان ژمارە ٧١، لاپەڕە ٤٣

دریژایی تەمەنی دژی وەستاوە. هەروەها، هایدیگەر، هەرچەندە ڕەخنەی خۆی لەسەر مارکسیزم هەیە و بە فەلسەفەی سەربەنەرێتی مێتافیزیکی تەکنەکلۆجی دادەنێت، هێشتا لەوباوەڕەدایە تەفسیری مارکس بۆ مێژوو باشترینە و بیریاران نەیانتوانیوە تێپەڕیبکەن.[١٣٥]

ئایا بیریارێکی نازی دەتوانێت بەم جۆرە تەماشای تەفسیری مارکسی بۆ مێژووبکات؟ خاڵێکی دیکەی گرنگ بۆ بەرگریکردن لەبیرکردنەوەی فەلسەفی هایدیگەر و پاراستنی لەو بوختانە، باسکردنی کێشەی(جیاوازی) یە لەفەلسەفەی هایدیگەردا. جیاوازی کە بنەمایەکی ئۆنتۆلۆجی لەبوونی مرۆڤداهەیە، زاراوەیەکی فەلسەفی سەرەکییە لەبیروباوەڕی هایدیگەردا. ڕەسەنیەتی بوون بەبێ جیاوازیسەرهەڵنادات . تاکیجیاواز رەسەنە. جیاوازی تاک رەسەنیەتی ئەو تاکە سەقامگیر دەکات و بە(تایبەت) دایدەنێت. لەفەلسەفەی هایدیگەردا تاکەکان لەیەکدی دەچن(Same) بەلام لەجیاوازی (Difference) بێبەش نین. ۆنوسراوەکەی هایدیگەر *Identity and Difference* ، کە لەساڵی ١٩٥٧ نوسراوە، جەخت کردنە لەسەر ئەم شێوە لێکچون و جیاوازییە و بەبیروڕای من ڕەهەندێکی ڕامیاری هەیە. هایدیگەر نایەوێت جیاوازییەکان لەناوبچن، یان باشتروایە بڵێین، کە بە بۆچوونی فەلسەفی ئەو (جیاوازی)

135 Martin Heidegger. “Letter on Humanism”, in *Basic Writings*, p. 243



ڕاستەقینەیەکی زەقەو نابێت فەرامۆش بکرێت. لێکچونیش بەتەواوی و بەبێ جیاوازی مەحاڵە. لەبوارێکی ڕامیارییدا دەستەڵاتێک هەوڵی گەیشتن بەلێکچونێکی تەواو بدات و جیاوازییەکان بسڕێتەوە، ئەو دەستەڵاتە دەبێت بەداگیرکەرو چەوسێنەر و تاکەکانی کۆمەڵ نامۆدەکات. ئایدیۆلۆجی نازییەکان لەم ڕەهەندە نالەبارە بێبەش نەبوو. نازییەکان دەیانویست لەنێو ڕژێمە ڕامیارییەکەیاندا جیاوازییەکان سەرکوت کەن و لێکچونێکی ڕووتکراوە بەسەرهەموو لایەنێکی ژیاندا بسەپێنن. تەنانەت ڕژێمەکە بڕیاری لەسەر هەڵبژاردنی هونەرو زمان و ڕەنگەکانیش بۆ خەلکی دەدا. ئەم جۆرە ئایدیۆلۆجی و شێوەی بوونە لە فەلسەفەی هایدیگەردا جێگەی نابێتەوە.

## لەبیرچوونی بوون و هیچگەرایەتی و ئاکامە نەرێکانی

هایدیگەر تێگەیشتن و تەفسیری خۆی بۆ مێژووی گەشەکردنی بیرکردنەوەی فەلسەفی هەیە. ئەم مێژووە، لەسەردەمی ئەفلاتونەوە بە لەبیرچوونی بوون دادەنێت. لەبیرچوونی بوون و گەڕانەوەی توێژینەوە فەلسەفیەکانیش بۆ ڕاستەقینەیەکی لە(بوون) کەمتر ولەسەر(بوون) ڕاوەستاویش بیرکردنەوەی فەلسەفی بەرەو هیچگەرایەتی و چەند ئاکامێکی نەرێ دەبات، کە لێرەدا ڕوونیانیاندەکەینەوە.

بۆ هایدیگەر گەورەترین پرسیاری فەلسەفی سەبارەت واتای بوونە.[١٣٦] ئەم پرسیارە سەرچاوەو بناخەی پرسیارەکانی دیکەیە، چونکە(بوون) سەرچاوەی هەمووشتێکە و هەبووەکانی لەسەرڕادەوەستێت. بنەڕەتێکی لەبنەڕەت بەدەرە، کە لەهەمووشتێک زیاتر لێمانەوە نزیکە و هێشتا لەبیرکردنەوەی فەلسەفیدا خراوەتە پەراوێزەوە و بە(هیچ) دانراوە و لەبیرچۆتەوە. لەبیرچوونەوەی بوون بەدرێژایی مێژووی فەلسەفە لە ئەفلاتونەوە بۆ نیتشە بۆتەهۆی نامۆبوونی بیرکردنەوە لەڕاستەقینەو بنەڕەتی خۆی. هایدیگەر لەپەڕتووکی(بوون و کات) دا سێ هۆکاری بۆ لەبیرچوونی بوون داناوە، کەلەبەشی دووەمی ئەم پڕۆژەیەدا ڕوونمان کردۆتەوە. لەم قۆناخەشدا لەئاکامەکانی لە بیرچوونەکە دەدوێین. لەبیرچوونی بوون لەئەفلاتونەوە سەرەتای سەرهەڵدانی شێوازێکی دیکەی مێتافیزیکەو بەناوەڕۆکگەری Essentialism ناسراوە. بەدیدی ئەفلاتون ڕاستەقینە(بوون) نیە، کۆمەڵێک فۆرم (ئایدیا) ی هەمەکی بەرزن و ئەو فۆرمانەش(ناوەڕۆکی) هەمووشتێکن وهیچ شتێک بەبێ ئەوان نیەونابێت.

ناوەڕۆکگەرایەتی لەمێژووی فەلسەفەدا لەئەفلاتونەوە بووەبە فێرگەیەکی فەلسەفی دامەزراو و دژی فێرگەی بوونگەرایەتی هەوڵی پێشخستنی سیستەمە

[136] Martin Heidegger. *Contributions to Philosophy (From Enowning)*, p. 5



مێتافیزیکییەکەی داوە.

ئەم فێرگەیە، بەبیروڕای هایدیگەر، بەنیتشە کۆتایی دێت.[١٣٧] چۆن ناوەڕۆکگەرایەتی دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی هیچگەرایەتی؟ وەڵامی ئەم پرسیارە بەبیروڕای هایدیگەر بەستراوە بە وەڵامدانەوەی گەورەترین پرسیاری فەلسەفی سەبارەت بە(بوون). ئایا(بوون) چیە؟ بوون(هیچ) ە *Nihil* و ئەوەی هەیە ناوەڕۆکە لە شێوەی فۆرمە هەمەکییەکان، ویستی ژیان یان ویستی هێز بۆ نیتشە. بڕیاردان لەسەر(بوون) بە(هیچ) دامەزراندنی بناخەی جۆرە مێتافیزیکێکە بەناوی هیچگەرایەتی. لەم ڕووەوە، هیچگەرایەتی و ناوەڕۆکگەرایەتی دووناون بۆ شێوەیەک بۆچوونی مێتافیزیکی. بیرکردنەوەی هایدیگەر بەرانبەر ئەم شێوەمێتافیزیکە نەرێیە (نێگەتیڤە) و ڕەتیدەداتەوە[١٣٨]. هیچگەرایەتی، بۆ هایدیگەر، شێواندنی(ڕاستی) و(تاریکبوونی جیهانە).[١٣٩] چونکە ئاکامی لەبیرچوون و لە پەراوێز دان نی ڕاستەقینەوە پەیدابووە. بارودۆخی نامۆبوونی بیرکردنەوەی فەلسەفیە لەوڕاستەقینەیەی بە

[137] هەمان سەرجاوە، لاپەرە ٧٨. هەوەها بروانە:

Martin Heidegger. *Nietzsche*, vol.4, pp. 4-5

[138] Martin Heidegger. *Contributions to Philosophy* , p.79

[139] Martin Heidegger. *An Introduction to Metaphysics*, translated by Ralph Manheim, New York: New York State Univestiy Press, 1987. P. 38

(هیچ) دانراوە و بایەخی پێنەدراوە، کە لەکاتێکدا بیرکردنەوە بەبێ ئەوڕاستەقینەیە ڕوونادات. کەوابوو، هیچگەرایەتی، لەم بۆچوونەوە، دانانی بنەڕەتە بە (هیچ). ڕەتدانەوەی ڕاستەقینەی بوون و ڕاوەستانی بیرکردنەوەیە لەسەر جۆرێک(هەبوو)، کە ئەو هەبووەش پێویستی بەڕاستەقینەی بوونە و لەسەری ڕادەوەستێت. لەهیچگەرایەتید، بیرکردنەوە بناخەی خۆی بە(هیچ) دادەنێت و بەو (هیچ) ەوە خۆی ڕاگیردەکات. بۆچی هایدیگەر نیتشە بەدوا بیریاری هیچگەرایەتی دادەنێت و وەکو شوێنکەوتوویەکی نەریتی مێتافیزیکی ئەفلاتونی تەماشایدەکات؟ بۆ گەلێکمان ئەم بۆچوونەی هایدیگەر گومانلێکراوە، نیتشە بەئاشکرا ڕەخنە لە هەڵوێستە هۆشگەرایەتیەکەی ئەفلاتون دەگرێت و دژی ڕادەوەستیت. لەچی ڕوویەکەوە هایدیگەر دەڕوانێتە پەیوەندی نیتشە بە ئەفلاتونەوە؟ وەکو باسمکرد، پێناسکردنی هیچگەرایەتی لە لایەن هایدیگەرەوە وابەستە بە لەبیرچوونی بوون یان دانانی بوون بە هیچ و گەڕانەوە بۆ سەرچاوەیەکی مێتافیزیکی دیکە. ئەگەر مێتافیزیک لەئەفلاتونەوە خرابێتەگەڕ، ئەوا ئەفلاتون یەکەم بیریاری هیچگەرایەتییە، نەک لەبەرئەوەی بوونی (سەدەمێکی هۆشەکی) و مەبەستێکی لەپێشتر بۆجیهان ڕەتدەداتەوە، بەڵکو ئەفلاتون (بوون) بەبنەڕەت و سەرچاوە دانانێت. بۆ دامەزراندنی بنەڕەت دەگەڕێتەوە بۆ فۆرمە هەمەکییە بەرزەکان و بوون لەبیردەکات. لەکاتێکدا، ئەگەر ئەم فۆرمە بەرزانەش هەبن و دروست بن، هێشتا بۆ بوونیان پێویستیان



بە(بوون) ە.

بەدرێژایی مێژووی فەلسەفە ئەم هەڵوێستەی ئەفلاتون بەشێوازی جیاواز چەند جارێک سەریهەڵداوەتەوە. دواجاریش نیتشە خۆی لەقەرەی ئەم کێشەیە داوەتەوە وازی لە (بوون) هێناوەو (ویستی هێز) ی بەبناخە وناوەڕۆکی هەمووشتێک داناوە. هەرچەندە ویستی هێز، وەکو فۆرمە هەمەکییەکانی ئەفلاتون لەجیهانێکی بەرزی ئەو دیو هەستکردنەوە نیە، هاوکات (هەبوو) یە و لەسەر (بوون) ڕادەوەستێت. ویستی هێز بنەڕەتێکی لەبنەڕەتبەدەر نیە، کەچی بەدوا ڕاستەقینەو ڕاستی بوونیشی بە(هیچ) داناوە. لەلای ئەفلاتونیش فۆرمە هەمەکییە بەرزەکان دوا ڕاستەقینە و ڕاستیە دوورەکانن. هەمووشتێک بەمانەوە گرێدراوەو(بوون) یش ، کە بنەڕەتی فۆرمەکانیشە باسنەکراوە.

سەردەمی ئێمە لەڕووی زانستیەوە زۆرکەس بەسەردەمی تەکنەلۆجی دادەنێت. سەردەمی تەکنەلۆجی بەبیروڕای هایدیگەر بناخەی مێتافیزیکی خۆی هەیە. ئەگەر مێتافیزیک ئۆنتۆلۆجی بێت، هیچ سەردەمێک و هیچ بەشێکی ئۆنتۆلۆجی(سروشت و مێژوو) لە تێڕوانینی مێتافیزیکیانە بەدەرنیە. سەردەمی تەکنەلۆجی ئەمڕۆشمان خاوەنی تێڕوانینی مێتافیزیکیە. ئەو مێتافیزیکەش (هیچگەرایەتی) یە، چونکە تەکنەلۆجیا، کەلەدواییدا باسیدەکەین، دیسانەوە بوون فەرامۆش دەکات و

بەڕاستەقینەیەکی دیکەی دادەنیت. ئایا ئاکامە نەرێکانی هیچگەرایەتی چین؟ لەچی روویەکەوە هیچگەرایەتی یان لەبیرچوونی بوون نەرێیە؟ لەساڵی (١٩٣٥) ەوە هایدیگەر لەچەند نوسراوێکدا لایەنە نەرێکانی هیچگەرایەتی روونکردۆتەوە. لەنوسراوەکەیدا Letters on Humanism لەبیرچوونی بوونی بە دوورکوتنەوە لە وڵات و بێوڵاتی و مەنفا داناوە. لەنوسراوێکی دیکەدا لەبیرچوونی بوونی بە (تاریکبونی جیهان) ناوزەددەکات. لەهەمان نوسراودا چوار ئاکامی نەرێ دەستنیشاندەکات:

١- هەڵهاتنی خواکان.
٢- ڕوخاندنی زەمین.
٣- سەرهەڵدانی نارەسەنی.
٤- زۆربوونی کەسانی پلە مامناوەندی.[140]

هەرچەندەهایدیگەر وشەی(خواکان) ی بەکارهێناوە، بڵامەبەستی لەبەستێنی ئاینییەوە دوورە و مەبەستی لادان لەبیروباوەڕی ئایینی و گەڕانەوە بۆ بێبڕوایی نیە. هەروەها وشەی (خواکان) کۆیەو ئاماژە بەچەند خوایەک دەکات نەک خوایەکی تاک و تەنیا و خاوەن دەستەڵاتێکی ڕەهای هەندێک لە ئایینەکان. ئەم وشەیەش هێمایەکە و ئاماژە بۆ جۆرێک لەبوونی دازاین یان ئەو شێوازە ڕەسەنەی

[140] هامان سەرچاوە، لاپەڕە٤٥. زاراوەی(مامناوەندی) یم بۆ (mediocre) ی ئینگلیزی داناوە.



بوون دەکات، کە خاوەنی دەستەڵاتی داهێنانە و دەتوانێت ناوەڕۆکی دابهێنێت. (داهێنان) خەسڵەتێکە لای هایدیگەر بوونە ڕەسەنەکان و لای نیتشە سوپەرمانەکان (مرۆڤە بەرزەکان) و لەنێو ئاینیشدا تەنیا(خواکان) هەیانە[141]. هەڵهاتنی خواکان، لەم بۆچوونەوە، لە ناوبردنی دەستەڵاتی داهێنانی مرۆڤە. ئەم لەناوبردنەش ڕاستەوخۆ پەیوەندی بەخاڵی (٣) و (٤) ی ئاکامە نەرێکانەوە هەیە، کە لەسەرەوە ڕیزمانکردوون. هەڵهاتنی مرۆڤی ڕەسەن و داهێنەر جێگە بۆ سەرهەڵدانی بوونی نارەسەن خۆشدەکات. کۆمەڵێک لە تاکە پلە مامناوەندییەکان پێکدەهێنێت. ئەم سێ ئاکامە (١،٣،٤ ) پەیوەندی بەو کاریگەرێتیەوە هەیە، کە هیچگەرایەتی بەسەر بوونی مرۆڤەوە جێدەهێڵێت. لەئاکامی (٢) دا کاریگەرێتییەکە بەسەر (زەمین) یان ژینگەی مرۆڤدا داسەپاوە. هیچگەرایەتی، بەتایبەتی هیچگەرایەتی سەردەم، کە لە بیرکردنەوەی مێتافیزیکی تەکنەلۆجیادا بەتەواوی بەرجەستە بووە ژینگەی شێواندووە و بۆتە هۆ بۆ ڕووخاندنی زەمین.

## هیچگەرایەتی و ناوەڕۆکی تەکنەلۆجیا

[141] لەبەرئەوەی (داهێنان) پرۆسەی پەیداکردنە لە نەبوونەوە بۆ بوون، لەنێو ئایینەکانداخەسڵەتێکی یەزدانییە و تەنیا خوا خاوەنی ئەم دەستەڵاتەیە، ئە مەش هۆکارێکە بۆ دژوەستانی ئیسلامخوازە توندڕەوەکان بەرانبەر هونەر.

توێژینەوەکەی هایدیگەر لەسەر تەکنەلۆجیا سەبارەت بەکێشەی پێشکەوتنی زانست و پیشەسازی نیە. هەوڵدانێکە بۆ ناسینی (ناوەڕۆک) ی تەکنەلۆجیا و لەچیەتی تەکنەلۆجیا دەکۆڵێتەوە. توێژینەوەش سەبارەت بەناوەڕۆک یان چیەتی شتێک بە ئۆنتۆلۆجیا یان بیرکردنەوەی مێتافیزیکمانەوە گرێدە دات. لەبەرئەمەشە توێژینەوەکەی هایدیگەر ئۆنتۆلۆجیانەیەو تەکنەلۆجیا بە نەریتێکی زاڵبوی مێتافیزیکی سەردەمەکەمان دادەنێت، کە لە بەر ڕۆشنایی ئەم نەریتەدا مرۆڤی سەردەم لە واتای بوون و خۆی دەگات. دیسانەوە ئاماژە بۆ ئەوخاڵە دەکەم، کە هایدیگەر ڕەگوڕیشەی ئەم نەریتە میتافیزیکییەی تەکنەلۆجیا بۆ ئەفلاتون دەگەڕێنێتەوە. میتافیزیکی ئەفلاتون بەدیدی ئەم، میتافیزیکی بەرهەمهێنەرە.[142] لەمێتافیزیکی ئەفلاتوندا جیهانی ئێمە ساختەیەو لە ڕاستەقینەوە دوورە. ڕاستەقینەش لە فۆرمە هەمەکییە بەرزەکان پێکهاتووە. جیهانی ئێمە لە دوو ڕووەوە ساختەیەو زاراوەی (ساختە) ش دوو واتای هەیە. هەردوو واتاکە وابەستن بە دووجۆر پەیوەندی نێوان جیهان و فۆرمە بەرزەکان. یەکەم، شتێک بەساختە دادەنرێت، کە ڕەسەن نەبێت و لەشتەڕەسەنەکەوە وەرگیرابێت. ئەگەر تابلۆیەکی مۆنالیزا لەبازاڕدا بدۆزینەوە و هونەرمەندێک لە تابلۆ

[142] Michael E. Zimmerman. *Heidegger's Confrontation with Modernity: Technology, Politics, Art*, Bloomington: Indiana University Press, 1990. P.168



ڕەسەنەکەوە وەریگرتبێت، ئەگەر هونەرمەندەکە لە وەرگرتنەوەکەشیدا سەرکەوتوو بووبێت، هێشتا تابلۆکەی بەساختە دادەنرێت، چونکە تابلۆ ڕەسەنەکەی مایکل ئینجیلۆ نیە. لێرەدا پەیوەندی نێوان تابلۆی مۆنالیزای مایکل ئینجیلۆ و هونەرمەندەکە ی دیکە، وەکو پەیوەندی نێوان شتێکی ڕەسەن و لێوەرگیراو وایە. جیهانیش لە مێتافیزیکی ئەفلاتوندا ساختەیەو لێوەرگیراوی جیهانە بەرزەکەیە. (ساختە) ش واتای دروستکراو، دامەزرێنراو، بەرهەمهێنراو دەبەخشێت. جیهان بەرهەمهێنراوەو لە شێوەی فۆرمەهەمەکییە بەرزەکاندا شۆڕاوەتەوە. ئەم بۆچوونە مێتافیزیکییەش بوون دەکات بە سامان و زەخیرە بۆ بەرهەمهێنان لەبەردەستی ئێمەدا. ئایا لەچ ڕوویەکەوە ئەم کێشەیە نالەبارە؟ بۆچی هایدیگەر بەم جۆرە ڕەخنە لە ئەفلاتون و تەکنەلۆجیا دەگرێت؟ ئایا هایدیگەر باوەڕی بەگۆڕانی (سروشت) بۆ (جیهانێک) نیە مرۆڤ تێیدا ئاسودەبێت و ژیانی بەرەوپێشەوە بڕوات؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە پێویستە بۆ توێژینەوەکەی هایدیگەر لەسەر (ناوەڕۆکی) تەکنەلۆجیا بگەڕێینەوە و بزانین چۆن تەکنەلۆجیا هیچگەرانەیە و تێگەیشتنی هایدیگەریش لە تەکنەلۆجیا ڕووندەکەینەوە. هایدیگەر لەساڵی ١٩٤٩ چوار کۆڕی لە (یانەی برێمن) گرت، کەپەیوەندییان بە تەکنەلۆجیاوە هەبوو.[143] دوو کۆڕی یەکەمی پاش ساڵێک لە

[143] کۆڕەکانی هایدیگەر ئەمانە بوون:

ئەکادیمیای باڤێریا بۆ هونەرەجوانەکان گرتەوە. دووەمیان The Enframing دەستکاریکرد و لە ساڵی ١٩٥٣ بە ناوی *The Question Concerning Technology* بڵاویکردەوە. لەم نوسراوەدا لەبارەی ناوەڕۆکی تەکنەلۆجیاوە هایدیگەر ئەوخاڵە دەخاتە ڕوو، کە (تەکنەلۆجیا) ئەم زاراوە و نەریتە میتافیزیکییەی ئەمرۆ بەکاردێت پەیوەندی بە وشەی (تەکنەلۆجیا) وە نیە، کە لەزمانی کۆنی یۆناندا ئاماژەی بۆکراوە. بۆسەلماندنی بیروڕاکەی و هەڵوەشاندنەوەی واتای تەکنەلۆجی لەسەردەمەکەماندا بۆ زمانی یۆنانی کۆن و ڕەگوڕیشەی زمانەوانی و واتای وشەکە دەگەڕێتەوە. ئەم میتۆدەش بۆ ڕوونکردنەوەی گەلێک زاراوەی گرنگی فەلسەفی وەکو فیزیک، فینۆمینەو ڕاستی خراوەتەگەر و هایدیگەر بۆ مەبەستە فەلسەفیەکەی و سەلماندنی بیروباوەڕەکانی دایمەزراندوە. بۆنموونە، زاراوەی (فیزیک) *physika* لەزمانی کۆنی یۆناندا واتای (بوون) دەبەخشێت. بەڵام زاراوەکە لەسەردەمی ڕۆمانەکانەوە بووە بە(سروشت) و مێتافیزیکیش *meta ta physika* (ئەو دیو بوون) بووە بە ئەو دیوسروشت.[144] هەروەها لە (بوون و کات) دا واتای (فینۆمینە) لە زمانی یۆنانی و لە نوسراوەکەشیدا *On the Essence of Truth* واتای ڕاست *alêtheia* ڕووندەکاتەوە. زاراوەی

---

*The Thing, The Enframing, The Danger, The Turning.*

144 بڕوانە :

Martin Heidegger. "What is Metaphysice?" in *Basic Writings*, p. 106, and *An Intraduction to Metaphysics*, p. 13



تەکنەلۆجیا، کە لە دووبەش پێک هاتوە(تەکنە) و (لۆجیا) لەوشەی *Techne* ی یۆنانەوە هاتووە. بۆ یۆنانیەکانیش ئەم وشەیە هەر بۆ کارکردن و بەرهەمهێنانێکی پیشەسازی یان دەستی بەکارنەهێنراوە، واتاکەی کاروبەرهەمی هونەریشی گرتۆتەوە. هەمووبەرهەمێکی مرۆڤ لە بوارەکانی پیشەسازی و هونەرییدا بە(تەکنە) ناسراوە.[145]

هەروەها هایدیگەر دەڵێت:

یۆنانیەکان تاکو سەردەمی ئەفلاتون (تەکنە) یان بۆ زانین (ئەپستمە) ش داناوە. هەردوو زاراوەکە واتای زانینێکی بەرفراوانی بەخشیوە. ئەم جۆرە زانینە بوارەکان دەکاتەوە و شتەشاراوەکان دەردەخات.[146]

(تەکنە) شێوازێکی دەرخستنی ڕاستی بوونە و پەیوەندی بەهەمووچالاکییەکی مرۆڤانەوە بۆ دەرخستنی ئەو ڕاستیە هەیە. ئەمڕۆ ئەو واتایەی (تەکنە) شاراوەتەوەو بووە بە داردەستێک بۆ سەپاندنی دەستەڵاتی مرۆڤ بەسەر سروشتدا و ڕەوا بەو دەستەڵاتە بۆ بەکارهێنانی سروشت بەوجۆرەی مرۆڤ دەیخوازێت دەبەخشێت. تاکو ئێرە، ئەم بۆچوونە، کە لە فەلسەفە ئەنترۆپۆلۆجیەکەی هیگڵ و مارکسدا بووە بە کۆڵەکەی بیردۆزەی بەرهەمهێنان و گرێدانی بیردۆزە

---

145 Martin Heidegger. "The Question Concerning Technology", in *Basic Writings*, p. 318

146 هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٣١٩

بەکارکردنەوە کارێکی گونجاوە. مرۆڤ هەمیشە هەوڵیداوە سروشت بۆ ئەو جیهانە بگۆڕێت، کە خۆی دەیەوێت. بەڵام بۆچوونەکانی هیگڵ و مارکسیش لەو زەمینە مێتافیزیکییەوە هەڵقوڵاون، کە سروشت بە بێگانەو دەرەکی و ساختە دادەنێت و بە(مێتافیزیکی بەرهەمهێنەر) ناوزەدمانکرد. مێتافیزیکی بەرهەمهێنەر، کە لەئەفلاتونەوە دەستپێدەکات، سروشت بە دیاردەیەکی ساختە و دوور لە ڕاستەقینەوە دادەنێت نەک (وڵات) یان بەشێک لەو ڕاستەقینەیەی ئاگامەندی لەسەری ڕادەوەستێت. لەئاکامدا، بەتایبەتی لەسەردەمی تازەگەرییدا ئاگامەندی و سروشت بە دوولایەنی دژوەستاو دانران. سروشت بەهێزێکی بێگانەو هەڕەشەکەر دەبینرا. لەبەرئەمە، ئاگامەندی، بەتایبەتی بەو شێوەیەی هیگڵ و مارکس ڕوونیدەکەنەوە، هەوڵێکی بێتەقەلا بۆ داگیرکردن و گۆڕانی سروشت دەدات، کە بۆتە هۆی شێواندن و ڕووخاندنی ژینگە.

مەبەست لە تەکنەلۆجیا ئەو پێشکەتنە زانستیە نیە، کە مرۆڤایەتی توانیویەتی لەماکینەی هەڵمەوە خۆی بەچەک و سوتەمەنی ئەتۆمی بگەیەنێت. ئێمە لێرەدا باسی دەستکەوتە زانستیەکان ناکەین. دەمانەوێت لەناوەڕۆکی تەکنەلۆجیا تێبگەین. بۆ تێگەیشتنەکەشمان پێویستیمان بەبنەڕەتی مێتافیزیکیی تەکنەلۆجیا هەیە. توێژینەوەکەمان لەگەڵ ئەم پرسیارەدا ئایا ناوەڕۆکی تەکنەلۆجیا چیە؟ دەبێت بە فەلسەفی و بوارەکانی دیکەش دەگرێتەوە. بۆ وەڵامدانەوەکەشمان جارێکی دیکە



دەگەڕێینەوە بۆ شێوە مێتافیزیکیە زاڵبوەکەی سەردەممان، کەهایدیگەر بەهیچگەرایەتی دایناوە و بەبیروڕای ئەویش ئەم شێوە مێتافیزیکە لە ئەفلاتونەوە سەریهەڵداوە و بەنیتشە کۆتایهاتووە. نەریتی مێتافیزیکی زاڵبووی سەردەمەکەمان (هیچگەرایەتی)، (مێتافیزیکی بەرهەمهێنەر) یان تەکنەلۆجیایە. بەم جۆرە تەکنەلۆجیا، بۆ هایدیگەر، نەریتێکی مێتافیزیکیە نەک وەسیلەیەک بۆ بەرهەمهێنانی ئامێرێک. ئەوەش دەزانین، کە مێتافیزیک توێژینەوەیە سەبارەت واتا یان ڕاستی بوون. کەوابوو، تەکنەلۆجیا، بەپێچەوانەی تێگەیشتنی هەندێک، خۆی لەقەرەی ڕاستی بوون دەدات و ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەخات.

ئەگەر تەکنەلۆجیا هیچگەرایەتی بێت، ئەوا ڕاستەوخۆ دەزانین، کە (بوون) بۆ تەکنەلۆجیا (هیچ) ە. هەروەها، ئەگەر سەر بە مێتافیزیکی بەرهەمهێنەریش بێت، دەبێت (بوون) بە زەمینەیەکی بەپیتی بەرهەمهێنان دابنێت. لەهەردووحاڵەتەکەدا،بۆچوونی مێتافیزیکیانەی تەکنەلۆجیا دەبێت بە هیچگەرایەتی. لەحاڵەتی یەکەمدا بەئاشکرا(هیچ) بوونی بوون دەردەبڕێت و لەحاڵەتی دووەمیشدا، کە بەمێتافیزیکی بەرهەمهێنەر ناسراوە، ڕاستی بوون بۆ شتێکی (جیاواز) تر لەخۆی دەگەڕێنێتەوەو (بوون) لەبیر دەکات و ئاگامەندی و بوون لەیەکدی نامۆ دەکات. ناوەڕۆکی تەکنەلۆجیا لەبەر ڕۆشنایی لەبیرچوونی بوون و نامۆبوونی ئاگامەندی و دژ وەستانی دوولایەنەی ئاگامەندی

بوونەوە دەناسرێت. ناوەڕۆکێکە، لەگەڵ هەموو گۆڕانکارییەکاندا بەسەر زۆربوونی دەستەڵاتی داگیرکردنی سروشت لەسەردەمی ئەفلاتونەوە تاکو ئەمرۆ نەگۆڕاوە. چۆن نەریتی مێتافیزیکی ئەفلاتون تەماشای بوونی دەکرد بەم جۆرەش مێتافیزیکی تەکنەلۆجیای ئەمرۆ دەڕوانێتە بوون. ناوەڕۆکی هەموو سیستەمێکی مێتافیزیکیش وابەستە بە تێگەیشتنی ئەو سیستەمە لە ڕاستی بوون. ئەگەر ئێمە بزانین ئەوسیستەمە چ تەفسیرێک بۆ بوون دەکات ئەوا ناوەڕۆکەکەشی دەناسین. تەکنەلۆجیا، بێجگەلەوەی(بوون) بە هیچ دادەنێت داکەوتی بەردرستیش دەکات بەگەنجینەی بەرهەمهێنان و (وەبەرهێنان).[147] بۆ تەکنەلۆجیا (بوون) زەمینەی وەبەرهێنانە. دارستانێک، بۆنموونە، سامانێکی تەختەیە بۆپیشەسازی، چەمی سیروان گەنجینەیەکی وزەیە بۆکارەبا، منداڵانی ئەمرۆ نەوەی داهاتوون بۆ بەرهەم زیادکردن.

بۆ دامەزراندنی ئەم ناوەڕۆکەش میتافیزیکی تەکنەلۆجیا بوون بەگشتی (دەخزێنێتە نێو چوارچێوە) ی وەبەرهێنان و enframing یان *Ge- stell* بەگەنجینەی سامان بۆ سودلێوەگرتن بەکاریدەهێنێت.[148] ئایا لەچ ڕوویەکەوە خزانە نێو چوارچێوەی بوون بۆ وەبەرهێنان نەرێیە؟ ئایا

---

[147] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٣٢٤

[148] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٣٢٤



مرۆڤ مافی ئەوەی نیە جیهانێکی پڕ ئاسودە و پێشکەوتوو دامەزرێنێت؟ ڕاستە مرۆڤ ئەو مافەی هەیە بەڵام کێشە نەرێکە لە دووخاڵدا کۆدەبێتەوە:

یەکەم، مێتافیزیکی تەکنەلۆجیا مامەڵە لەگەڵ بووندا بەشێوەی سودلێوەرگرتن و قازانج دەکات. بوون بەوڕاستەقینەیە دانانێت، کە هەمووشتێکی لەسەر ڕاوەستاوە. ئەم تێگەیشتنە لەڕاستی بوون هۆی شێواندن و ڕوخاندنی ژینگەیەکی تەندروستە بۆ مرۆڤ. تێکشکاندنی ئەستوری پەردەی (ئۆزۆن) بەدەوری زەوییدا و زیادکردنی ڕێژەی هەوای ژەهراوی و لەناوبردنی دارستانەکان و دروستکردنی چەکی ئەتۆمی ئەنجامی ئەم جۆرە بۆچوونە مێتافیزیکییە تەکنەلۆجیەیە.

دووەم، مەترسی گەورەتر لەوێدایە، کە مێتافیزیکی تەکنەلۆجیا بەخزانی بوون بەگشتی لەنێو چوارچێوەی وەبەرهێنان جیاوازییەکانی نێوان بوونی مرۆڤ و هەبووەکانی سڕیوەتەوە. بوونی مرۆڤیش خزێنراوەتە نێو چوارچێوەکەوە و بەگەنجینەیەکی سامان دادەنرێت. ئەمەش، هاوکات، وابەستە بە بۆچوونی هیچگەرایەتی سەبارەت بوونی مرۆڤ. مادامەکی مرۆڤیش هەبوویەکە، وەکو کەلوپەلەکانی دیکەی نێوجیهان و خاوەنی(خۆ) نیە، ئەوا پێویست ناکات جێگەیەکی بەرزتری بۆ دابنرێت. لە میتافیزیکی تەکنەلۆجیادا مرۆڤ نا-مرۆڤ کراوە و بووە بەکەلوپەل. بەهای بوونی مرۆڤ بەگوێرەی سودبەخشینی بۆ

سیستەمە تەکنەلۆجیاکە دەپێورێت. کۆمپانیایەکی زێر، شاخێک هەڵناکەنێت ئەگەر بزانێت ئەوشاخە زێڕی لەنێودانیە. بەهەمان شێوەش، مرۆڤەکان (کرێکارەکان) سودیان بۆئەو کامپانیایە نەبێت، بەگوێرەی پێویستیەکان و داواکارییەکانی کامپانیاکە کارنەکەن ئەوا وەکو کەلوپەلێکی بێ کەڵک دەخرێنە پەراوێزەوە. مەترسی گەورەی تەکنەلۆجیا لێرەدا سەرهەڵدەدات، کە هیچ بەهایەک بۆ مرۆڤ دانانێت بێجگەلەوەی، کە مرۆڤیش وەکو کانێکی زێڕ بە گەنجینەی سامان دادەنرێت و سودی لێوەردەگیرێت.

مەبەستی هایدیگەر لەم دوو خاڵەی تەکنەلۆجیا بەرانبەر بوون بەگشتی و بوونی مرۆڤ بە تایبەتی لە ڕەتدانەوە و لەناوبردنی تەکنەلۆجیادا نیە. ئەو نایەوێت تەکنەلۆجیا نەمێنێت، بەڵکو دەبێت مرۆڤ هەوڵبدات ئەم قۆناخە ڕەتبکات. ئەم ڕەتکردنەش (دیالێکتیکی) یە، کە مرۆڤ بەبێ لەناوبردنی تەکنەلۆجیا دەتوانێت شێوەی مێتافیزیکیەکەی ڕەتبدات و خۆی بەقۆناخێکی پێشکەوتوتری بیرکردنەوە بگەیەنێت. هایدیگەر لە چاوپێکەوتنەکەیدا لەم بارەوە دەڵێت:

من لەداگیرکردن نادوێم. دەڵێم، ڕێگەیەکمان نەدۆزیوەتەوە هەڵوێستی خۆمانی لەنێودا بەرانبەر تەکنەلۆجیا دیاریبکەین.
..........



هەمووشتێک بەڕێکوپێکی بەڕێوە دەچێت. خۆ هەڵخەڵەتاندنەکە لەوێدایە، کە دەڵێین هەمووشتێک بەڕێوەدەچێت. ئەمەش هاندەرە بۆ بەخێرکردنی بەڕێوەچوونەکە تاکو تەکنەلۆجیا دەگاتە ڕادەیەک ڕەگوو ڕیشەی مرۆڤ لە نێو زەوییدا دەردەهێنێت. تۆ نەترسای کاتێک وێنەکانیان لەسەرمانگەوە ڕەوانەی زەوی کرد؟ ئێمە پێویستیمان بە چەکی ئەتۆمی نیە. ڕەگوڕیشەی مرۆڤ دەرهێنراوە و پەیوەندییە کۆمەڵایەتیە کانمان بوون بە تەکنەلۆجیانە. ئەم ئەستێرەیە ئەوزەوییە نیە مرۆڤی لەسەردەژی. ئەگەر لەیادت بێت ماوەیەک لەپێشتر گفتوگۆیەکم لەگەڵ ڕێنەچار Rene Char کرد، کە شاعیرێکی جەنگاوەرە و لە(پرۆڤێنس) دەژی. لە (پرۆڤێنس) بنکەی موشەیان دانا و ناوچەکە لەگەڵیا شێوا. ئەو شاعیرە، کە گومان لە سۆزو عاتیفەی بۆ هونەر ناکرێت گوتی بوونی مرۆڤ بەڕەگەوە هەڵکێشراوە. ئەگەر شیعر و بیر دەستەڵات نەگرنە دەست ئەوا بوون کۆتایی پێدێت.[149]

لێرەدا دەردەکەوێت هایدیگەر باوەڕی بە ڕەتکردنی تەکنەلۆجیا هەیە بەڵام چ جۆرە بیرکردنەوەیەک شێوازی مێتافیزیکی تەکنەلۆجیا ڕەتدەکات و کەی ڕەتکردنەکە ڕوودەدات؟ هایدیگەر کاتێکی دیاریکراوی بۆ گۆڕانکارییەکە دانەناوە، بەڵام لەوباوەڕەدایە، کە گۆڕانکارییەکە

---

[149] مارتن هایدیگەر، گفتوگۆیەک لەگەڵ هایدیگەردا، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە د. محەمەد کەمال ، لاپەڕە ٤٨

دەستپێکردووە.

کێشەکە لەچاوەڕوانی ڕووداوەکە بۆ سێ سەد ساڵ نیە. بیرکردنەوە لە داهاتوودایە ( بەبێ ئەوەی خۆت بە پێغەمبەر دابنێیت)، ئەمڕۆ بیریلێدەکرێتەوە و لەسەردەمێکی دیکەدا سەرهەڵدەدات.[١٥٠]

بۆ وەڵامدانەوەی پرسیاری دووەمیش سەبارەت بەو جۆرە بیرکردنەوەیەی تەکنەلۆجیا ڕەتدەکات و ڕێگە بە تەکنەلۆجیا نادات بوونی مرۆڤ داگیرکات، هایدیگەر لەهەمان چاوپێکەوتندا دەڵێت،

بە کورتی وەڵامت دەدەمەوە، کەپاش بیرکردنەوەیەکی دوورودرێژ لەلام پەیدابووە. فەلسەفە ڕاستەوخۆ ناتوانێت بارودۆخی جیهان بگۆڕێت. ئەمەش بەتەنیا بۆ فەلسەفەنیە و شێوەکانی دیکەی بیریش دەگرێتەوە. تەنیا خوایەک ئێمە ڕزگاردەکات. ڕێگەچارەی ئێمە خۆ ئامادەکردنە بە بیر و شیعرەوە بۆ هاتنی خوایەک یان نەبوونی خوایەک لەم سەردەمەدا، کەسەردەمی رووخانە.[١٥١]

مەبەستی هایدیگەر لە (تەنیا خوایەک ئێمە ڕزگاردەکات)

150 هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٥٨

151 هەمان سەرجاوە، لاپەرە ٥٠



واتاکەی بەبەستنەوەی بەبیری دووەمەوە(خۆئامادەکردنە بە بیرو شیعرەوە...) دەردەکەوێت. ڕزگارکردنی مرۆڤ لەوبارودۆخە نەرێیەی تەکنەلۆجیا سەپاندوویەتی گەڕانەوە بۆ بڕواگەری و دۆگمای ئایینی نیە. (خوا) لە بۆچوونی هایدیگەردا سەدەمی هۆشەکی و باوکە مەزنە مێتافیزیکییەکەی نێو ئایینەکان نیە. بوونێکە ، کە ئایینەکان و فێرگە بڕواگەرییەکان دەستەڵاتی داهێنانیان پێبەخشیوە. بۆ هایدیگەر ئەو بوونەی خاوەنی دەستەڵاتی داهێنانە و ئایینەکان لە جیهانێکی پاک و بەرزدا دایانناوە، بێجگە لەمرۆڤ چی دیکەنیە. مرۆڤ. بەڵام شێوازی مێتافیزیکی تەکنەلۆجیا دەستەڵاتی داهێنانی لێسەندوەو بە نا- مرۆڤی کردووە. ئایینەکانیش بەهەمان شێوە دەستەڵاتی داهێنانیان لەمرۆڤ سەندووە و مرۆڤیان لەو خەسڵەتە بنەرەتیەی ناوەڕۆکی ڕووتکردۆتەوە. لەم بۆچوونەوە جیاوازی لەنیوان بۆچوونی مێتافیزیکی تەکنەلۆجیا و ئایینەکاندا نیە، لەهەردووشێوازە مێتافیزیکییەکەدا بوونی مرۆڤ داگیرکراوە. لەبەرئەمە ناگونجێت بۆ ڕزگارکردنی مرۆڤ لەچنگی تەکنەلۆجیا بگەڕێینەوە یان پەنا بۆ بیروباوەڕی ئایینی بەرین، بۆیە مەبەستی هایدیگەر لە (خوا) ئاماژەکردن بۆ بڕواگەری نیە، بەڵکو گەڕانەوەی دەستەڵاتی داهێنانە بۆمرۆڤ و بەمرۆڤکردنی مرۆڤە. لەکاتێکدا مرۆڤ لە نامۆیی و نارەسەنی ڕزگاریدەبێتو بۆ بوونی خۆی دەگەڕێتەوە داهینەرانە دەژی. لەدێری دووەمدا (خۆئامادەکردنە بەبیرو شیعرەوە) دروستی شیکردنەوەکەمان دەردەکەوێت. (بیرو

شیعر) ئاماژەکردنە بۆ بیرکردنەوەی فلسەفیانە و داهێنانی هونەری، کە هایدیگەر لە چەند نوسراوێکیدا هاوتەرازیان دەکات و هونەرمەند یان شاعیر دەخاتە ڕیزی فەیلەسوفەوە و لەوباوەڕەدایە مرۆڤ دەبیت شاعیرانە بژی وهونەریش(وەکو داهێنان نەک لاسایی کردنەوە) هێزی ڕزگاریکەرە.[152]

شێوازی مێتافیزیکی تەکنەلۆجیا، لەبەرئەوەی بووە بە نەریتی زاڵبووی سەردەم، لەگەڵ خۆیدا شێوازی زانین (ئەپستمە) و بەهاو ڕاستیش فەرزدەکات. یەکێک لە خەسڵەتە سەرەکییەکانی نەریتێکی (زاڵبوو) داگیرکردنی دەستەڵاتی داهێنانی مرۆڤە، کە لە ئاکامدا دەبێتە هۆی نامۆبوون و بەنارەسەنکردنی تاکەکان. تەکنەلۆجیاش ئەم شێوەژیانە نەریتییەی پێکهێناوە، کە لەڕووی زانین(ئەپستمە) و بەهاو ڕاستیەوە چەند خەسڵەتێکی تایبەتی هەیە و دەتوانرێت لەڕێگەیانەوە مێتافیزیکی تەکنەلۆجیا بناسرێتەوە. یەکەم، تەکنەلۆجیا پێویستی بەزانینی ماتماتیکی و ژمێریاری هەیە Calculative یان بیرکردنەوەو زانینی ماتماتیکی هەیە. لەڕێگەی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیەوە جیاوازییەکان پێشێل دەکات و دەگاتە

152 هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٣٤١. هایدیگەر چەند نوسراوێکی لەسەر هونەرو شیعر هەیە و هەوڵی شیعر نوسینیشی داوە. چەند هۆنراوەیەکی بڵاوکراوەتەوە. یەکێک لەو شاعیرانەی هایدیگەر لە شیعرەکانی نزیک بووبێت (هۆلدەرلن) بووە.



ئەنجامە نەگۆڕو زەرورییەکان.[153] ئەم جۆرە زانینەش پێویستی بە بەهای سودبەخش و پراگماتیکی هەیە و بۆ مەبەستی (وەبەرهێنان) و زۆرکردن و خێراکردنی بەرهەم بەکاردەهێنرێت. لەسەرو ئەمەشەوە، لەبەرئەوەی مرۆڤیش خزێنراوەتە نێو چوارچێوەی وەبەرهێنانەوە و بەکەلوپەل یان سامان دادەنرێت و نامرۆڤ کراوە، ئەوا دەستەڵاتی داهێنانی لێسەندراوە. مرۆڤێکیش لەنێو بارودۆخی نامۆبووندا بژی و نارەسەن بێت (پرسیار) ناکات.[154]

پرسیارکردن خەسڵەتی مرۆڤی ڕەسەنەو گەڕانە بەدوای ڕاستی بووندا. تاکە نامۆکانی نێو کۆمەڵگای تەکنەلۆجی، کەلە پێشتر بە مرۆڤە مامناوەندییەکان ناوزەدمان کردن، بەدوای ڕاستی بووندا ناگەڕێن. بارودۆخی بەسەردا سەپێنراوی تەکنەلۆجی، کە زۆرشتی بەردەستی بۆ ئامادەکردون، بە بەهەشت دادەنێن و خۆیان بۆ دۆزینەوەی ڕاستی ماندووناکەن. ئەوان باوەڕ بەهەموو زانین و بەهاو ڕاستیەک دەهێنن، کە لەمیدیای تەکنەلۆجیەوە پێیاندەگات. سەردەمی تەکنەلۆجیا سەردەمی کوشتنی پرسیارەکانەو مەرگی داهێنانە. کۆتایی هونەر و ژیانی هونەرمەندانەیە. ڕەتکردنی تەکنەلۆجیاش گەڕانەوەیە بۆ ناوەڕۆکی مرۆڤ و پرسیارکردن و ژیانی هونەرمەندانە.

153 Martin Heidegger. *Contributions to Philosophy (From Enowning)*, p. 84

154 هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٨٦

## هونەر وەکو هێزی ڕزگارکەر

چۆن هونەر دەبێت بەهێزی ڕزگارکەر؟ وەڵامی ئەم پرسیارە بەتێگەیشتنمان لەواتای تەکنەلۆجیا لەفەلسەفەی هایدیگەردا بەستراوەتەوە. مێتافیزیکی تەکنەلۆجیا سەرەڕای دانانی(بوون) بەگەنجینەیەک بۆ وەبەرهێنان بوونی مرۆڤیشی خزانۆتە نێو ئەو چوارچێوەیەوە. ئەم بەنامرۆڤکردنەی بوونی مرۆڤ و دانانی لەنێو چوارچێوەی گەنجینەکەدا لەگەڵ هەبووەکاندا کارتێکردنێکی نەرێی بەسەر بیرکردنەوەی مرۆڤەوە هەیە. تەکنەلۆجیا ماتماتیک بەتاجی سەری زانستەکان دادەنێت و بیرکردنەوەی ژمێریاریشی بەسەر مرۆڤدا سەپاندووە. بەم جۆرە، واتای بوونی مرۆڤ و بیرکردنەوەی گۆڕیوە و ڕاستی بوونی مرۆڤی بەشێوەیەکی نا- ڕاست دەربڕیوە. لەنێو کەلتووری تەکنەلۆجییدا مرۆڤ بە نەناسراوی بەجێماوە. بۆڕوونکردنەوەی ئەم خاڵەش هەیدیگەر ئاماژەی بۆ پارچە هۆنراوەیەکی(هۆڵدەرلن) کردووە،

ئێمە(هێما) ی نەبینراوین

.........

لەخاکی بێگانەدا بەزان فێربووین



لەزمان کەوتووین.[155]

(هێما) ی نەبینراو بوونی نەناسراوی مرۆڤە. بوونێکە دوورە لەڕاستی بوونەوە وئەو بوونەش لە (خاکی بێگانە) دا دەژی. ڕێگەی پێنەدراوە خۆی بناسێت و ببێت بەوەی خۆی دەیەوێت. لەگەڵ نامۆ بوونیشدا، گرنگ نیە ئەو نامۆ بوونە لە سەردەمێکی تەکنەلۆجیدا بێت یا جیاوازتر، بیرکردنەوە و زمانی ڕەسەنانەی مرۆڤیش دەگۆڕێت. لەبەرئەمە زمانەکەی لە نێو بارودۆخی نامۆبووندا زمانی ئەو نیە، تەنانەت خاوەنی بیرکردنەوەی خۆشی نیە.

لەم ڕوانگەیەوە هایدیگەر بۆ دەستنیشانکردنی جیاوازییەکانی نیوان تەکنەلۆجیا و هونەر، یان زانست و هونەر دەگاتە ئەو باوەڕەی، کە مرۆڤ لەسەردەمی تەکنەلۆجیادا، لە وڵاتێکی بێگانەدادەژیو بیرناکاتەوە، چۆنکە(زانست بیرناکاتەوە) .[156] ئەم گوتەیە، وەکو هایدیگەر خۆشی دەڵێت، ناوچەوانی زۆرکەس گرژدەکات و مێشکیان دەهەژێنێت. ئایا چۆن دەتوانین ئەو حوکمەبدەین، کە مرۆڤ لەسەردەمی تەکنەلۆجیادا بیرناکاتەوە، یان زانست خاوەنی بیرکردنەوەینە؟ ئایا دەستکەوتە

---

[155] Martin Heidegger. *What is Called Thinking*? translated by J. Glenn Gray, New York: Harper & Row Publisher, 1968. P. 10

[156] هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٨

تەکنەلۆجییەکان بەرهەمی بیرکردنەوەی تەکنەلۆجی نین؟ ئەو مرۆڤانەی ڕۆژانە لەنێو دووبارەبوونەوەی خولەکانی ژیاندا بۆ پەیداکردنی دەستکەوتە تەکنەلۆجیەکان لەپێش بڕکێدان، بیرناکەنەوە؟

ئەم گوتەیەی هایدیگەر، وەکو هەندێ گوتەی دیکەی، بۆنموونە ڕاستی نا-ڕاستیە، تەنیا لەنێو بەستێنی بیرکددنەوە فەلسەفیەکەیدا واتاکەی ڕووندەبێتەوە. پێویستە ئەوپرسیارە لەخۆمانبکەین، کە(بیرکردنەوە) بۆ هایدیگەر چیە؟ بێگومان، هایدیگەر نکۆڵی لەوەناکات، کە مرۆڤ تاکو زیندوبێت بیردەکاتەوە. بەڵام چ جۆرە بیرکردنەوەیەک؟ مرۆڤی سەردەمی تەکنەلۆجی و گیرخواردووی نێو تۆڕی نەریتی مێتافیزیکی تەکنەلۆجی بوونێکی نارەسەن و داگیرکراوی هەیە.

نەریتە مێتافیزیکییەکە بەکەلوپەلی دادەنێت. لەم پێگەیەشەوە دەگەینە ئەو ئاکامەی ، کە مادامەکی مرۆڤ بووە بەکەلوپەل، ئەوا بیرناکاتەوە. بەڵام، هێشتا فینۆمینۆلۆجیانە ئەم ئاکامە بۆ ناوچە وان گرژەکان دروست نیە. دەزانین،کە مرۆڤ لەژێر گرانترین باری داگیرکردن و چەوساندنەوەدا بیرکردنەوە لەدەستنادات. منیش لەگەڵ ئەم خاڵەدام، بەڵام بابزانین هایدیگەر چۆن لەواتای(بیرکردنەوە) دەدوێت و بیرکردنەوە بۆ ئەم بیریارە چیەو چۆنە. بیرکردنەوە خەسلەتێکی مرۆڤانەیەو شێوازی جیاوازی هەیە. ئەوشێوازەی هایدیگەر باسیدەکات



بیرکردنەوەی داهێنەرانەیە بۆدەرخستنی ڕاستی بوون، بیرکردنەوەیەکە، کە بیرەکان دەوروژێنێت و بۆ دەرخستنی ڕاستی بوون سەردەمەکەی یان ئێستای ڕەتدەکات. سەدەی بەردین کۆتایی پێنەهات لەبەرئەوەی بەرد نەما خەڵکی بەکاریبهێنێت، بەڵکو بیرکردنەوە خۆی بە قۆناخێکی پێشکەوتوو گەیاند. بیرکردنەوەی داهێنەرانە لە وروژاندنی بیرو داهێناندا خۆی دیاریدەکات. بۆنموونە هایدیگەر دەڵێت مرۆڤ لەسەردەمی تەکنەلۆجیدا بیرناکاتەوە. مەبەست ئەو جۆرە بیرکردنەوەیەیە، کە بیرەکان دەوروژێنێت و لەئاستی کۆمەڵێ پرسیاردا ڕاماندەگرێت و چاوەڕوانی وەڵامەکانی دەبین. ئەم شێوازی بیرکردنەوەیە پرسیار ناکوژێت، بەڵکو زیندووی دەکاتەوە، هێزی پێدەدات ومرۆڤ بۆ (وڵات) دەگەڕێنێتەوە.

مەبەستی هایدیگەر لە حاڵەتی بیرنەکردنەوەی مرۆڤ لە سەردەمی تەکنەلۆجیدا و ونبوونی بیرکردنەوەی ڕەسەنە لە مرۆڤی رەسەندا، کە داهێنەرانە دەڕوانێتە بوون و شاعیرانە ڕەنگەکانی ژیان دەگۆێڕت. لێرەدا دەتوانین بڵێین، کە هایدیگەر سێ جۆر بیرکردنەوەی دەستنیشان کردووە: بیرکردنەوەی ژمێریاری، بیرکردنەوەی فەلسەفی و بیرکردنەوەی شاعیرانە یان هونەرمەندانە.

بیرکردنەوەی یەکەم سەر بەمێتافیزیکی تەکنەلۆجیە و بۆ وەبەرهێنان خراوەتەگەڕ. لەم جۆرەبیرکردنەوەیەدا ئاکامەکان زەروریین و پەیوەندییەکی زەروریشیان

بەپێگەکانەوە هەیە. جیاوازییەکانیش نەک دەخرێنە پەراوێزەوە بەڵکو قەدەخەدەکرێن و ڕێگەی سەرهەڵدانیان دەگیرێت. بیرکردنەوەی فەلسەفی و هونەری(شاعیرانە) بە پێچەوانەی بیرکردنەوەی ژمێریارییەوە، داهێنەرانەیە و سەرچاوەکەشی دەستەڵاتی داهێنەرانەی بوونێکی ڕەسەنە، کەلەگەڵ دەربڕینی ڕاستیەکدا بیرەکان دەوروژێنێت و لایەنە شاراوەکانی بوون دەردەخات و (ئێستا) ڕەتدەکات. هەرچەندە ئەم دووجۆرە بیرکردنەوەیە(فەلسەفی و هونەری) لە هەندێک ڕووەوە جیاوازن، بەڵام هەردووکیان لەیەک سەرچاوەوە(بوونی ڕەسەن) دەردێن و بۆ مەبەستی ناسینی ڕاستی بوون و دەرخستنی ئەو ڕاستییە خراونەتەگەر. جیاوازییەکانیان زیاتر پەیوەندی بەشێوازی دەربڕینو میتۆدی دەرخستنی ڕاستیەکەوە هەیە. بیرکردنەوەی فەلسەفی بۆنموونە، پەنا بۆ بەر توێژینەوە و شیکردنەوە دەبات، هونەریش، بەتایبەتی شیعر ڕاستەوخۆ بە(حەدەس) ڕاستی دەناسێت. نموونەی دەربڕینی هونەرانە لەم پارچە هۆنراوەیەی (نالی) لە نامەکەیدا بۆ (سالم) دەردەکەوێت،

داخۆ دەروونی سافە، گوڕەی ماوە تانجەرۆ
یاخۆ ئەسیری خاکە بەڵێڵی دەکا عوبوور.[157]

[157] بڕوانە : نالی، دیوانی نالی، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٦، لاپەڕە ١٨٨



خاکی (نالی) ئەوخاکەی تانجەرۆی تێدا هەڵدەقوڵی و دەگوزەرێ بۆ مرۆڤی کورد بووە بە خاکی بێگانە. کۆچکردنی نالی لەم خاکە بێگانەکراوەوە بۆ خاکێکی بێگانەی دیکە، لە مەنفایەکەوە بۆ مەنفایەکی دیکە و لە بێ وڵاتیەوە بۆ بێ وڵاتیەکی دیکەیە. خاکی بێگانەکراو خاکی ڕەسەنە بەڵام ناوەڕۆک و ڕوخساری گۆڕاوەو کراوە بە وێرانەخاک. نالی خاوەنی خاکە و خاکەکەی داگیرکراوە. تانجەرۆی نالی بەگوڕی وڕەوانی میژووی تۆمارناکات، لەنێو قوڕولیتەی گەندەڵییدا و شێواندنی ڕاستیدا چەقیوە. لەبەرئەمە، نالی لەنێوان دوومەنفا و دووخاکی بێگانەدا گیریخواردووە. چاوی بڕیوەتە ڕێگەی گەڕانەوە و پرس بە (سالم) ی هاوڕێی دەکات. دڵنیا نیە لەوەی خاکی بێگانەکراوی ڕزگاری بووبێت و لەکاتی گەڕانەوەیدا بیناسێتەوە. (نالی) لەم پارچە هۆنراوەیەدا ڕاستی بوونێکی شێوێنراومان بۆ دەردەخات.

لەبەر ژیانی تاڵی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری، یان ئەوبارودۆخە نامۆکەرەی لەسەردەمی(میرنشینی بابان) مرۆڤی کورد تێیدادەژیا، نالی ناچارکرد ڕوو لەهەندەران بکات. جەنگی ناوخۆ لەسەردەمی سلێمان پاشا و مەحمودپاشای برایدا، کە هەریەکێک لەم برایانە بۆ بەرژەوەندی تاکەکەسی و دەستەڵاتی خۆیان لەشکری دوژمنیان دەهێنایە سەر سلێمانی، نیشتمانی(نالی) یان کرد بە وێرانە خاک و نالیش بە کۆچبەرێکی هەمیشەیی.

مرۆڤیش بەوشێواندنە نامۆدەبێت و خاکەکەی خۆی لێدەبێت بە مەنفا. مەنفاش دەبێت بەخەڵوەتی پەنابەری و وشە نەناسراوەکانیش بەزمانی دایک. دەبینن، بیرکردنەوەی هونەرمەندانە لەهەرچ شێوازێکی دەربڕیندابێت (شێوەکاری، مۆسیقا و هۆنراوە) هاوتەرازی بیرکردنەوەی فەلسەفییە و ڕاستی ناسە و داهێنەرانەیە. بیرکردنەوەی داهێنەرانەش سەرچاوەیەکی ڕەسەنی هەیە. هونەرمەند کەسێکی ڕەسەن و داهێنەرە. تەکنەلۆجیا نەیتوانیوە داگیربیکات و بوونی بشێوێنێت، هایدیگەر گوتەنی (هونەرمەند کەسێکە بەدوای ڕاستی بووندا دەگەڕێت و دەستەڵاتێکی داهێنەرانەیە بۆ دۆزینەوەی ئەو ڕاستیە.)[١٥٨] بیرکردنەوەی هونەرمەندانە دژە بابەتی بیرکردنەوەی ماتماتیکی و ژمێریارییە. ئەوهێزەی دژی نەریتی مێتافیزیکی تەکنەلۆجیاو شێواندنی ڕاستی بوون و بەبێگانەکردنی خاک رادەوەستێت هونەرە. ئەوهێزەی داوای کۆتایی هێنان بەمەنفا دەکات هونەرە. لەم ڕوانگەیەوە، هایدیگەر هونەر بەهێزی ڕزگارکەر دادەنێت و داوامان لێدەکات هونەرمەندانە بژین.

جیاوازییەکی دیکەی نێوان بیرکردنەوەی فەلسەفی و هونەری دەگەڕێتەوە بۆ پاڵپشتنی بیرکردنەوەی فەلسەفی بە بەڵگەو سەلماندنی بۆچوونەکانیەوە، کە لەبیرکردنەوەی هونەرییدا ئەم (ئیلتزامە) نابینرێت. پێویستە فەیلەسوف

[158] Martin Heidegger. *Contributions to Philosophy (From Enowning)*, p. 5



ڕاستی و دروستی بۆچوونەکانی بەبەڵگەوە بسەلمێنێت و بناخەیەکی لۆجیکمەندانەیان بۆ دامەزرێنێت. لەهونەردا ئەم پێویستیە سەرهەڵنادات. هایدیگەر لەنوسراوێکیدا لەسەر ڕۆڵی هونەر و هۆنراوە(شیعر) کەلەپێشتریش ئاماژەمان بۆکردووە، واتاکانی چوارچەمکی (خاک، ئاسمان، ژیان کورتەکان و خواکان) لەبەر ڕۆشنایی هۆنراوەکانی (هۆڵدەرلن) دا ڕوونکردۆتەوە.[١٥٩]

لەسەرەتاوە، ئەم چەمکانە لەزمانی فەلسەفی هایدیگەردا نوێ دەردەکەون. پاش تێگەیشتن لەواتاکانیان دەگەینە ئەو باوەڕەی پەیوەندییان بە بوونی مرۆڤ- لەنێوجیهاندا- بەرەومردن، وەکو بوونێکی ڕەسەن هەیە و نوێ نین. لەم توێژینەوەیەشدا، هایدیگەر هەمان پڕۆژەی ئۆنتۆلۆجی گەشتە فەلسەفیەکەی بۆ ناسینی ڕاستی بوون خستۆتەگەڕ. بۆگەیشتن بەو ڕاستییە ڕووی کردۆتە هونەر. نەک لەبەرئەوەی بیرکردنەوەی فەلسەفی لەوەزیاتر ناتوانێت بەوکارەهەستێت، بەڵکو دەیەوێت ڕۆڵی هونەریش لەسەردەمە تەکنەلۆجیەکەماندا باسبکات. دەتوانم بەکورتیەکەی بڵێم واتای ئەم چوارچەمکە ئەوەدەگەیەنێت، کە بۆهەنەر مرۆڤی ژیانکورت لەسەرئەم خاکە و لەژێرئاسماندا بۆ (بوون- بەخوا) تێدەکۆشێت. بەڵام ئەم

[159] Martin Heidegger."...Poetically, Man Dwells..." (1951), in *Philosophical and Political Writings*, translated by Albert Hofstader, edited by Manfred Stassen, New York: Continumm, 2003. Pp. 274-75

دەستەواژەیە واتایەکی تەواوی چەمکەکان بەجیا دەرناخات. لێرەدا پێویستە بەجیا لەواتاکانیان بکۆڵینەوە. خاک بوونی مرۆڤ لەنێو- جیهاندا لەژێر ئاسماندا دیاریدەکات. لە (بوون وکات) دا بوون لەنێوجیهاندا پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی بوونی مرۆڤ بوو. مرۆڤ لەسەر ئەم بناخەیەوە بوو بە بوونێکی جیهانی. ئەو بەبێ جیهان نیە و نابێت، چونکە هیچ داکەوتێکی دیکە لەو دیوجیهانەوە نیە. لە لێکۆڵینەوە هونەرییەکانی هایدیگەردا جیهان بووە بەخاک. ئەمەش، هاوکات ئەوە دەگەیەنێت، کە مرۆڤ بەبێ خاک نیە. بێجگە لەوەی مرۆڤ لەسەرخاک دەژی بەدوو جۆر مامەڵەش لەگەڵ خاکدا دەکات. لەجۆری یەکەمدا ڕاستەوخۆ سودیلێوەردەگرێت. بۆنموونە میوەی درەختەکان دەخوات و لەنێو ئەشکەوتدا دەخەوێت. لەبەرئەوەی مرۆڤیش ئاگامەندە و بەرەوپێش دەڕوات، هەوڵدەدات لە خاکەکەی (جێنشین) بێت و بیکات بە ماڵی خۆی. لەگەڵ جێنشین بووندا جۆری مامەڵەی دووەم سەرهەڵدەدات. مرۆڤ بەئاگاوە بۆ جێنشین بوونی لەسەرخاکەکەی هەوڵدەدات ئەوخاکە بۆ کۆشک و تەلار بگۆڕێت و خانووی لەسەر دامەزرێنێت. خانودامەزراندن، کە لێرەدا هایدیگەر بە مێتافور بەکاریهێناوە، داهێنانە یان پەلکێشکردنی بوونێکە لە نەبوونەوە. بەپێچەوانەی جۆری یەکەمی مامەڵەکردنەکە مرۆڤ لەم پەیوەندیەدا پێویستی بەجێنشین بوونێکی هونەرمەندانە هەیە.[١٦٠]

---

[160] هەمان سەرچاوە.



بوونی مرۆڤیش (کات) بیە و تەمەن کورتە. بوونێکە بەرەو(کۆتایی) یەکی حەتمی. ژیانکورتی مرۆڤ پەیوەندییەکی بنەڕەتیشی بە (نیگەرانی) یەوە هەیە. مرۆڤ لەمردن ئاگایەو دەزانێت ژیانی کۆتایی هەیە. لەبەرئەمە بەنیگەرانیەوە دەڕوانێتە بوون و دەیەوێت پرۆژەکانی بوونی تەواوکات و خۆی بە داهاتوو بگەیەنێت. ئەوهەمیشە بوونێکە پێش خۆی دەکەوێت و لەداهاتوودا دەژی. ژیانکورتی و نیگەرانی و داهاتوو زەمینەن بۆ دامەزراندنی پرۆژەکان. ئەگەر مرۆڤ ژیانکورت نەبوایە نیگەرانیش نەدەبوو، بایەخیشی بەداهاتوو نەدەدا. لەم ڕوانگەیەوە (جێنشین) بوونی مرۆڤ لەسەرخاک دەبێت داهێنەرانەبێت و مرۆڤ هەوڵبدات خۆی بەو ناوەڕۆکە بگەیەنێت، کە دەیەوێت پێیبگات.

ئەمەش بە ژیان لەنێو ئەشکەوت و خواردنی بەروبوومی سروشت ڕوونادات و پێویستە پرۆژەکانی بوونی بخاتەگەر و ئەو پرۆژانە لە نەبوونەوە، وەکو بەرزکردنەوەی کۆشک و تەلار، پەیدابکات. واتای چەمکی(خواکان) نیش بەستراوە بەم پرۆسەی داهێنانەوە، کە لەپێشتریش باسمانکردوە. ئەگەر تەکنەلۆجیا سەردەمی مرۆڤە مامناوەندییەکان بهێنێتەکایەوە و خواکان بەرەو خاکی بێگانە و مەنفا هەڵفرێنێ و تەرەیانبکات، ئەوا هونەر ئەوخوایانە یان مرۆڤە ڕەسەنانە بەرەو خاک دەگەڕێنێتەوە. ئەو مرۆڤانەی دەتوانن لەم سەردەمە تاریکەی تەکنەلۆجیادا شاعیرانە

بژین بین بەو هونەرمەندانە بەبیرکردنەوەی داهێنەرانە ڕاستی بوون دەردەخەن و دەیانەوێت مرۆڤایەتی بەناوەڕۆکێکی پێش کەوتوتر بگەیەنن. ئەم مرۆڤانە خواکانی هایدیگەرن چونکە باوەڕیان بە دەستەڵاتی داهێنان هەیە و بوونیان داگیرنەکراوە.

## هایدیگەر و نیتشە

یەکێک لەکێشەکانی قۆناخی دووەمی بیرکردنەوەی فەلسەفی هایدیگەر فەلسەفەی نیتشەیە. هایدیگەر دوو مەبەستی سەرەکی لە تەفسیرکردنی فەلسەفەی نیتشەداهەیە. یەکەم، بەرگریکردنە لەنیتشە و دژوەستانە بەرانبەر ئەوانەی فەلسەفەی نیتشەیان بەزۆر خزانە نێو قەوارەیەکی تەسکی ئایدۆلۆجی نازییەکانەوە. دووەم، هەوڵدانە بۆ ڕوونکردنەوەی نەریتی مێتافیزیکی نیتشە، وەکو نەریتێکی زاڵبوی سەردەم بۆ تێگەیشتن لە واتای بوون.

بەرگریکردنی هایدگەر لەنیتشە لە ڕیزە وانانەکانی زانکۆی فرایبۆرگەوە دەستپێدەکات لە ١٩٣٦ تاکو ١٩٤٠ پێش کەشی کردن. دواجار ئەم وانانە بەئەڵمانی و ئنجا وەرگێڕانە سەر زمانی ئینگلیزی و لە چواربەرگدا بڵاوکراونەتەوە. ئەم نوسراوەی هایدیگەر لەسەر نیتشە ڕۆڵێکی گرنگی لەزیندووکردنەوەی بیروباوەڕی نیتشەدا بینیوە. هایدیگەر بوێرانە، لەوکاتەدا، کە نازییەکان لەئەڵمانیا ئەوپەڕی



دەستەڵاتیان هەبووەو نیتشەیان بەپێغەمبەری خۆیان داناوە، هەوڵیداوە فەلسەفەی نیتشە لەم گەندەڵییە ڕامیارییەو بەنازیکردنە بپارێزێت.[١٦١] نوسراوی دووەمی هایدیگەر لەسەر نیتشە بەناوی Nietzsche's Word: "God is Dead" لەساڵی ١٩٤٣ نوسیویەتی لەگەڵ کۆمەڵێک نوسراوی دیکەدا لەپەڕتووکێکدا بەناوی *Holzwege* بەئەڵمانی لەساڵی ١٩٥٠ لە فرانکفۆرت لەچاپدراوە. جولیان یۆنگ و کێنیت هەینس وەریان گێڕاوە بۆ ئینگلیزی و بەناوی *Off the Beaten Track* زانکۆی کامبرج لەساڵی ٢٠٠٢ لە چاپیداوە. ئەوپرسیارەی لیرەدا خۆی دەسەپێنێت ئەوەیە چۆن هایدیگەر بیرکردنەوەی فەلسەفی نیتشە تەفسیردەکات؟ چۆن لەوگەندەڵییە ڕامیارییەش دەیپارێزێت؟ لەساڵی ١٩٣٤ چەندمانگێک پاش دانانی هیتلەر بەسەرۆکی ئەلمانیا (ئەلیزابێت) ی خوشکی نیتشە ئەرشیفی نیتشە – Nietzsche Archive لەشاری ڤایمەر دامەزراندو بۆ کردنەوەی ئەرشیفەکەش هیتلەری بانگکرد. ئەلیزابێت بەئاشکرا هیتلەری بە(سوپەرمان) ە کەی نیتشە دادەناو هیتلەریش گەشەی بەم سازشکردنە دەکرد و تەنانەت لەمانگی ١١ی ١٩٣٥، کە ئەلیزابێت مرد، هیتلەر دوای تەرمەکەی

[161] لە نوسراوێکی دیکەدا بەدرێژی بۆچوونەکانی هایدیگەرم لەسەر نیتشە باسکردووە.

بڕوانە: محەمەد کەمال، نیتشەو پاش تازەگەری، دەزگای سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٦، لاپەڕە ١٩٣- ٢٠٠

کەوت.[١٦٢] نازییەکان لە هەموو لایەنێکەوە هەوڵیاندەدا نیتشە بە فەیلەسوفی خۆیان دابنێن و هانی مامۆستا نازییەکانی بەشەکانی فەلسەفە دەدرا بەرگێکی نازی بەبەری بیرکردنەوەی نیتشەدا بکەن و تەنانەت پەرتووکی(زەردەشت وای گوت) بووبە دەقێکی پیرۆز بۆ ئەوان. توێژینەوەکەی هایدیگەر بەپێچەوانەی ئەم هەوڵدانە، سەلماندنە بۆ(بێتاوانی) نیتشە و دوورخستنەوەی لە نازیزم. حەزدەکەم توێژینەوەکەی لە م چەند خاڵە دا ڕوونبکەمەوە:

١- تێگەیشتن لەواتای (ویستی هێز)، وەکو دەستەڵاتی داهێنەرانە.
٢- مرۆڤی بەرز (سوپەرمان) و بوونی ڕەسەنانە.
٣- تێگەیشتن لەواتای ژیان(بایۆ- *Bio*).

لەبیرکردنەوەی فەلسەفی نیتشەدا بوون(هیچ) ە ، واتە هیچ

[162] هیتلەر بۆکردنەوەی ئەرشیفی نیتشە و بینینی ئۆپێراکەی ڕیچارد واگنەر (Tristan and Isolde) و یادکردنەوەی پەنجاساڵ بەسەرمردنی واگنەردا چوو بۆ شاری ڤایمەر. بڕوانە: Curtis Cate. *Friedrich Nietzsche: A Biography*, London: Pimlico, 2003. P. 575-76

هەروەها؛ Carol Diethe. *Nietzsche's Sister and the Will to Power*, Chicago: University of llinois Press, 2003. P. 149



ڕاستەقینەیەک نیەو ئەوەی هەیە بوونی هە بووەکانی لەسەر وەستابێت (ویستی هێز) ە. ویستی هێز بنەماو ناوەڕۆکی هەموو هەبووەکانە و ئەو ڕاستیەیە، کە بەبێ ئەو هیچ شتێک نابێت.[١٦٣] ئەم ناوەڕۆکە مێتافیزیکییە بنەمایە بۆ هەموو شتەکانو لە شێوازی جیاواز و پلەی بەرز و نزمدا خۆی دەردەخات. بۆنموونە، هێزە سروشتیەکان لەئاگابەدەرن و هەندێک جاریش ئەوەندە بەتوندی خۆیان دەردەخەن، کە دەبنە شێواندنی جۆرێک لەژیان و بەردەوامی ژیان. بەڵام لەبوونی مرۆڤدا(ویستی هێز) هاوکات (ئاگامەندە) و کوێرانە، وەکو هێزە سروشتیەکان ناژی. ڕەوتێکی بێ مەبەست و بێ بەرنامە نیە. ویستی بوونێکی ناتەواوە، کە دەیەوێت خۆی تەواوبکات. بۆگەیشتن بەم مەبەستە پێویستە ویستی هێزی مرۆڤ داهێنەرانە و بەردەوام لەپەرەسەندندابێت. لەم ڕووەوە بوونی مرۆڤ پاش دامەزراندنی لەسەر(ویستی هێز) و دانانی ئەوهێزە بە دەستەڵاتی داهێنان دەبێت بە بوونێکی هونەرمەندانە[١٦] نەک بوونێکی داگیرکەرو زوڵم سەپین و چەوسێنەر. هایدیگەر لەوباوەڕەدایە ویستی هێز سەرچاوەی داهێنان و پەرەسەندنە و هێزێکە بۆ دامەزراندن و بەردەوامی بەڕەسەنیەتی بوون. هێزێکی داهێنەرو ڕەسەنیش نابێت بە

[163] Friedrich Nietzsche. *The will to Power*, translated by Waltre Kaufmann, New York: Vintage Books, |968. P. 55٥

[164] Martin Heidegger. *Nietzsche*, vol. 1, p. 69

دەستەڵاتێکی ڕامیاری داگیرکەر.[١٦٥] لێرەدا، حەزدەکەم ئاماژە بۆ ئەوخاڵە بکەم، کە لە بیرکردنەوەی فەلسەفی نیتشەدا ڕەسەن و ناڕەسەنیبوون لەسەر چۆنیەتی بەکارهێنانی ویستی هێز رادەوەستێت. من لە پێشتر بۆچوونی هایدیگەرم لەم بارەوە ڕوونکردۆتەوە. بەڵام هایدیگەر (ویستی هێز) ی بەکار نەهێناوە و جەختی لەسەر دامەزراندنی پڕۆژەکانی بوون کردووە. ئەگەر(دازاین) سەربەستانە پڕۆژەکانی بوونی هەڵبژێرێت، ئەوابوونێکی ڕەسەنی هەیە و داگیرنەکراوە، بەپێچەوانەی ئەمەشەوە، بوونی ناڕەسەن دەکرێت. بۆنیتشەش ڕەسەنی تاکێک دەکەوێتە سەر سەقامگیرکردن و پەرەسەندنی (ویستی هێز) ی بە شێوەیەکی سەربەستانە و بەبێ ئەوەی دەستەڵاتێکی بەرزتر ناچارییکات. بۆ ئەم مەبەستەش، یان مسۆگەرکردنی ڕەسەنیەتی بوون و سەربەستی مرۆڤ نیتشە خوا دەکوژێت. ئەم فەیلەسوفە لەو باوەڕەدایە گەیشتن بەڕەسەنیەتی بوون و مسۆگەرکردنی سەربەستی، کە دەبنە زەمینە بۆ لەدایکبوونی مرۆڤی بەرز(سوپەرمان) بەڕوخاندنی دەستەڵاتە داگیرکەرەکان دەستپێدەکات. گەورەترین دەستەڵاتی داگیرکەریش بۆماوەیەکی دوورودرێژ ناپێویستانە لەنێو کەلتووری شارستانیەتدا مابێتەوە دەستەڵاتی خوایە. بۆئەوەی مرۆڤ ڕەسەن و سەربەست بێت یان(سوپەرمان) لەدایک بێت پێویستە خوابمرێت.

165 هەمان سەرچاوە.



ئەی مرۆڤی بەرز فێربە
خەڵکی نێوبازاڕ باوەڕیان بەمرۆڤی بەرزنیە.
بۆئەوان، ئێمە، هەموو یەکسانین.
بەدیدی ئەوان مرۆڤی بەرز نیە.
لەبەردەم خوادا هەموومان یەکسانین، بەڵام خوامردووە.
ئێستا خوا مردووە.
ئەی مرۆڤی بەرز، بوونی خوا مەترسیەکی گەورەیە بۆ تۆ.[١٦٦]

مردنی خواو چۆڵکردنی ئەوجێگایەی لەنێو بیرو کەلتووری بیردا داگیریکردووە مەرجێکی سەرەکییە بۆ لەدایکبوونی مرۆڤی بەرز. هایدیگەر گوتەنی، تاکو ئەو جێگەیە چۆڵنەکرێت، مرۆڤ ناتوانێت لەسەریجێنشین بێت و لافی بەرزێتی لێبدات.[١٦٧]

مرۆڤی بەرز یان باشتر وایە بڵێین مرۆڤە بەرزەکان سەربەست و ڕەسەنن و داهێنەرانە دەژین. ئەوان دوای کەلتووری بازاڕی و بەها باوەکانی کۆمەڵ ناکەون و نایانەوێت ببن بە یەکیک لەو خەڵکەی نێو ڕەوە ڕامیارییی

166 Friedrich Nietzsche. *Thus Spake Zarathustra*, translated by Thomas Common, London: Worldsworth Classics, 1997. P. 276

167 Martin Heidegger. "Nietzsche's Word: "God is Dead." (1943), in *Off the Beaten Trach*, translated by Julian Young and Kenneth Haynes, Cambrididge: Cambridege Unirersity Press, 2002. P. 168

و ئایدۆلۆجیەکان. بوون لە نێو بازاڕ و شوێن کەوتنی کەلتووری بازاڕی لەهەرچ شێوازێکدابێت (ڕامیاری یان ئایینی و کۆمەڵایەتی) ڕەتدانەوەی ڕەسەنیەت و سەربەستی مرۆڤە. لەم پێگەیەوە، مرۆڤە بەرزەکانی نیتشە، بەپێچەوانەی مرۆڤە نزمەکانەوە، خاوەنی بیر و بەهاکانی خۆیانن، کە بەردەوام لەپەرەسەندن و گۆڕانکاریدان. مرۆڤە بەرزەکان بکوژە نازییەکان نین، ئەو مرۆڤانەن دەیانەوێت مرۆڤایەتی لەئاستێکی نزمەوە بەرەو ترۆپکی بەرزایەتی بوون بەرن و دەیانەوێت مرۆڤایەتی(ئەمرۆ) ڕەتبکەن.[١٦٨] بۆ هایدیگەر، مرۆڤی بەرزی نێو بیرکردنەوەی فەلسەفی نیتشە ڕەتدانەوەیەکی بەردەوام و نەبڕاوەیە. ئەم مرۆڤە لە هیچ قۆناخێکی بووندا ڕەزامەندانە ناژی و ئەو قۆناخە بە دواقۆناخ و ترۆپکی ژیان دانانێت. لەم پرۆسەی ڕەتدانەوە نەبڕاویەدا بێجگە لەڕەتدانەوە هیچ ڕاستیەکی دیکە نەگۆڕ و ڕەها نیە.[١٦٩] مرۆڤی بەرز، لەنێو ئەم پرۆسەیەدا، بەردەوام بەهاکان هەڵدەوەشێنێتەوە و بەهای نوێتر دادەمەزرێنێت. هەڵوەشاندنەوەی بەهاکان یان(بێ بەهاکردنی بەهاکان) شێوازێکی پێشکەوتنخوازانە بە بوونی مرۆڤی بەرز دەبەخشێت و ڕێگە بەمرۆڤی بەرزنادات لەقۆناخێکی مێژوویی دیاریکراودا گیربخوات و دەستەو تاقمێک بەهای کۆمەڵایەتی یان ڕامیاری بەدوا بەها

[168] Martin Heidegger. *Nietzsche*, vol. 2, p. 215

[169] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٢١٧



دابنێت. بێگومان، مرۆڤێکیش بەم جۆرە لە واتای بوون و بەهاکان تێبگات خۆی ناکات بەخاوەنی ئایدۆلۆجیەکی خۆبەحەقزان و هاوبیروباوەڕی ئەومرۆڤانەی لە قۆناخێکی مێژوودا دەچەقن و گیردەخۆن و ئەوقۆناخە و بەهاکانی بە بەرزترین و پیرۆزترین کاڵای بوون دادەنین. گیرخواردن و شوێنکەوتنی ئایدۆلۆجی و بەهایەکی نەگۆڕ و ڕەها لەهەڵوێستی ژیانی مرۆڤە نزمەکانەوە، یان نیتشە گوتەنی مرۆڤە ناشرینەکاندایە. نیتشە یەکێکە لەوبیریارانەی بوونی مرۆڤ بۆ ناوەڕۆکێکی هۆشەکی ناگەڕێنێتەوە و دژی نەریتی میتافیزیکی دێکارتی ئەو ناوەڕۆکە بە(هیچ) دادەنێت. ئەمەش ئاکامێکی لۆجیکمەندانەی ڕەتدانەوەی بوونی سەدەمێکی هۆشەکییە لە مێتافیزیکی هیچگەرایەتی نیتشەدا. مادامەکی خوا نیە، یان ئەو ناوەڕۆکە هۆشەکییە مێتافیزیکییە نیە، کە دەبێت بەسەرچاوەی ژیان و بوونی هەمووشتێک، ئەوا بوونی مرۆڤیش لەناوەڕۆک بەدەرەو لەسەر(ناوەڕۆکێکی هۆشەکی) ڕانەوەستاوە. ئەم بوونە بایۆلۆجی و ویستی هێزە. ئەم بۆچوونە بایۆلۆجیەی نیتشە لەلایەن نازییەکانەوە تەفسیرێکی زانستانەی بۆکراو بۆ پاکسازیکردی رەگەزی ئەڵمانی خستیانەگەر. هایدیەر لەبەرگی سێیەمی پەڕتووکەکەیدا لەسەر نیتشە هەوڵیداوە مەبەستی نیتشە لەم بۆچوونە و واتای بایۆلۆجی لەفەلسەفەکەیدا ڕوونبکاتەوە.

هایدیگەر بۆ هەڵوەشاندنەوەی تێگەیشتنی نازییەکان لەم لایەنەی فەلسەفەی نیتشە بۆسەرچاوەی زاراوەی

(بایۆلۆجی) لەزمانی یۆنانیدا گەڕاوەتەوە و لەوێوە واتای ئەم زاراوەیە و مەبەستی نیتشە لەبەکارهێنانی ئەم زاراوەیە و تێنەگەیشتنی‌نازییەکان لە نیتشە ڕووندەکاتەوە. بەبۆچوونی هایدگەر بەکارهێنان و واتای (بایۆلۆجی) لەلایەن نیتشەوە لە واتا زانستیەکەوە جیاوازە. نیتشە، وەکو زانستکارێک مامەڵە لەگەڵ زاراوەکەدا ناکات و فەلسەفیانە لێیدەکۆڵێتەوە. ئەم زاراوەیە یۆنانیە و لەدوو بەش پێکهاتوە، (بایۆ) و (لۆجی) . بەشی یەکی زاراوەکە (بایۆ) لەزمانی یۆنانییدا واتای (ژیان) دەبەخشێت. بەشی دووەمیش (لۆجی) واتە گوتار، لێکۆڵینەوە، کە دەخرێتە پاش زۆر وشەی دیکە وەکو سایکۆلۆجی، سۆسیۆلۆجی و فیلۆلۆجی. ئەمڕۆ زانستەکان یان لەبواری تەسکی زانستدا بایۆلۆجی ئەوزانستەیە، کە لە چیەتی و کارکردنی ئەندامەکانی لەشە زیندووەکان دەکۆڵێتەوە. بۆ نموونە، ئەم زانستە بۆمان باسدەکات دڵی مرۆڤ چۆن کاردەکات و خوێن بەسەرلەشدا دابەشدەکات. فەلسەفەی نیتشە بایۆلۆجی زانستانەی بوارتەسک نیەو هەوڵدانە بۆ تێگەیشتن لە واتای (ژیان). ئامانجی نیتشە لەم هەوڵدانە ناسینی ئەندامەکانی لەش و کارکردنیان نیە، بەڵکو واتای ژیان و ڕاستی ژیانە بۆ مرۆڤ، بەتایبەتی مرۆڤی بەرز یان ژیانە بە بەرزی.[١٧٠] مەبەستی نیتشە لە بایۆلۆجی فەلسەفیانەیە و دەیەوێت بەرێگەی ئەم زاراوەیە مەبەستی (ژیان) دەربخات، چونکە ویستی هێز هاوکات ویستی ژیانیشە. پێشخستنی ژیانیش

[170] هەمان سەرچاوە، بەرگی سێیەم، لاپەڕە ٣٩



ناوبردنی کەسانی دیکە و ڕوخاندنی ژیان نیە، پەرەسەندنێکی بەردەوامە بۆ گەیشتن بەداهاتوویەکی گەشاوەتر. هایدگەر لە هەڵبژاردنی فەلسەفەی نیتشە بۆ زنجیرەیەک لە وانەکانی بەتەنیا بۆ بەرگریکردن لە بۆچوونەکانی نیە. نیتشە بۆ هایدیگەر جێگەیەکی گرنگ و سەرەکی لەمێژووی بیرکردنەوەی فەلسەفیدا داگیرکردوە.

ئەوەمان بۆڕووندەکاتەوە، کە سەردەمەکەمان یان تێڕوانینی مێتافیزیکی سەردەمەکەمان (سەردەمی تەکنەلۆجیا) بەردەوامییەکە لەئەفلاتونەوە بۆ نیتشە. بێگومان بۆ زۆرکەس ئەم بۆچوونەی هایدیگەر ناڕەوایە چونکە نیتشە لەزۆر شوێندا دژی ئەفلاتونە. بۆچوونەکەی هایدیگەر بەستراوە بە تێگەیشتنی هایدیگەر لە مێتافیزیکی هیچگەرایەتی. هیچگەرایەتی بەدیدیی هایدیگەر لە ڕەتدانەوەی بوونی(سەدەمی هۆشەکی) دا سەرهەڵنادات، وابەستە بە تێگەیشتنمان لەڕاستی بوون و دانانی بوون بە(هیچ) ، گەڕانەوە بۆشتێکی دیکە، وەکو فۆڕمە بەرزەکان، ویستی ژیان یان ویستی هێز، بێجگە لەبوون بۆبنەڕەتی هەمووشتێک. لەسەرەتاوە لەوەدواین، کە بیریاران لەئەفلاتونەوە(بوون) یان، وەکو بنەڕەتی هەمووشتێک، فەرامۆشکردووەو لەشتێک کۆڵراوەنەتەوە، کەئەوشتەش لەسەر (بوون) ڕادەوەستێت. ئەمەش لەبیرکردنەوەی فەلسەفی هایدیگەردا ئاکامی ئەو بۆچوونەیە، کە (بوون) بە(هیچ) دادەنێت و فۆرمەبەرزەکان یان ویستی هێز دەکات بەبنەڕەت و ناوەڕۆکی هەبووەکان. لەم ڕوانگەیەوە و

تەفسیرکردنی مێژووی فەلسەفە لەئەفلاتونەوە لەم شێوەی فەرامۆشکردنە و ئاوەڕنەدانەوە لەبوون و دانانی بوون بەهیچ، مێتافیزیکی هیچگەرایەتی لە ئەفلاتونەوە سەرهەڵدەدات و بەنیتشە کۆتایی دێت. نیتشە دوابیریاری مێتافیزیک و فەیلەسوفێکی هیچگەرایەتی لەگەڵ خۆیدا نەریتی مێتافیزیکی هیچگەرایەتی لە سەردەمەکەماندا سەقامگیرکردووە. جارێکی دیکە، نیتشە، ئاماژەی بۆ (بوون) نەکردووە وشتێکی دیکەی خستۆتەجێگەی ئەم بنەڕەتە لەبنەڕەتبەدەرە.[171]

هایدیگەر هیچگەرایەتی نیتشەی بە(کلاسیکی) ناوزەدکردووە[172]، کە بە بۆچوونی من دەگەڕێتەوە بۆ پەیوەندی هیچگەرایەتی نیتشە بەفەلسەفەی ئەفلاتونەوە. من، بەپێچەوانەی هایدیگەرەوە، لەنوسراوەکەمدا لەسەرنیتشە هیچگەرایەتیەکەی ئەم فەیلەسوفەم بە(بەرنامەگەری) داناوە. بەرنامەگەری مێتافیزیکی نیتشەش لەسەر ئەو زەمینە ڕادەوەستێت، کە ڕەتدانەوەو ڕەتکردن دەبن بەدوو کۆڵەکەی ئەستورو(ویستی هێز) لەڕێگەیانەوە خۆی بەداهاتوو دەگەیەنێت. لێرەدا، ئەوخاڵەشم ڕوونکردۆتەوە، کە هیچگەرایەتی نیتشە، بەتایبەتی لەمێژوودا، خۆی بەودیو هیچگەرایەتی

171 هەمان سەرچاوە، بەرگی چوارە م، لاپەرە ٥٦

172 هەمان سەرچاوە.



دەگەیەنێت و بەرنامە بۆژیان دادەنێت. ئەمەش جیاوازییەکی بنەڕەتی لەنێوان هیچگەرایەتی نیتشە و شۆپنهاوەردا دەستنیشاندەکات و یەکەمیان بەڕووناکبین و دووەمیان بەڕەشبین دەخوێنێتەوە.[173] فەلسەفەی نیتشە لەسەر پێنج کۆڵەکە ڕاوەستاوە; مردنی خوا، هەڵوەشاندنەوەی بەهاکان، ویستی هێز، مرۆڤی بەرزو گەڕانەوەی هەمیشەیی.

هایدیگەر لەتەفسیرکردنی ئەم پێنج کۆڵەکەیەدا ئەوە دەردەخات، کەبیرکردنەوەی فەلسەفی نیتشە و ئایدۆلۆجی نازییەکان بەیەکدی ناگەن. ئەم پێنج کۆڵەکەیە لەسەر یەک زەمین داکوتراون و پەیوەندی زەروریان لەگەڵ یەکدیاهەیە. هیچ کامیان بەتەنیا و بەبێ ئەوانی دیکە واتاکەی خۆی تەواوناکات. لەهەموویان گرنگتریش (مردنی خوا) یە، کە دەبێت بەپێشمەرج بۆ چوارکۆڵەکەکەی دیکە. ئەمەش پێویستیەکی ئۆنتۆلۆجیە. بەمردنی خوا هەموو بەها هەمەکی و نەگۆڕەکان هەڵدەوەشێتەوە و مرۆڤی بەرز لەدایک دەبێت و ویستی هێزیش ئەو مرۆڤە بەرەو ترۆپکە بەرزەکانی داهاتوو دەگەیەنێت. بەڵام ئەو پرسیارەی لێرەدا سەرهەڵدەدات ئەوەیە، کە مردنی خوا چی پەیوەندییەکی بە (گەڕانەوەی هەمیشەیی) یەوە هەیە؟ لەگەڵ مردنی خوادا پەیوەندییەکانی نێوان زەمین و ئاسمان دەپچڕێت.

173 بڕوانە: محەمەد کەمال، نیتشەوپاش تازەگەری، لاپەرە ١٣٧، ٢٢٠

گۆڕانکارییە مێژووییەکان لەئاسمانەوە بەرەوزەمین و لەزەمینەوە بەرەوئاسمان ناکەونەڕێ. گۆڕانکارییەکان داهێنراوی مرۆڤی بەرزن، کە لە سەر زەمین جێنشین بووە. زەمین خاکی مرۆڤی بەرزە و ئاسمانیش ئەوجیهانە بەرزە نیە مرۆڤی بەرز ناچاربکات ودەسەڵاتی داگیربکات. مرۆڤ و زەمین، مرۆڤ و خاک، مرۆڤ و مێژوو تەواوکەری یەکدین. مرۆڤی بەرز لەسەرزەمین گۆڕانکارییەکان دەهێنێتە کایەوە و مێژوو دەنوسێتەوە. گۆڕانکارییەکانیش لە زەمینەوە بۆ زەمین خەسڵەتی سوڕانەوە و خولەی نێو بازنەیی وەردەگرێت، کە هەموو خاڵێک لەم خولەیەدا چەندبار دەبێتەوە و چەندجارێک دەگەڕێتەوە بۆ شوێنی خۆی.[174]

سەرەنجامی توێژینەوەکەی هایدیگەر بۆ فەلسەفەی نیتشە لەچەندخاڵێکی گرنگدا کۆدەبێتەوە. هایدگەر بوێرانەو بەتێکڕا دژی بەنازیکردنی فەلسەفەی نیتشەیە. نیتشە بەفەیلەسوفی ژیان دادەنێت، کەبۆ پەرەسەندنی ژیان بەڕێگەی ویستی هێز، نەک ڕووخاندن و تێکشکاندنی ژیان هەوڵیداوە. بوونی مرۆڤی بەرز (سوپەرمان) بوونێکی ڕەسەنەو هێزێکی ڕەتدانەوە و ڕەتکردنی بەردەوامە. بوونێکە دژی کەلتووری بازاڕی و بەها نەگۆڕو بەسەرداسەپێنراوەکان ڕادەوەستێت. لەپرۆسەی ڕەتدانەوە و ڕەتکردندا هەڵوەشاندنەوەی بەهاکان پرۆژەیەکی سەرەکی ئەم بوونەیە. لەژیانی مرۆڤی بەرزدا هیچ بەهایەک دوا بەهاو هیچ قۆناخێکی مێژوو دواقۆناخ نیە. میتافیزیکی

[174] هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٧



هیچگەرایەتی نیتشەش، کە (کلاسیکی) یە، دواقۆناخی بیرکردنەوەی هیچگەرایەتی و سەرەتای سەرەتایەکی نوێ یەو نیتشەش دوابیریاری تازەگەرییە.

# بەشی شەشەم
# کاریگەرێتی هایدیگەر لەسەر بیرکردنەوەی فەلسەفی سەردەم

هەندێک جار کاریگەرێتی بیرکردنەوەیەکی فەلسەفی ڕاستەوخۆ لە تەمەنێکی کورتدا دەرەکەوێو کاردەکاتە سەر نەریتی سەردەمەکەی. نموونەی ئەم جۆرە کاریگەرێتیەش لەفەلسەفەی دیالێکتیکی هیگڵ و تەفسیری مارکسی بۆ مێژوو بەئاشکرا دەبینرێت. هیگڵ و مارکس توانیان لەسەردەمی خۆیان و پاش مردنیان لەتەمەنێکی کورتدا گۆڕانکارییەکان لەبۆچوونی مرۆڤ بۆ بوون بخەنەگەر. جاری واش، سەرهەڵدانی ئاکامی کاریگەرێتیەکە درێژخایەن بووە. فەلسەفەی کانت، بۆنموونە، ماوەیەکی درێژی پێویست بوو تاکو توانی لەبواری بیرکردنەوەی ئەکادیمیدا گۆڕانکاری دابهێنێت. هایدیگەر یەکێکە لەوبیریارانەی، کە کاریگە رێتیەکەی لەسەر بیرکردنەوەی فەلسەفی سەردەمەکەی و دوای مردنیشی، دەخرێتە ڕیزی کاریگەرێتی هیگڵ و مارکسەوە بەسەرمێژووی بیرکردنەوەدا. بۆچوونە ئۆنتۆلۆجیەکانی هایدیگەر، وەکو ئۆنتۆلۆجی بنەڕەتی و فینۆمینۆلۆجی ئۆنتۆلۆجی و شیکردنەوەی بوونگەرایەتی بوونی مرۆڤ و تێگەیشتنی لە ناوەڕۆکی



تەکنەلۆجیا و هونەر ئاسۆیەکی بەرفراوانی بیرکردنەوەی کردۆتەوە. کەم بیریارهەن لەسەردەمەکەماندا یارو نایارانە لەسەر بۆچوونەکانی هایدیگەر نەدوابێتن و خۆیان بە یار یان نایار دانەنێن. ژمارەیەکی گەورە لە بیریارانی سەردەمەکامان، وەکو جان پۆڵ سارتەر، مۆریس میرلۆپۆنتی، ئیمائیل لێڤیناس، پۆڵ تیلیچ، ئۆرتیگا گایست، ڕادۆڵف بەلتمان، هانا ئارنت، هربرت مارکۆز، هانس جۆناس، کارڵ لویس، هانس- جۆرج گادەمەر، میشێل فوکۆ، جاک دێریدا، جان بۆدریلارد، مۆریس بلندکۆت، هیوبرت درایفوس، جاک لاکان، ڕیچارد ڕۆرتی و چارلس تەیلەرو گەلێکی دیکەش کەوتونەتە ژێر کاریگەرێتی هایدیگەرەوە. بێگومان لەپرۆژەی نوسینی پەرتووکێکدا، بەتایبەتی لەبەشێکیدا ناکریت لەسەر هەموو ئەم بیریارانە بدوێین. بۆ ڕوونکردنەوەی کاریگەرێتی هایدیگەر بەسەر سەردەمەکەمانەوە چەند بیریارێکیان هەڵدەبژێرم و هەندێک لایەنی کاریگەرێتیەکەی ئاشکرادەکەم. بۆئەم کارەش بەپێویستی دەزانم لەو بیریارانەوە دەستپێبکەم، کەکاریگەرێتیەکەی هایدیگەر ڕاستەوخۆو بەزەقی لەنێو بیرکردنەوەی فەلسەفییاندا خۆی دەرخستوەو بەئاسانی دەناسرێتەوە.

هایدیگەر ڕاستەوخۆ کاریکردۆتەسەر بزوتنەوەی فەلسەفی بوونگەرایەتی فەڕەنسا. ئەم کارتێکردنەش لەڕێگەی سارتەرەوە بوە، بەڵام، وەکو میسارۆز دەڵێت ، سارتەر بەوشێوەیەی بەئاشکرا ئاماژە بۆ کاریگەرێتی هیگڵ بەسەر

مارکسەوە دەکات، باسی کاریگەیێتی هایدیگەر بەسەر بیرکردنەوەی فەلسەفی خۆیەوە ناکات.[175] سارتەر بێجگە لەوەی بەنوسەرێکی گەورە ناسراوەو لەساڵی ١٩٦٤ خەڵاتی (نۆبڵ) ی پێدراوەو وەرینەگرتوە، یەکێکە لە پێشەوایانی فەلسەفەی بوونگەرایەتی و لەگەڵ سیمۆن دیبۆڤوارو میرلۆپۆنتیدا رۆڵێکی گرنگیان لەپێشخستنی ئەم بزوتنەوە فەلسەفیەدا بینیوە. سارتەر یەکەمجار لەگەڵ فێرگەی فەلسەفی فینۆمینۆلۆجی هوسرڵدا ئاشنابووە، لەدواییشدا هایدیگەری ناسیوە. ئاشنابوونی سارتەر لەگەڵ فێرگەی فینۆمینۆلۆجیدا بەرێگەی(رایمۆند ئارۆن) ەوە بووە. سیمۆن دیبۆڤوار دەگێرێتەوە، کە ئارۆن پاش گەرانەوەی لەئەڵمانیا لەگەڵ سارتەرو سیمۆندا لەقاوەخانەیەک یەکدی دەبینن. سارتەر لەسەر بۆچوونە فەلسەفیە نوێکانی دەدوێت و ئارۆنیش نزیکی بۆچوونەکانی لەفێرگەی فینۆمینۆلۆجیەوە بۆ سارتەر باسدەکات و فینۆمینۆلۆجی پێدەناسێنێت. ئارۆن لەئەڵمانیا فەلسەفەی خوێندووەو خوێندکاری هوسرڵ بووە. سارتەر، پاش ئەم چاوپێکەوتنە پەرتووکەکەی ئێمانوئێل لێڤیناس لەسەر فینۆمینۆلۆجی دەکرێت.[176] هەوەها سارتەر داوا لە ئارۆن دەکات ساڵێک لە جێگاکەی مامۆستایەتی بکات و ئەمیش بۆ لێکۆڵینەوە بڕوات بۆ ئەڵمانیا. ئارۆن بە

[175] Istvan Meszaros. *The Work of Sartre: Search for Freedom,* vol.1, London: The Harvester Press, 1979. P. 27

[176] Simone de Beauvoir. *The Prime of Life*, translated by Peter Green, New York: Penguin Books, 1965. P. 135



داواکەی سارتەر ڕازیدەبێت و لەساڵی ١٩٤٠ سارتەر بۆ ساڵێک دەڕواتە خوێندنگای فەرەنسا لە بەرلین و لەبەر ڕۆشنایی فەلسەفەی فینۆمینۆلۆجیدا نوسراوەکەی *The Transcendence of the Ego*. دەنوسێت.[177] لەم سەردانەدا، سارتەر لەشاری بەرلین ماوەتەوەو بۆ فرایبۆرگ، کەهوسرڵ و هایدیگەری تیاژیاوە، نەچووە. ناسینی هایدیگەریش دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٤٠ و بەدیل گرتنی سارتەر لەلایەن ئەڵمانیاوە. لەم ساڵەدا سارتەر بەدیل دەگیرێت و دواجار لەئۆردوگای *Stalag X11- D* نزیک شاری (تریەر) دادەنرێت. چەند کەشیشێک ڕۆژانە سەردانی ئۆردوگاکە دەکەن و لەگەڵ سارتەردا ئاشنادەبن. پاش چەند گفتوگۆیەکی فەلسەفی یەکێک لەکەشیشەکان پە رتووکی(بوون و کات) ی هایدیگەر بەنهێنی دەدات بە سارتەر. پاش خوێندنەوەی پەرتووکەکە سارتەر دەکەوێتە ژێر کاریگەرێتی هایدیگەر و دەبێت بە یەکێک لە شوێنکەوتوانی فەلسەفەکەی. لەیاداشت نامەکەیدا ڕۆژی ٢٣ ی نیسانی ١٩٤٠، دوای بەربوون و گەڕانەوەی بۆ فەرەنسا دەنوسێت،

ڕۆمانەکەم (ڕشانەوە- *Nausea* ) هۆسرڵانەیە، بەڵام

[177] Annie Cohen- Solal. *Sartre a Life*, London: Minerva, 1991. P. 91

هەروەها بڕوانە: Ronald Hayman. *Sartre: A Biography*, New York: Simon and Schuster, 1987. Pp. 172-73

من ئێستا خۆم بەلایەنگری هایدیگەر دادەنێم.[178]

پاش جەنگی جیهانی دووەم و داگیرکردنی ئەڵمانیا لەلایەن هێزە فرەنەتەوەییەکانەوە، ناوچەی خوارووی ئەڵمانیاو فرایبۆرگ کەوتە ژێر دەستی فەرەنسا. چەند ئەفسەرێکی فەرەنسی چەند بەرهەمێکی هایدیگەریان خوێندبووەوە و سەردانی ئەم بیریارەیان دەکرد. یەکێک لەم ئەفسەرانە بەناوی Frederic de Towarinicki هەوڵدەدات پەیوەندی نێوان هایدیگەر و سارتەر دروستبکات و چاوپێکەوتنێکیان بۆ ڕێکبخات. ئەم پلانەی(تۆوارینیکی ) لەبەر سەختی هاتوچۆکردن و (ڤیزە) بۆ سەفەرکردن لەئەڵمانیاوە بۆ دەرەوە یان لەدەرەوە بۆ ئەڵمانیا ڕێنەکەوت. بەڵام هایدیگەر و سارتەر بەنامە لەوکاتەوە پەیوەندییان لەگەڵ یەکدا هەبووە. هایدیگەر لەنامەیەکدا بۆ سارتەر دەنوسێت،(ئومێدەوارم پێکەوە بتوانین بیرکردنەوە بۆ ئەو ئەزموونانە بگەڕێنینەوە، کە مێژوو تۆماردەکەن و مرۆڤی سەردەمیش لەوجێگەیەدا دابنێین، کە پەیوەندییەکی ڕەسەنانەی بەبوونەوە هەبێت.)[179] لەکۆتایی ساڵی ١٩٥٢، دوانزە ساڵ پاش خوێندنەوەی پەرتووکەکانی هایدیگەر و

[178] Annie Cohen- Solal. *Sartre a Life,* p. 141

[179] Rudiger Safranski: *Martin Heidegger betwean Good and Evil*,

traslated by Ewald Osers, Massachusetts: Harvard University Press, 1999. P. 347



نامەگۆڕینەوە بۆیەکەمجار سارتەر بۆسەردانی هایدیگەر بۆ فرایبۆرگ ڕۆیشت.[180]

هایدیگەر لەزۆر لایەنەوە لەگەڵ بۆچوونە فەلسەفیەکانی سارتەردا هاوڕابووە و ڕەخنەی لەچەندلایەنێکیش گرتووە. سارتەریش، بەهەمان شێوە، هەرچەندە(هایدیگەری) بووە لەسەر چەندکێشەیەکیش لەگەڵ هایدیگەردا ڕێنەکەوتووە. پاش کۆڕەکەی سارتەر لەسەر بوونگەرایەتی و مرۆڤایەتی جان بێوفرێت Jean Beaufret یەکێک لە شوێنکەوتوانی فەلسەفەی هایدیگەر لەفەرەنسا، نامەیەک سەبارەت کۆڕەکەی سارتەر بۆ هایدیگەر دەنوسێت و لەبارەی پەیوەندی فەلسەفەی بوونگەرایەتی هایدیگەر بە مرۆڤایەتیەوە دەپرسێت.

هایدگەریش بەنامە وەڵامی جان بێوفرێت دەداتەوە و ئەم نامەیەش بەناوی (نامەیەک لەسەر مرۆڤایەتی- Letter on Humanism) بڵاوکراوەتەوە. هایدیگەر، لەم نامەیەدا، دوو ڕەخنەی لە سارتەر گرتووە. یەکەم ، هایدیگەر لەو باوەڕەدایە سارتەر خۆی لە کاریگەرێتی دێکارت ڕزگارنەکردووە. وەرگێڕانی کۆجیتۆ دێکارتیەکەش لەناوەڕۆکەوە بۆ بوون گۆڕانێکی مێتافیزیکی بنەڕەتی نەهێناوەتە کایەوە،

[180] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٣٥٠

سارتەر خەسڵەتی بنەڕەتی بوونگەرایەتی بە جۆرە
دەستنیشان دەکات: بوون پێش ناوەڕۆک دەکەوێت. لەم
دەستە واژەیەدا (بوون) و(ناوەڕۆک) لەسەرچاوە
مێتافیزیکییەکەیانەوە وەرگیراون، کە لەسەردەمی
ئەفلاتونەوە بەکارهێنراون و ( ناوەڕۆک) لەپێشتر دانراون.
سارتەر دەستەواژەکەی وەرگێڕاوە. بەڵام وەرگێڕانی
دەستەواژەیەکی مێتافیزیکی، وەکو خۆی مێتافیزیکیانەیەو
سارتەر لەگەڵ ئەو شێوە میتافیزیکیەدا دەمێنێتەوە، کە
ڕاستی بوون لە بیردەکات.[181]
ڕەخنەی دووەمی هایدیگەر دەگەڕێتەوە بۆ شێوەی
مامەڵەکردنی سارتەر لەگەڵ (خۆ) دا.
بەدیدی هایدیگەر، سارتەر زیاتر جەخت
لەسەر(خۆگەرایەتی) دەکات وکەمتر ئاوری لە
(بابەتگەرایەتی) داوەتەوە.[182]

ئاشکرایە، سارتەر خۆی بەلایەنگر و پارتیزانی هایدیگەر داناوە. پەڕتووکەکەشی (بوون و نەبوون) ، کە توێژینەوەیەکی ئۆنتۆلۆجی فینۆمینۆلۆجیانەیە کاریگەرێتی هوسرڵ و هایدیگەری بەسەرەوە دیارە و لەزۆرشوێنیشدا سارتەر ئاماژەی بۆ بۆچوونە فەلسەفیەکانی هایدیگەر کردووە. بەڵام زمانی فەلسەفی سارتەر هایدیگەری نیەو

[181] Martin Heidegger. "Letter on Humanism", in *Basic Writings*, p. 232

[182] هەمان سەرچاوە.



ئەم بیریارە، هایدیگەر گوتەنی، لەژێر کاریگرێتی نەریتی دێکارتیدا ماوەتەوە و زمانی فەلسەفی دێکارت و هیگڵ بۆ دەربڕینی بیروباوەڕە فەلسەفیەکەی بەکاردەهێنێت. ئەمەش بۆ هایدیگەر گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی ناهێنێتەکایەوە. زمانی فەلسەفی بەستراوە بە بیرکردنەوەی فەلسەفیەوە. بۆ بەرپاکردنی شۆڕشێکی فەلسەفی بەسەر نەریتی زاڵبوی دێکارتی و فەلسەفەی تازەگەرایەتییدا پێویستە زمانە فەلسەفیەکەشمان بگۆڕین و زمانێکی نوێ بۆ دەربڕینی بیرکردنەوە شۆڕشگێڕانە فەلسەفیەکەمان دامەزرێنین. لەبەر ئەمەشە هایدیگەر زمانێکی فەلسەفی نوێ لە شیکردنەوە بوونگەرایەتیەکەی بوونی مرۆڤدا داهێناوە و زاراوەی(خۆ)، بۆنموونە، بۆ بوونی مرۆڤ دانانی و ئەم بوونەی بە(دازاین- بوون لێرە) ناساندووە. سارتەر لەناسین و شیکردنەوەی ئەم بوونە بۆ زمانی فەلسەفی هیگڵ گەڕاوەتەوە و (بوون- بۆ-خۆ being-for- self) ی بەکارهێناوە. بوونی مرۆڤ لە فەلسەفەی هیگڵدا(خۆیەکی ئاگامەند) ە و(خۆ- ئاگا) یە، واتە ئاگای لە بوونی خۆیەتی و بونێکە بۆخۆی. هەبووەکانیش، وەکو مێز و درەخت و پەڕتووک، لە ئاگا بەدەرن و خۆ- ئاگانین و پڕ و تەواون و بوونێکن لەنێوخۆیاندا گیریانخواردووە و بەچی دیکە نابن. هەروەها سارتەر گەیشتۆتە ئەو ئاکامەی، کە بوونی مرۆڤ یان(تاک) تەنیا بوون- بۆخۆی نیە. هەموو تاکێک بوونێکە لەبەردەم بوونی تاکێکی دیکەدا. تاکی دیکە بوونی ئەم دەناسێ و بە گوێرەی ناسینەکە مامەڵەی لەگەڵدا دەکات و دەبێت بە بوونیک بۆ ئەو(بوون- بۆکەسانی

دیکە) .[١٨٣] بەبیروڕای من جیاوازییەکی سەرەکی نێوان هایدیگەرو سارتەر لەگەڵ (بوون- بۆ- کەسانی دیکە) ی سارتەردا سەرهەڵدەدات ودووشێوازی فەلسەفەی کۆمەڵایەتیشمان بۆ دیاریدەکات. لە شیکردنەوە بوونگەرایەتیەکەی هایدیگەردا بوونی کەسانی دیکە پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجیە بۆ بوونی (من). (من) بەبێ ئەوان نابم. بوونیشم – لەگەڵ- ئەواندا دووشێوازی هەیە: ڕەسەن و نارەسەن. لەهەردوو شێوازەکەدا(من) بە(نیگەرانی- Care) یەوە مامەڵە لەگەڵ ئەوانەدادەکەم. ئەمەش ئەوە دەرناخات، کە بوونی(من) لەگەڵ ئەواندا بێ ناکۆکی و بەرەنگارییە. هەوڵدانی(من) بۆ چەسپاندنی ڕەسەنیەت و مانەوەی ڕەسەنیەتی بوونم (من) دەخاتە نێو بەرەنگاری و ناکۆکییەوە. ئەم بۆچوونە نزیکبوونەوەیەکە لە بۆچوونەکەی هیگڵ و تەفسیری هیگڵ بۆ مێژوو. نکۆڵی لەوەناکرێت، کە هایدیگەر بەبێ ئاماژەکردنی بۆ هیگڵ لە توێژینەوەکەیدا ئاوەڕیلێداوەتەوە. بەڵام نزیکبوونەوەی سارتەر لەهیگڵەوە، لەسەرئەم کێشەیە، تەنیا ئاوەڕدانەوە نیەو لەژێرکاریگەرێتی تەفسیری هیگڵدا بۆ مێژوو بناخەی فەلسەفە کۆمەڵایەتیەکەی دامەزراندووە. دیالیکتیکی( کۆیلە و خاوەن کۆیلە) ، لە فینۆمینۆلۆجی هۆشدا بووە بە قاڵب بۆ داڕشتنی کەرەسەی بیرەکانی. لە فەلسەفەی کۆمەڵایەتی سارتەردا تاکەکانی نێو کۆمەڵ

[183] Jean- Paul Sartre. *Being and Nothingness*, translated by H. Barnes, London: Routledge, 1996. Pp. 221- 23



یان(بوون- بۆ- خۆ) هاوکات (بوون- بۆ- کەسانی دیکە) یە. ئەم دوولایەنەی بوونی مرۆڤ(بوون- بۆخۆ و بۆ- کەسانی دیکە) کێشەی ناکۆکی و زۆرانبازی دەهێنێتەکایەوە. ژیانی کۆمەلایەتیمان لە شێوازی چینایەتیدا، دەزگاو تاکەکان، نێرینەو مێینەدا هەمیشە لەنێو ناکۆکیدایە، کە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی زۆرانبازی لەنێوانیاندا و تێکۆشان لەپێناوی سەربەستیدادەردەخات. تاک، بە بەردەوام، لەنێو ناکۆکیەکان و زۆرانبازییدا دەژی. تەنانەت (خۆشەویستی) یان پەیوەندی سێکسی نێوان تاکەکانی کۆمەڵیش بەشێکەلەم زۆرانبازییە، کە تێدا لایەنێک دەیەوێت لایەنەکەی دیکە داگیربکات.[١٨]

لە ئاکامدا(بەیەک بوون) دەبێت بەکێشەیەکی مەحاڵ، چونکە بۆ ئەوەی دوولایەنی ناکۆک و دژوەستاو لەزۆرانبازییەکەیاندا ببن بەیەک لایەنێک دەبێت ئەوی دی لەناوبەرێت و جیاوازییەکانی بسڕێتەوە. جیاوازییەکانیش فەوتانی ئەوی دی وبڕوانەکردنە بەبوونی وەکو شتێکی جیاواز و گەیشتنە بە ناسنامەیەکی ڕووتکراوە ( Abstract identity). ئەم جۆرە ناسنامەیەش لەنێو شێوازی بیرکردنەوەی فەلسەفی بوونگەرایەتیدا جێگەی نابێتەوە و

[184] من لەنوسراوێکی دیکەدا ئەم کێشەیەم بەدرێژی باسکردووە و واتای (خۆشەویستی) م لای سارتەر و بوونگەرایەتی ڕوونکردۆتەوە، بڕوانە: محەمەد کەمال، فەلسەفەی سارتەر و خوێندنەوەیەکی نوێ، دەزگای سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٤ ، لاپەرە، ١١٠- ١٢

هەموو ناسنامەیەک لێکچونێکە، کە تێیدا جیاوازییەکان پێکەوە دەژین. بێگومان هیگڵ و هایدیگەر و سارتەر لەسەرئەم خاڵە هاوڕان. هیگڵ لەئاکامدا گەیشتۆتە ئەوباوەڕەی کۆمەڵگایەک پەیدابێت، کە لایەنەدژەکان(بڕوانامە) بەیەکدی بدەن و پێکەوەژیانی جیاوازییەکان تیایدا مسۆگەربێت و هایدیگەریش پێشمەرجی (نیگەرانی) کردووەبە بناخەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانمان و و سارتەریش لەپەرتووکەکەیدا لەسەر (ڕەوشت) لەڕوانگەی فەلسەفەکەی هیگڵەوە باسی پێکەوەژیانی لایەنە جیاوازەکان و بەرانبەرە یەکسانەکان دەکات و تەنانەت لەوباوەڕەدایە خۆشەویستی لەوێداسەرهەڵدەدات، کە دوولایەنەکە باوەڕ بەسەربەستی یەکدی بکەن و هیچ لایەنێکیان دەستەڵاتی خۆی بۆ داگیرکردنی لایەنەکەی دیکە نەخاتەگەر.[185]

سارتەر لەسەرکێشەی مردنیش لەگەڵ هایدیگەر هاوڕانیە. لەپێشتر باسمانکرد، کە(مردن) لەبیرکردنەوەی فەلسەفی هایدیگەردا ڕۆڵێکی سەرەکی لەگەڕانەوەی (خۆ) بۆ ڕەسەنیەتی بوون هەیە. هەروەها (مردن) دواپڕۆژەی حەتمی بوونە و مرۆڤ بە(کۆتایی) دەگەیەنێت. لەبەرئەوەی مرۆڤ دەمرێت ئەوا بەنیگەرانیەوە لەنێو جیهانداو لەگەڵ کەسانی دیکەدا دەژی و واتا بە بوونی دەدات. سارتەر لەوباوەڕەدانیە، کە بوونی مرۆڤ، بوونێکە بەرەو مردن و

185 هەمان سەرچاوە.



مردنیش نابێتەهاندەر بۆ واتا بەخشین بە بوون، بەڵکو بە پێچەوانەی ئەم بۆچوونەوە، مردن هەموو واتاکان لەناودەبات ژیان بێ واتادەکات. ئێمەش لە مردن بەئاگاین، یان دەزانین دەمرین چونکە لەگەڵ کەسانی دیکەداین. ئەوان لەبەرچاوی ئێمە دەمرن یان لەبارەی مردنی ئێمەوە دەدوێن. ئەگەر کەسانی دیکە نەبوونایە و (من) لەگەڵ ئەواندا نەژیابامایە، نەمدەزانی مردن هەیە. ئەگەر کەسانی دیکە نەبن، ئێمەش لەبارەی مردنەوە هیچ نازانین و لەو چارەنوسەمان بەئاگانەدەبوین. لەو حاڵەتەدا مردن دەبوو بە نەمانێکی کتوپڕی مرۆڤ و جیهان، خۆ و بابەت واتاکان و شتەپڕواتاکانیش.[186] لەگەڵ ئەم جیاوازیانەشدا سارتەر بەبێ کاریگەرێتی هایدیگەر نەیتوانیوە بیرکردنەوە فەلسەفیە بوونگەرایەتیەکەی خۆی دامەزرێنێت. هەرچەندە، وەکو هەندێک بیریاری دیکە، کە لەژێر کاریگەرێتی هایدیگەردا بوون، سارتەر زۆر خۆی لە فەلسەفەی مارکس نزیک کردۆتەوە، هێشتا ئەم نزیکبوونەوەیە ش نەبۆتە هۆی دوورکەوتنەوە ی لە هایدیگەر.

بیریارێکی دیکە، کە هایدیگەر کاریگەرێتی کردۆتەسەر(هانا ئارنت Hannah Arendt) ە. ئەم ژنە فەیلەسوفە لە خێزانێکی بەبنەچە(جو) بووە و لەساڵی ١٩٢٤ لە زانکۆی ماربۆرگ (Marburg) بووە بە خوێندکاری

186 Jean- Paul Sartre. *Being and Nothingness*, p. 545

فەلسەفە و لەژێر دەستی هایدیگەر فەلسەفەی خوێندووە. لەسەرەتاوە لەگەڵ خوێندکارەکانی دیکەدا تەواناو بلیمەتی هایدیگەری دۆزیوەتەوەو خۆی لەمامۆستاکەی نزیککردۆتەوە. بەبڕوای هانا هایدیگەر نەک یەکێکە لەپاشا نەناسراوەکانی فەلسەفە بەڵکو باشترین مامۆستاش بووە و لەنامەیەکدا، ساڵێک پێش مردنی بۆ هایدگەر دەنوسێت، (هیچ کەسێک پێش تۆو دوای تۆش ناتوانێت، وەکو تۆ، مامۆستابێت) .[١٨٧] پەیوەندی نێوان هایدیگەر و هانا خۆشەویستی و هاوڕێیەتیەکی بەردەوام بووە. ئەم دووبیریارە، هەرچەندە نەبوون بەهاوسەر، بەڵام تاکو دواڕۆژی ژیانیان یەکدییان خۆشویستوە. ئەم پەیوەندییەش بەسێ قۆناخدا ڕۆیشتوە. قۆناخی پێش جەنگی جیهانی دووەم و قۆناخی جەنگ و قۆناخی دوای جەنگ قۆناخی پێش جەنگ لە ساڵی (١٩٢٥) وە، دەستپێدەکات. هانا لەساڵی ١٩٢٤ لە زانکۆی مالبۆرگ لەبەشی فەلسەفە بەخوێندکار وەردەگیرێ و هایدیگەریش دەبێت بەمامۆستای. پاش ساڵێک هایدیگەر و هانا پەیوەندی خۆشەویستی دەبەستن. لەکۆتایی ساڵی ١٩٢٦، هایدیگەر هانا بۆ لای کارڵ

[187] Elzbieta Ettinger. *Hannah Arendt and Martin Heidegger*, New Haven: Yale University Press, 1995. P. 7
{لەزانکۆکانی ماربۆرگ و فرایبۆرگ ئەم خوێندکارانە هانا ئارنت، کارل لویس، هانس جۆناس، هەربەرت مارکۆز، هانس- جورج گادەمەر، ماکس هۆکایمەر، ئۆسکار بێکەرو فریتس کاوفمان. کەهەموویان بیریارو فەیلەسوفن، لەژێردەستی هایدیگەردا خوێندویانە.}



یاسپەرزی هاوڕێی لەزانکۆی هایدڵبەرگ، بۆ خوێندنی دکتۆرا دەنێرێت. هانا دکتۆراکەی لەسەر(سانت ئۆگستاتن) لەساڵی ١٩٢٨ لەژێر سەرپەرشتی یاسپەرز تەواودەکات. لەساڵی ١٩٢٩ پەیوەندی خۆشەویستی لەگەڵ خوێندکارێکی هایدیگەر بەناوی گۆینتەر شتێرن Guenther Stern دەبەستێ و دەبن بەهاوسەرو لەشاری هایدڵبەرگ جێنشین دەبن. هایدیگەر لەوساڵەدا لەمانگی ٩ دا دەچێتە سەردانیان و دەبێت بەمیوانیان. پاش چەند ڕۆژێک هاوسەرەکەی هانا( گۆینتەر شتێرن) بڕیاردەدات لەگەڵ هایدیگەرد ابڕوات بۆ فرایبۆرگ و هانا لەگەڵیاندا تاکو ئێستگەی شەمەندەفەرەکە دەڕوات. پاش بەڕێخستنیان نامەیەک بۆ هایدیگەر دەنێرێت و تیایدا دەنوسێت،

من لەبەردەمتا ڕاوەستام. تۆ منت بینی و لەپڕ تەماشای ئاسمانت کرد، نەتناسیمەوە. کاتێک منداڵ بووم دایکم بۆ ئەوەی بمترسێنێت بەو جۆرە تەماشای دەکردم. ئەو چیرۆکەم خوێندبووەوە کە پاڵەوانەکەی ئەوەندە لوتی درێژ ببوو کەس نەیدەناسیەوە. دایکم وای دەردەخست، کەمنیش لوتم درێژبووە. ئێستاش ئەو ڕۆژەو ئەو ترسە گەورەیەی لەدڵمدا بوو، لەبیرمە. ئەگریام و هاوارم دەکرد، دایە من هانام، من منداڵەکەی تۆم. ئەمڕۆ جارێکی دیکە ئەوە لەمن

ڕوویدایەوە.[188]

ئەم نامەیەی هانا بۆ هایدیگەر دووهۆکاری هەیە. هۆکاری یەکەم وابەستە بە(غیرە) کردنی هانا لەهاوڕێیەتی هایدیگەر و شتێرن و چوونی هەردووکیان پێکەوە بۆ فرایبۆرگ و مانەوەی هانا بەتەنیا لە هایدلبەرگ. دووەمیش، کاتێک هایدیگەر و شتێرن لەنێو شەمەندەفەرەکە دانیشتون و لەپەنجەرەکەوە تەماشای هانایان کردووە و هایدیگەر ڕووی وەرگێڕاوە، ئەوە دەگەیەنێت، کەهانا هەستیکردووە هایدیگەر نایەوێت بیبینێت و خۆشی ناوێت. هەردوو هۆکارەکە ئاماژەی خۆشەویستیەکەی هانا بۆ هایدیگەر دەکەن، کەلەم نامەیەدا بەئاشکرا دەردەکەوێت. هاوسەرێتی نێوان هانا و شتێرن تەمەن کورت بوو. لەساڵی ١٩٣٦ هانا لەگەڵ هێنریش بلۆیشەر Heinrich Bluecher، کە کۆمەنیست و یەکێکیش بوو لەوانەی هایدیگەری لەرێگەی نوسینەکانیەوە دەناسی و هەموو بەرهەمێکی خوێندبووەوە، بوون بەهاوڕێ و لەدوایشدا هاوسەر. بەڵام هانا بەردەوام لەگەڵ هاوسەرەکەی پێشوی(شتێرن) دا پەیوەندی دەکرد و تەنانەت شتێرن یارمەتی هانا و بلۆیشەری دا بۆ ئەمەریکادەرچن.

---

[188] Ursula Ludz (ed.). *Letters 1925- 1975: Hannah Arndt and Martin Heidegger*, translated by Andrew Shields, New York: Harcourt, Inc., 2004. P.51



قۆناخی دووەمی پەیوەندی نێوان هاناو هایدیگەر لەگەڵ جەنگی جیهانی دووەمدا دەستپێدەکات. لەم قۆناخەدا هایدیگەر و هانا لەیەکدی پچڕان. هانا لەبەرئەوەی (جو) بووە، هاوسەرە نوێکەشی کۆمۆنیست ناچاربوون بۆ فەرەنسا ڕابکەن و لەوێوە بڕۆن بۆ ئەمەریکا. لەم قۆناخەدا هیچ پەیوەندییەک لەنێوان هایدیگەر و هانادا نامێنێت. لەقۆناخی سێیەمدا بەتایبەتی لەساڵی ١٩٥٠، هانا لە ئەمەریکاوە دێتەوە بۆ سەردانی هایدیگەر بۆ فرایبۆرگ دەڕوات. لەگەڵ هایدیگەردا جارێکی دیکە تاکو ئەو ڕۆژەی دەمرن هاوڕێیە تیەکەیان زیندوو دەبێتەوە.

بەدیدی ئیلزەبیتا ئێتینگەر، هانا زۆرهەوڵیداوە خۆی لەژێر کاریگەرێتی سۆزو خۆشەویستیەکەی بۆ هایدیگەر ڕزگاربکات، بەڵام نەیتوانیوە، بۆیە لەنامەیەکدا بۆ هاوسەرەکەی دەنوسیت،

ئازیزم

نیگەرانیم بۆ هایدیگەر ئەوەندە ئاسان نیە، وەکو بۆم باسکردیت. نەچوونی منیش بۆلای ڕێکەوتنێکی بێدەنگە لە نێوانماندا. لەنامەیەکی دیکەدا دەنوسێت، لەوکاتەوە لە(بارکلی) دەژیم هەواڵی هایدیگەر نازانم. هەموو ساڵێک لەڕۆژی لەدایکبوونیدا کارتی پیرۆزباییم بۆناردووە. ئەو وەڵامی نەداوەمەتەوە و تەنانەت کارتی بە بۆنەی ڕۆژی

لەدایکبوونمەوە نەناردووە.[189]

هانا، وەکو بیریارو فەیلەسوفێک بۆ ئەڵمانیا گەڕایەوە. پەرتووکەکانی لەبازاڕو پەرتووکخانەی زانکۆکاندا بوو، کۆڕەکانی لە ڕۆژنامەکاندا باسدەکرا. هایدیگەر دەیزانی (هانا) گەڕاوەتەوە بۆ ئەڵمانیا. بەڵام بێدەنگ بوو. هانا بۆ دۆزینەوەی هایدیگەر چوو بۆ فرایبۆرگ. کاتێکیش یەکدییان بینیەوە، هاوڕێیەتی و خۆشەویستیەکەیان بەگەرمی مابوەوە و بەردەوام بوو. هانا لەم بارەیەوە دەڵێت، (هیچ گۆڕانێک لە نێوانماندا ڕوونەداوە.)[190] لەساڵی ١٩٥٦ دا لەسەردانی کارڵ یاسپەرزدا باسی خۆشەویستیەکەی بەرانبەر هایدیگەر دەکات و گوایە هایدیگەر سەرچاوەی ئازارو خۆشی ئەوە. یاسپەرز داوای لیدەکات خۆی لەوخۆشەویستیە ڕزگاربکات و لەهایدیگەر دووربکەوێتەوە، بەڵام هانا لەیاسپەرز ناڕازدەبێت و پێشنیارەکەی

189 Elzbieta Ettinger. *Hannah Arndt and Martin Heidegger*, p.103

190 هەمان سەرچاوە، لاپەرە ١٠٥.{ هایدیگەر لەم کاتەدا ژنێکی دیکەشی بەناوی ئێلزانێت بلۆکمان Elisabeth Blochmann ، کەبەبنەچە (جو) بوو، لەزانکۆش مامۆستا بوو، خۆشدەویست. ئێلیزابێت لە ساڵی ١٩٦٩ دا مردووە.}



وەرناگرێت.[191] هانا لە فرایبۆرگ لەئوتێلەوە نامەیەک بۆ هایدیگەر دەنیرێت. ئەو کاتە هایدیگەر لە زێرینگن Zahringen، گوندێکی نزیک فرایبۆرگ ژیا وە. هایدیگەر نامەکەی پێدەگات و وەڵامی دەداتەوە،

خۆشەویستەکەم هانا

خۆشحاڵم بەوەی جارێکی دیکە هاوڕێیەتیەکەمان دروست دەبێتەوە. حەزدەکەم سەردانم بکەیت و ئێوارە کات ژمێر هەشت یەکدی ببینین. هاوسەرەکەم، کەهەموو شتێک لەبارەی ئێمەوە دەزانێت بەخێرهاتنت دەکات، بەڵام بەداخەوە ناتوانێت ئێوارە بتبینێت. نامەکەت پاش نیوەڕۆ گەیشتەدەستم . من لە (زێرینگن) تەلەفونم نیە و بەریدیش داخراوە ناتوانم لەوێوە تەلەفونت بۆ بکەم. من خۆم ئەم نامەیەت لە ئوتێلەکە بۆ دادەنێم .

مارتن.[192]

مارتن هایدیگەر و هانا ئارنت پاش حەڤدەساڵ یەکدییان بینیەوە. لەو کاتەدا تەمەنی هایدیگەر شەست و هانا چل وچوار ساڵان بوو. لەو ڕۆژەوە هانا، وەکو ژنێکی بیریاری جو، بوو بەپارێزەری بەرگریکردن لەهایدیگەر و هەڵوێستە

191 هەمان سەرچاوە. لاپەرە ١٠٩

192 Ursula Ludz (ed.). *Letters 1925- 1975: Hannah Arndt and Martin Heidegger*, p. 57

ڕامیارییەکەی. هەوڵیدا لەئەمەریکا بەرهەمەکانی بەزمانی ئینگلیزی بڵاوبکاتەوە، بەتایبەتی لەوکاتەدا، کە هایدیگەر هەژارانە دەژیا و باری ئابووری خراپ بوو. هایدیگەر لە پێش مردنیشی لەنامەیەکدا بەهانا دەڵێت، (تۆ سۆزی ژیانم بوویت.)[١٩٣]

هانا دکتۆراکەی لەژێر چاودێری و سەرپەرشتی کارڵ یاسپەرز لەهایدلبەرگ لەسەر خۆشەویستی لە فەلسەفەی سانت ئۆگۆست لەساڵی ١٩٢٨ تەواوکرد. توێژینەوەکەی و تێگەیشتنی بۆ بابەتی نامیلکەکەی لەژێر کاریگەرێتی فەلسەفەی هایدیگەردا بەتایبەتی بیرەکانی (بوون وکات) دا خەمڵی. هانا لەڕوونکردنەوەی واتای خۆشەویستی لای بیریارێکی مەسیحی وەکو سانت ئۆگۆست دەگاتە ئەو ئاکامەی، کە بیری مەسیحایەتی ڕێگە بەمرۆڤ نادات خۆشەویستی بۆ جیهان هەبێت. خۆشەویستی مرۆڤ بە بوونێکی بەرز و لەژوور جیهانەوە دەبەستێتەوە. خۆسەویستی بۆ جیهان و لەنێو جیهاندا ڕەتدەداتەوە. ئەمەش بەپێچەوانەی بۆچوونەکانی هایدیگەرە، کەبوون_ لەنێو_ جیهان بەپێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی و مرۆڤیش بە بوونەوەرێکی جیهانی دادەنێت. ژیان لە (مەنفا) و

[193] هایدیگەر شاعیریش بووە. چەند هۆنراوەیەکی بۆ هانا ئارندت نوسیوە و بەنامە بۆی ناردووە. ئەم هۆنراوانە لەگەڵ نامەکانی هایدیگەر بۆ هانا بڵاوکراونەتەوە.



(جولەکە) و کێشەی دژی جولەکە لای هانا بوون بەهەوێنی بیرکردنەوەکانی. هاندەرێک بوون بۆ خۆماندووکردن بەفەلسەفەی ڕامیاری و کارکردن بۆ جولەکە و نوسین لەسەر کێشە ڕامیارییەکان بەتایبەتی ڕژێمی ڕامیاری (تۆتەلیتالیزم)، وەکو ڕژێمی نازییەکان و ستالینیزم . دیسانەوە، لەژێر کاریگەرێتی هایدیگەردا، هانا لەوباوەڕەدایە، کە ئەم ڕژێمانە هەرچەندە بانگەشەی جیاوازی لە ئایدیۆلۆجیدا دەکەن، بۆ نموونە ئایدیۆلۆجی نازییەکان لە ستالینیزمەوە جیاوازە، هەردووکییان ڕژێمێکی زوڵمکەرو سەرکوتکەرن. هۆی سەرهەڵدانی ئەم ڕژێمانە بۆ بارودۆخی ناوخۆیی و ناوچەیی ناگەڕێنەوە و وابەستن بە ناوەڕۆکی (تازەگەرایەتی) و تێگەیشتنی تازەگەرایەتی لە بوونی مرۆڤ و جیهان. هەروەها ئەم ڕژێمانە کەلتوورێکی بازاڕی دەهێننەکایەوە، کە تاکەکانی مرۆڤ تیایدا نامۆ دەبن و ڕێگەیان پێنادرێت ڕەسەنانە ناوەڕۆکی خۆیان داهێنن[١٩]. حەزدەکەم ئەو خاڵە باسبکەم، کە توێژینەوەکەی هانا لەسەرئەم ڕژێمی ڕامیارییە سەرکوتکەرانە یەکێکە لەو هەوڵدانانەی پاش جەنگی

[194] Margaret Canovan. *Hannah Arendt: A Reinterpretation of Her Political Philosophy*, Cambridge: Cambridge University Press, 1992. P. 20

*The Human Condition* (١٩٥٨) لەم بیرکردنەوە ڕامیارییە بوونگەرایەتیە دەدوێت.

جیهانی دووەم هاتنەکایەوە. گەلێک بیریاری دیکەش، بەتایبەتی ئەوانەی بەبنەچە جولەکەو ئەڵمانی بوون دەیانویست لەناوەڕۆکی ئەم دیاردە ڕامیارییە تێبگەن. بۆنموونە بیریارانی فێرگەی فرانکفۆرت لە ڕوانگەیەکی مارکسی و فرۆیدییەوە دەیانڕوانیە ئەم دیاردەیە و تەفسیری ناوەڕۆکەکەیان دەکرد. بیرکردنەوەی ڕامیاری هانا بوونگەرانە (بوونخوازانە) یەو لەبیرکردنەوەی فەلسەفی هایدیگەرەوە هەڵقولاوە. بیرکردنەوەیەکە لەسەر بۆچوونەکانی نێو(بوون وکات) سەبارەت بە بوونی ڕەسەن و ژیانی ڕۆژانەو بوون- لەگەڵ کەسانی دیکە دامەزراوە.

هانا، وەکو هایدیگەر، لەوباوەڕەدایە مرۆڤ لە بواری رامیارییدا دەبێت سەربەستانەو داهێنەرانە (ڕەسەنانە) ڕۆڵی مێژوویی خۆی ببینێت و بوونی داگیرنەکرێت. لەپەڕتووکەکەیدا ڕووداوەڕامیارییەکان لەنێو زەمینەی مێژوودا بۆ مرۆڤە ڕەسەنەکان دەبن بەو پڕۆژانەی لەڕێگەیانەوە ناوەڕۆکی خۆیان دادەمەزرێنن. لەم بۆچوونەوە ژیانی رامیاری داگیرکردن و چەوساندنەوەی دەستەو کۆمەڵ و چینێک نیە، بەڵکو بونیادنانی بناخەکانی بوونیکی رەسەن و سەربەستە، کەمرۆڤ بتوانێت بەو ناوەڕۆکە بگات خۆی دەیەوێت.

بیریارێکی دیکەی ئەم بەشەمان، کە لەهایدیگەرەوە نزیک بووەو هایدیگەر مامۆستای بووە (کارڵ لویس- Karl Löwith) ە. ئەم بیریارەش بەبنەچە جو بووەو لە میونیخ لەدایکبوە. بۆ



خوێندنی فەلسەفە لەساڵی ١٩٢٤ دەچێت بۆ فرایبۆرگ و دەبێت بەخوێندکار لای ئەدمۆند هوسڕڵ. کاتێک لەڕێگەی هوسڕڵی مامۆستایەوە هایدیگەر دەناسێت، کە ئەوکاتە هایدیگەر لە زانکۆی ماربۆرگ مامۆستابووە، هوسڕڵ جێدەهێڵێت و دەچێتەلای هایدیگەر.[١٩٥] ئەدمۆند هوسڕڵ لەوکاتەدا بەیەکێک لە فەیلەسوفە مەزنەکانی ئەڵمانیا دادەنرا. دامەزرێنەرو سەرۆکی فێرگەی فینۆمینۆلۆجی بوو. هایدیگەر مامۆستایەکی نوێ بوو، بەڵام ناوبانگی بلیمەتی ئەم مامۆستانوێیە گەیشتە زانکۆکانی ئەڵمانیا و خوێندکاران لەشارەکانی دیکەوە دەهاتن بۆلای.

شێوەی وانەگوتنەوەی هایدیگەر بووبە هۆکارێک بۆ وازهێنانی کارڵ لویس لەوانەکانی هوسڕڵ و گواستنەوەی بۆ زانکۆی ماربۆرگ و چوونەلای هایدیگەر. کارڵ لویس لەبارەی هایدیگەرەوە دەنوسێت،

پیاوێکی گەنم ڕەنگو کورتەباڵابوو، دەیزانی چۆن سیحرت لێبکات...... تەکنیکی وانە گوتنەوە پێکهاتبوو لە دامەزراندنی بونیادێکی ئاڵۆز بۆ بیرۆکەکان و هەڵوەشاندنەوەی ئەو بونیادە، کە خوێندکاران لە ئاستیدا

[195] کارڵ لویس بەتەمەن زۆر لەهایدیگەر بچوکتر نەبووەو جیاوازی تەمەنیان هەشت ساڵ بووە. کارڵ لویس لەساڵی ١٨٩٧ لەشاری مینونیخ لەدایکبووە.

واقیاندەورماو لە بۆشاییدا بەجێدەمان.[١٩٦]

کارڵ لویس بووبە خوێندکار لای هایدیگەر و دکتۆراکەی لەسەر (*Das individuum in der Rolle des Mittenschen*) لەژێر سەرپەرشتی هایدیگەر لەساڵی ١٩٢٨ تەواوکرد. لەم نامیلکەیەدا لویس مامەڵە لەگەڵ کێشەی بوونی تاک لەنێو کۆمەڵدا یان (بوون_ لەگە ڵ) ی هایدیگەردا دەکات و ڕەخنەگرانە هەڵیدەسەنگێنێت. لەوباوەڕەدایە، کە جیهان بەتەنیا جیهانی تاکەکەس نیە. تەنانەت لەڕووبەڕووبوونەوەی مردنیشدا تاک ناتوانێت خۆی لەکەسانی دیکە دابڕێ .

پاش هاتنی نازییەکان، لویس لەبەرئەوەی بەبنەچە (جو) بوو ڕویکردە ئیتالیاو دوای ئەوە چوو بۆ یابان. لەهەڵوێستی ڕامیاری هایدیگەریش ناڕازی بوو، بەتوندیش لەچەند نوسراوێکدا ڕەخنەی لێگرتوە[١٩٧]. هایدیگەریش لە لویس ناڕازبووە، لەگفتووگۆیەکدا لەگەڵ ئەلیزابێت بلۆکمان(ژنە مامۆستایەکی زانکۆی ماربۆرگ و خۆسەویستێکی هایدیگەر) هایدیگەر ڕەخنە لە لویس دەگرێت و لەو باوەڕەدایە، کە

---

[١٩٦] Elzbieta Ettingen. *Hannah Arndt and Martin Heidegger*, p. 11

[١٩٧] Karl Löwith. *Martin Heidegger and European Nihilism*, traslated by Gary Steiner, New York: Columbia University Press, 1995. P. 215



کەڵێنێکی گەورە لە بیرکردنەوەی فەلسەفی لویسدا هەیە، چونکە لویس فەلسەفەی کلاسیکی یۆنانی نەخوێندۆتەوە. هەروەها، هایدیگەر لەنامەیەکدا لەڕۆژی ١٧ی مانگی دووی ١٩٥٢ لەبارەی کارڵ لویسەوە بۆ هانا ئارنت دەنوسێت،

نوسراوەکەی لویس لەگۆڤاری *Neue Rundschau* دا سەرەتایەکی خراپ بوو. وادیارە هیچ فێرنەبووە. لە ساڵی ١٩٢٨ دا (بوون وکات) ی بە پەڕتووکێکی تیۆلۆجی دادەنا و لە ساڵی ١٩٤٦ دا بەبێبڕوا لەقەڵەمی دا. ئەمڕۆش؟ من سەرم سوڕماوە. هەڵوێستی مارتن بیوبەر جیاوازە- بەڵام ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە، کە بیوبەر لە بارەی فەلسەفەوە نازانێت و پێویستیش ناکات بزانێت.[١٩٨]

بۆچوونەکانی لویس لەسەر پەڕتووکەکەی هایدیگەر (بوون وکات)، وەکو هایدیگەر خۆی لەم نامەیەدا بۆ هانای دەنوسێت سێ جار گۆڕانی بەسەردا هاتووە. یەکەم جار لویس ڕەگوڕیشەی بیرکردنەوەی فەلسەفی هایدیگەر لەو

---

[١٩٨] Ursula Ludz (ed.). *Letters 1925- 1975: Hannah Arndt and*

*Martin Heidegger*, p.111

مارتن بیوبەر (١٨٧٨- ١٩٦٥) بیریارێکی جو، لەزانکۆکانی فرانکفۆرت و قودس مامۆستای ئایین بووە ولەژێرکاریگەرێتی تەسەوفی ئایینی جولەکەدا بیریکردۆتەوە.

پەڕتووکەدا بۆ زەمینەی ئایین و تیۆلۆجی(خواناسی)، بەتایبەتی بیرە تیۆلۆجیەکانی مارتن لوسەر دەگەڕێنێتەوە.[199] لە ساڵی ١٩٤٦ لەم بۆچوونەی پاشکەز دەبێتەوەو هایدیگەر بەبیریارێکی خوانەناس و بێبڕوا ناوزەد دەکات و لەساڵی ١٩٥٢ جارێکی دیکە لەتوێژینەوەکەیدا لەسەر ئۆنتۆلۆجی بوونگەرایەتی هایدیگەر، ئەم سیستەمە فەلسەفیە بەسەرچاوەی بیروباوەڕی نازیزم دادەنێت. بێگومان، لویس بەتەنیا هایدیگەر تاوانبار ناکات، نیتشەش دەخاتە ڕیزی نازییەکان. لویس لەگەڵ هایدیگەری مامۆستاییدا هاوڕایە، کەنیتشە دوابیریاری مێتافیزیکی تازەگەرییەو پێغەمبەرێکی نوێی هیچگەرایەتیە. بەڵام بەپێچەوانەی هایدیگەرەوە، کە لەوباوەڕەدایە تەفسیری مارکس بۆ مێژوو باشترین تەفسیرەو نەمانتوانیوە ڕەتیبکەینەوە، لویس مارکسیش بە بیریارێکی بوحرانی ڕامیاری سەردەمی تازەگەری دادەنێت. لەوباوەڕەدایە بیرکردنەوەی فەلسەفی مارکس و نیتشە سەرچاوەی سەرهەڵدانی ڕژێمە سەرکوتکەرەکانی، وەکو ستالینیزم و نازیزمن. بیرکردنەوەی فەلسەفی مارکس و نیتشە بۆ سەقامگیرکردنی(دیکتاتۆریەتی پرۆلیتار) و (ویستی هێز) کەلتوورێکی سەرکوتکەریان لەسەردەمی تازەگەرییدا

199 Karl Löwith. *Martin Heidegger and Eurupean Nihilism*, p. 215



هێناوەتەکایەوە.[200]

هانس جۆناس خویندکارێکی دیکەی هایدیگەر بووە و بەتەمەن دووساڵ لە هانا ئارنت گەورەتربووە. لەساڵی ١٩٠٣ لەشاری مونشن گلادباخ لە دایک بووەو بەبنەچە(جو) بووە. لەساڵی ١٩٢١ بۆ خوێندنی فەلسەفە لەزانکۆی ماربۆرگ چووە بۆلای هایدیگەر. جۆناس بەپێچەوانەی خوێندکارەکانی دیکەی هایدیگەرەوە لەفەلسەفەی عیرفانی Gnosticism و تیۆلۆجیەوە نزیک بووەو لەگەڵ رادۆڵف بەڵتمان هایدیگەریانە (لە پەنجەرەی فینۆمینۆلۆجی بوونگەرایەتی هایدیگەرەوە) توێژینەوە تیۆلۆجیەکەیان دامەزراندوە. لەگەڵ سەرهەڵدانی نازییەکاندا ئەم خوێندکارەی هایدیگەریش، وەکو هانا و لویس لەئەڵمانیا وە چووە بۆ لەندەن و ماوەیەکیش لە فەلەستین لەشاری(قودس) جێنشین بووە. دوایی لەزانکۆکانی ماک گیل و کارلیتون لەکەنەدا نزیکەی شەش ساڵ مامۆستابوو. دواجاریش لەکەنەداوە ڕوویکردەئەمەریکا و لەبەشی فەلسەفە لە The New School for Social Reserach لەشاری نیویۆرک دامەزراو لە ساڵی ١٩٧٦ خانەنشین کرا.[201]

200 Richard Wolin. *Heidegger's Children*, Princeton: Princeton University Press. 2001. P. 73

201 ئەم فێرگەیە لە شاری نیویۆرک بیریارانی فیرگەی فرانکفۆرت، کەپاش سەرهەڵدانی نازییەکان لەئەڵمانیا ڕوویانکردە ئەمەریکادایانمەزراند. فێرگەی فرانکفۆرت لەساڵی ١٩٢٣ دامەزراو

هەربەرت ماکۆز Herbert Marcuse خوێندکارێکی دیکەی ئەم گروپە یە لەژێردەستی هایدیگەردا لەزانکۆی فرایبۆرگ لە ساڵی ١٩٢٨- ١٩٣٢ فەلسەفەی خوێندووە. مارکۆز لە سەرەتاوە ڕێبازێکی چەپی گرتووەو لەگەڵ بزوتنەوەی مارکسیدا بووە. پاش تێکشکاندنی ڕاپەڕینی(سپارتاکۆس) لەساڵی ١٩١٩ و کوشتنی ڕۆزا لۆکسمبرگ و کارڵ لیبکنیتخت نائومید دەبێت. لە ساڵی ١٩٢٧ دا هایدیگەر پەڕتووکی (بوون وکات) لەچاپدەدات و مارکۆز دەکەوێتە ژێرکاریگەرێتی بیرکردنەوەی فەلسەفەی هایدیگەر و بڕیاردەدات لەزانکۆی فرایبۆرگ لەژێردەستی هایدیگەردا فەلسەفە بخوێنێت، ڕوخانی شۆڕشی ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩٢١ بۆ من و هاوڕێکانم بەتایبەتی دوای کوشتنی ڕۆزاو

بووبە مەڵبەندێکی توێژینەوە و بیریارانی، وەکو هۆرکایمە و فردریک پۆلۆک و واڵتەر بنیامین و ئەدۆرنۆ و هەربەرت مارکۆز و هابەر ماس بەشدارییان تیاکردووە. ناوی فێرگەکە(خوێندنگای لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی Institute for Social Research یەو پاش ساڵی ١٩٢٧ ماکس هۆرکایمە بوو بەسەرۆکی خوێندنگاکە.
بیریارانی ئەم فێرگەیە دەیانویست لە توێژینەوەکانیاندا لەنێو بۆچوونە مارکسیەکەیاندا بیرۆکە سایکۆلۆجیەکانی فرۆیدیش موتوربەبکەن و ڕوانینێکی گشتگرانەیان هەبێت. پاش سەرهەڵدانی نازییەکان ئەم بیریارانە لەبەرئەوەی بەبنەچە(جو) بوون و بەبیرکرنەوەش مارکسی ڕویانکردە هەندەران و لەئەمەریکا ئەم فێرگەیەیان بەناوی The New School for Social Reserach دامەزراند.



کارڵ تێکشکاندن بوون. هیچ شتێک بۆ ئێمە نەمایەوە خۆمانی پێوە بناسێنین. (بوون وکات) ی هایدیگەر لەساڵی ١٩٢٧ بڵاوکرایەوە. پاش ڕوخانی شۆڕش چی ڕوودەدات؟ ئەمە پرسیارێکی گەورەبوو بۆ ئێمە. ئەو فەلسەفەیەی لەزانکۆکان دەخوێنرا کانتیزمی نوێ وهیگڵیزمی نوێ بوو، (بوون وکات)، وەکو فەلسەفەیەکی کۆنکرێتی خۆی دەرخست و لەبارەی(دازاین) و (بوون) و(ئەوان) و (مردن) و (نیگەرانی) ئەدوا. هەستماندەکرد کێشەکانی ئێمە باس دەکات.[٢٠٢]

لە ساڵی ١٩٧٧ دا، واتە ساڵێک پاش مردنی هایدیگەر و لەیادکردنەوەیدا مارکۆز دەڵێت،

(بوون وکات) لەکاتێکدا بڵاوکرایەوە، کە کۆماری وایمەر دواهەناسەی ئەدا و ڕژێمی نازی لەدامەزراندابوو، کاتی هاتنی کارەسات بوو. بەڵام ئەم بەرهەمە فەلسەفیە بەهیچ شێوەیەک ڕەنگدانەوەی ئەوبارودۆخە نەبوو. بەرهەمەکەی هایدیگەر بۆمن و هاوڕێکانم سەرەتایەکی نوێ بوو. ئێمە بەرهەمەکانی و وانەکانیمان بە فەلسەفەیەکی کۆنکریتی دادەنا... هەستمان بەسەربەستی ئەکادیمی دەکرد. تەفسیری هایدیگەر بۆ فەلسەفەی یۆنانی و ئایدیالیزمی ئەڵمانیا تێڕوانینێکی نوێی بە دەقە مردووەکان دە دا.[٢٠٣]

[202] Richard Wolin. *Heidegger's Children*, p. 136

[203] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٢٥٧

ئایامەبەستی مارکۆز لەفەلسەفەی کۆنکرێتی چیە؟ ئەگەر ئاورێک لە بزوتنەوەی فەلسەفی و خوێندنی ئەکادیمی بدەینەوە لەکاتێکدا، کە فەلسەفەی مارکسی لەزۆر زانکۆکانی جیهانی سەرمایەدارییدا لەناوبەرنامەی خوێندندا دەرهێنرابوو. فەلسەفەی کانت و هیگڵ بوارەکانی بیرکردنەوەیان، بەتایبەتی لە ئەڵمانیا داگیرکردبوو. خوێندکاران مامەڵەیان لەگەڵ دەقدا دەکرد و فەلسەفە ببوو بە گوتارێکی پچڕاو لەژیان و ڕووتکراوە لە داکەوتی ڕۆژانە.

لەنێو ئەم دۆگما ئەکادیمیەدا هایدیگەر بە مامۆستایەکی یاخی بوو دادەنرێت، کەتوانی نەک بە نوسراوەکانی و داهێنانی فەلسەفەیەکی نوێ (بوونگەرایەتی) بەڵکو لەوانەکانیشدا فەلسەفە بە ژیانەوە ببەستێتەوە. ئەمەش، بێگومان کارێکی گرنگە. بۆئەوەی لەواتای بیرکردنەوەی فەلسەفی تێبگەین خوێندنەوەی دەقە فەلسەفیەکان بەتەنیا بەس نیە، پێویستە فەلسەفیانە بژین.[٢٠٤]

[204] پێش ئەوەی خۆم بەزانکۆیەک بگەیەنم و فەلسەفە لەدەستگایەکی ئەکادیمییدا بخوێنم لەوە دەترسام پرۆسەی خوێندنەکە ببیتە هۆی کەمکردنەوەی عەشق وسوتانم بۆ فەلسەفە چونکە هەموو سترەکچەرێک، بەتایبەتی ئەکادیمی یان پێداگۆگی عەشق و سۆزو داهێنان تاکو ڕادەیەک لەناودەبات. من بەدرێژایی تەمەنی خوێندنم لە زانکۆ لەم ناکۆکییەدا دەژیام و ڕێگەم نەدا دۆگمای ئەکادیمی لەو عشق وسۆزەم بۆ داهێنان ودۆزینەوەی ڕاستی کەمبکات.



ئەو بوحرانەی بەسەر بزوتنەوەی مارکسیدا هات و مارکۆز و هاوڕێکانی نائومێدکرد، لەئاکامی وەرگرتنی تاکتیکی کورتبینەوە سەرهەڵنادات و زەمینەی ئۆنتۆلۆجی و ئەپستمۆلۆجی خۆی هەیە. بوحرانێکە وابەستە بەکەموکورتی لە بیردۆزەکەدا. لەبەرئەمەشە مارکۆز ڕوو لە هایدیگەر دەکات و بە(بەدیل) ی دادەنیت. دەیەوێت کەموکورتیەی نێو بیردۆزەی مارکس یان نەخۆشییە ئۆنتۆلۆجی و ئەپستمۆلۆجیەکە بە فەلسەفە بوونگەرایەتیەکەی هایدیگەر چارەسەربکات. ئەم کارەش لەسەرەتاوە ئاسان نەبوو، بەتایبەتی لەوسەردەمەدا، کە تەنانەت نوسینیش لەسەر بوحرانەکە بەکۆنەپەرست و هەڵمەت و هێرشی بورژوازییانە بۆ سەر بەرژەوەندی چینی کرێکار دادەنرا. بەڵام ئەم هەنگاوەی مارکۆز سەرەتایەک بوو بۆ گۆڕانکاری لە نێو بیرکردنەوەی مارکسیدا، کە دواجار بەمارکسیزمی نوێ ناوزەدکرا و بیریارانی دیکەش، وەکو سارتەر ، لۆکاش، ئادەم شاف و کارڵ کۆرش بوون بەرابەری. مارکسیزمی نوێ هەوڵدانێک بوو بۆ دوورخستنەوەی بیرکردنەوەی مارکسی لەدۆگما و ئەو تەفسیرە زانستیەی ئەنجلزو ڕوسیەکان بۆیان کرد و نزیککردنەوەش لە مرۆڤایەتی. ئەم بیریارانەش بەتوندی لەلایەن کۆمۆنیستەکانی سەر بە مۆسکۆ ڕەخنەیان لێگیرا و بە کۆنەپەرست و کاسەلێسی ئیمپریالیزمناوزەدکران.

ماركۆز دەیەوێت ئەم دۆگمایە هەڵوەشێنێتەوە و ماركسیزم بە نەگۆڕ.[۲۰۵] کێشەیەکی دیکەی مارکۆز لەگەڵ مارکسیزمدا لەوێدایە، کە مارکسیزم، وەکو دانانێت. لەبەرئەمە پێویستی بەگۆڕان هەیە و دەبێت سود لە بیرکردنەوە فەلسەفیەکانی دیکە بەتایبەتی فینۆمینۆلۆجی بوونگەرایەتی وەگرێت. دامەزراندنی ئەم پەیوەندییە لەنێوان بیرکردنەوەی فەلسەفی مارکس و هایدیگەردا سود بەهەردوولا دەگەیەنێت. بیرکردنەوەی فەلسەفی هایدیگەریش بۆ ئەوەی تێگەیشتن لەبوونی مێژوویی دازاین لە قاڵبێکی ئۆنتۆلۆجی ڕووتدا نەهێڵێتەوە و خۆی بە داکەوتەوە گرێبدات پێویستە لە مارکسیزم نزیک بێتەوە.[۲۰٦] مارکۆز لە ساڵی ۱۹۳۳ بۆ ئەمەریکا کۆچیکرد و لەوێ جێنشین بوو. دوای جەنگی جیهانی دووەم و ڕوخانی نازییەکان بۆسەردان چوو بۆ ئەڵمانیا و چاوی بە هایدیگەر کەوتەوە. بەڵام پێش سەردانەکەی نامەیەکی لە۲۸ ی مانگی ۸ ی ۱۹٤۷ بۆ هایدیگەر نارد و داوای لە مامۆستاکەی کرد لەڕۆژنامەکاندا

[205] جۆرج کۆکاش لەساڵی ۱۹۲۳ پەڕتووکەکەی بەناوی *History and Class Consciousness* بڵاوکردەوە وتیایدا ڕەخنە لەمارکسیەتی توندرەو Orthodox دەگرێت. لۆکاش لەسەرئەم پەڕتووکە لەپارتی کۆمۆنیستی هەنگاریا دەرکراو بەکۆنەپەرت و بیریارێکی بورژوا ناوزەدکرا.

[206] Herbert Marcuse. "Contributions to a Phenomenology of Historical Marterialism", Published in *Telos*, No. 4, (Fall 1969), p. 16



دژی نازیزم بیروڕای خۆی دەربڕێت تاکو بزانرێت نازی نیە. هایدیگەر لەوەڵامدا بەنامە دەنوسێت، کە ئەو لەوکاتەدا نازییەکان دەستەڵاتیان هەبووە لەوانەکانیدا بەئاشکرا ئەم خاڵەی ڕوونکردۆتەوە و دژی نازیزم ڕاوەستاوە.[۲۰۷]

نوسینەکانی مارکۆز بەتایبەتی *One Dimensional Man* یەکێکە لەوبەرهەمانەی مارکسیزمی نوێ تیایدا ڕەنگیداوەتەوە. ئەم پەڕتووکە لەساڵەکانی شەستدا ڕۆڵێکی سەرەکی لەسەرهەڵدانی (شۆڕشی خوێندکاران) لەئەمەریکا و ئەوروپای ڕۆژئاوا بینی. مارکۆز لەو باوەڕەدایە سەرمایەداری لەگۆڕانکارییدایەو لەگەڵ ئەم گۆڕانکارییەدا هەڵوێستی شۆڕشگێڕانەی چینی کرێکاری بەلای بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی خۆی وەرگێڕاوە. چینی کرێکار لەبەرئەو دەستکەوتە ساختانەی لە کۆمەڵگای سەرمایەدارییدا وەریگرتوەو پێویستیەکانی ڕۆژانەی پێدراوە ئاڵای شۆڕش و ڕووخاندنی ڕژێمی سەرمایاداری بەرزناکاتەوە. لەم حاڵەتەدا بۆ شۆڕشکردن و ڕووخاندنی ڕژێمی سەرمایەداری دەبێت ڕوو لەو لایەنانە بکەین، کە هەست بەچەوساندنەوە و بەپەراوێزکردن لەکۆمەڵدا دەکەن. ئەو لایەنانەش خوێندکارو گروپە پێست ڕەش و کەمایەتیەکانی دیکەی نێو کۆمەڵن و ئەمان ڕۆڵی

[207] Dudiger Safranski. *Martin Heidegger between Good and Evil*, p. 421

شۆڕشگێرانە بۆ ڕوخانی سەرمایەداری دەبین.[208]

شۆڕشی خوێندکاران لەئەمەریکا و ئەوروپای ڕۆژئاوا لەساڵەکانی ١٩٦٠ وە سەریهەڵدا و نزیکەی چوارساڵی خایاند. بیریارانی وەکو مارکۆزو سارتەر و ئەدۆرنۆ و هابەرماس پشتگیری شۆڕشەکەیان کرد. هانس- جۆرج گادەمەر خوێندکارێکی دیکەی هایدیگەرە بەردەوام لەژێر کاریگەرێتی مامۆستاکەیدا ماوەتەوە و بیرکردنەوەی فەلسەفی خۆی گەشەپێداوە. گادەمەر لەساڵی١٩٠٠ لە شاری ماربۆرگ، لەوشارەی هایدیگەر بۆ یەکەمجار بووە بەمامۆستای فەلسەفە لەدایک بووە. بەڵام لەشاری برێسلاو Breslau لەبەرئەوەی باوکی فەرمانکار بووە و بۆ ئەوشارە گوێزراوەتەوە گەورە بووە و لەوێ خوێندنی سەرەتایی و ئامادەیی تەواوکردووە.

گادەمەر یەکێکە لەو خوێندکارانەی هایدیگەر، کە بەبنەچە (جو) نەبووە. لەبەرئەمە لەئەڵمانیا ژیاوە و لەجەنگی جیهانی دووەمدا ڕووینەکردۆتە هەندەران. بۆخوێندنی فەلسەفە بۆشاری ماربۆرگ دەگەڕێتەوە. بەڵام ئەوکاتە هایدیگەر لەزانکۆی فرایبۆرگ وەردەگیرێ و گادەمەر هایدیگەر نابینێت. لەژێر سەرپەرشتی پۆڵ ناترۆپ و نیکۆلای هاتمان لە ساڵی ١٩٢٢ دکتۆراکەی لەسەر چەمکی

[208] Herbert Marcuse. *One Dimensional Man*, London: Routledge and Kegan Paul, 1964. Pp. 35- 42



ئارەزو لەفەلسەفەی ئەفلاتوندا تەواودەکات. ڕۆژێک ناترۆپ نوسراوێکی هایدیگەر لەسەر ئەریستۆ بەگادەمەر دەدات. گادەمەر دوای خوێندنەوەی نوسراوەکە بڕیاردەدات جارێکی دیکە ببێتەوە خوێندکارو ئەمجارەیان لەگەڵ هایدیگەردا فەلسەفە بخوینێت.[209] لەساڵی ١٩٤٩ کارڵ یاسپەرز لە زانکۆی هایدڵبەرگ جێنشیندەکرێتو گادەمەر لە جێگای دادەنرێت تاکو ساڵی ١٩٦٨ لەو زانکۆ یەمامۆستادەبێت. گادەمەر لەگەڵ هێڵمت کون Helmut Kuhn گۆڤارێکی فەلسەفی بەناوی *Philosophische Rundschau* دەردەکەن و کۆمەڵەی هیگڵی Hegel Society دادەمەزرێنن. داوا لە هایدیگەریش دەکەنببێت بەئەندامی Heidelberg Academy of Science.[210]

لەژێر کاریگەرێتی هایدیگەردا، گادەمەر هەوڵیدا زیاتر فەلسەفەی یۆنانی بخوێنێتەوەو لەو نەریتە کلاسیکیە باشتر تێبگات. لەپەڕتووکە کەشیدا، کە لەژێر ئەم کاریگەرێتیەدا نوسراوە *Truth and Method* (1975) سێ کێشەی سەرەکی ڕوونکردۆتەوە.

یەکەم، وەکو لەناونیشانی پەڕتووکەکەدا دەردەکەوێت، میتۆدو توێژینەوەی زانستانە تەسک بینەو ناخی ڕاستی

[209] Dermant Moran. *Introduction to Phenomenology*, London: Routhelge, 2000. P. 257

[210] هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٢٦٥

ناپێکێت. بۆ دۆزینەوەی ڕاستی پێویستە ڕێگەی دیکە، بەتایبەتی(هونەر) بگرینەبەر. ئەمەش، بێگومان پەیوەندی بە بۆچوونەکانی هایدیگەر لەسەر هونەرو ڕۆڵی هونەر لەمێژوودا هەیە. دووەم، لەگەڵ پەیڕەوکردنی بۆچوونی هایدیگەر سەبارەت بەمێژووکردنی دازاین و دانانی دازاین لەنێو بارودۆخی مێژوودا گادامەر گەیشتە ئەوباوەڕەی بەرهەمی هونەری یان ئەدەبی خەسڵەتێکی نەگۆڕو هەگبەی دەستەیەک واتای چەسپاو نیە. واتاکان و تێگەیشتن لەبەرهەمێکی ئەدەبی و هونەری پەیوەندییەکی زەروری بە بارودۆخی مێژوویی و (کات) ی خوێنەرەوە هەیە و واتاکان بەردەوام لەگۆڕاندان.

سێیەمیش. لەپێشتر ئاماژەمان بۆ ئەو خاڵە کرد، کە بۆ هایدیگەر تێگەیشتن Understanding پێش تەفسیر Interpretation دەکەوێت. گادامەر جەختی لەسەرئەم خاڵە کردۆتەوەو ئەوەشی ڕوونکردۆتەوە، کە لەفەلسەفەی هایدیگەردا تێگەیشتن پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی بوونی مرۆڤەو هەموو شێوەکانی هێرمینۆتیک (زانستی تەفسیر) لەسەر زەمینەی تێگەیشتن دامەزرێنراوە. بەبێ تێگەیشتن لەواتاکانی دەق، هیچ دەقێک تەفسیرناکرێت. تەفسیرەکەش دوا تەفسیر و نەگۆڕ نیە چونکە بەستراوە بە تێگەیشتنی دازاینەوە و دازاینیش بوونەوەرێکی مێژووەو لە نێو شوێن وکاتی خۆیدا



دەژی.[٢١١] ئەم خوێندکارانە ڕۆڵێکی سەرەکییان لە گەیاندنی بیروباوەڕی فەلسەفی هایدیگەر بە دەرەوەی ئەڵمانیا و گەشەپێدانی بیرکردنەوەی فەلسەفیش بینیوە. هەریەکێک لەئەوان جێگەیەکی تایبەتی لەمێژووی فەلسەفەدا داگیرکردووە. لەڕێگەی ئەم خوێندکارانەوە، بۆ یەکەم جار، بیرکردنەوەی فەلسەفی هایدیگەر کاریگەرێتی خۆی بەسەرفەلسەفەی بوونگەرایەتی فەرەنساوە تۆمارکرد. لەپێشتر باسمانکرد چۆن سارتەر هایدیگەریانە بیریکردۆتەوە. لەپێش سارتەریشدا ئیمانۆئیل لێڤیناس لەساڵی ١٩٢٨ لەفەرەنساوە چوو بۆ زانکۆی فرایبۆرگ و بووە بەخوێندکاری هایدیگەر. سارتەریش پاش خوێندنەوەی پەڕتووکەکەی لێڤیناس لەسەر فینۆمینۆلۆجی ئاشنایی لەگەڵ ئۆنتۆلۆجی فینۆمینۆلۆجیدا پەیداکرد. دوای جەنگی جیهانی دووەمیش بیرکردنەوەی فەلسەفی هایدیگەر لەفەرەنسا جارێکی دیکە بۆ میشێل فۆکۆ و دێریدا بوو بەزەمینەیەکی پتەوی بۆچوونە نوێکانیان و گۆڕانکارییە بنەڕەتیەکان لەقۆناخی بونیادگەرییەوە(سترەکچرەلیزم) بۆ پاش-بونیادگەری (پاش- سترەکچرەلیزم). بۆنموونە میشێل فۆکۆ دەڵێت، (بۆ من، هایدیگەر هەمیشە فەیلەسوفێکی گرنگە... گەشەکردنی بیرکردنەوەی فەلسەفیم وابەستە بە خویندنەوەی بەرهەمەکانی هایدیگەرەوە.) تەفسیری

211 Hans-Georg Gadamer. *Truth and Method*, translated by Weinscheimer and Donald G. Marshall, London: Continuum, 2004. Pp. 244-54

هایدیگەریش بۆ مێژووی (بوون) بووە بەزەمینەیەک بۆ فۆکۆ و تێگەیشتنی ئەم بیریارە لە مێژووی بیرکردنەوەی ڕۆژئاواو ئەو گۆڕانانەی لەمیژوودا بەسەر (ئەپستمە) دا هاتووە.[212] دێریداش لە زۆر شوێندا ئاماژەی بۆ کاریگەرێتی هایدیگەر بەسەربیروباوەڕیدا کردووە و زۆر کێشەشی لەبەر ڕۆشنایی بیرکردنەوەی فەلسەفی هایدیگەردا باسکردووە. یەکێک لەوکێشانە مامەڵە کردنە لەگەڵ (جیاوازی) دا. لەسیستەمی ئۆنتۆلۆجی هایدیگەردا(جیاوازی) کاتیگۆرییەکی سەرەکییە و حوکم بەسەر بوونی هەموو شتێکدا دەکات. پاش ئەوەی هایدیگەر لەپەڕتووکەکەیدا لەسەر(ناسنامەو جیاوازی) دژی یاسای ناسنامەی لۆجیکی ئەریستۆ ڕادەوەستێت و ئەو ناسنامەیە بەڕووتکراوە دادەنێت، بانگەشەی باڵادەستی جیاوازی دەکات. لەپەڕتووکە شاکارەکەشیدا (بوون وکات) و لەگەڵ دامەزراندنی ئۆنتۆلۆجی بنەڕەتیدا، جیاوازییەکانی نێوان(بوون) و (دازایین) و (هەبوو) ە کانی دیاریکردووە. لەوباوەڕەشدایە، دازاینە تاکەکانیش لەجیاوازی بێبەش نەکراون. هەریەکێک لەئەوان تاکێکی تایبەتمەندو جیاوازە و لەنێو(کات) ی جیاوازی خۆیدا دەژی و مێژووی خۆی دەنوسێتەوە. دازاینە جیاوازەکان، جیاواز لە بوون و مێژوو تێدەگەن و تەفسیریدەکەن. دێریدا، لەم سەرچاوە ئۆنتۆلۆجیەوە، تێگەیشتنی خۆی سەبارەت بوونی دەق و تێگەیشتن و تەفسیرکردنمان بۆ دەق پێشدەخات و کاتیگۆری (جیاوازی) دەکات بە یەکێک لە کۆڵەکەکانی بیرکردنەوە

[212] Hubert L. Dreyfus. *Being-in-the World*, p. 9



فەلسەفیەکەی.[213] بێجگە لەمە، ئەو پرۆسەیەی هایدیگەر بۆ هەڵسەنگاندنی واتای بووی لەمێژووی مێتافیزیکدا بەکاریهێناوەو بەپرۆسەی (هەڵوەشاندنەوە) Deconstruction ناسراوە لەتەفسیرکردنی واتاکاندا بۆ دێریدا بووە بە ڕێگەیەکی فەلسەفی گرنگ. ئەمڕۆ، ئەوانەی لەسەر (هەڵوەشاندنەوە) دەنوسن هەندێکیان بەمیتۆد و هەندێکی تریش بە پرۆسەی دادەنێن. ئایا مەبەست لە(هەڵوەشاندنەوە) چیە؟ چی پرۆسەیەک دەبێت بە هەڵوەشاندنەوە؟

هەڵوەشاندنەوە ڕاستەوخۆ ئاماژە بۆ(دامەزراندن) دەکات. لەم پرۆسەیەدا دوو جۆر دامەزراندن هەیە، لەپێشتر و لەپاشتر. هەڵوەشاندنەوە ڕووخاندنی دامەزراوێکی لەپێشترە. بەڵام ڕوخاندنەکە لەپێناوی دامەزراندنیکی دیکەی(لە پاشتر) ە و لەئاکامی هەڵوەشاندنەکەوە دادەمەزرێت. لەم ڕووەوە، هەڵوەشاندنەوە دامەزراندنە. واتایەکی باو لەپێناوی دامەزراندنی واتایەکی نوێدا هەڵدەوەشێنینەوە، یان بەهایەک لەپێناوی دامەزراندنی بەهایەکی نوێدا دەڕوخێنین. لەبەرئەمە، هەڵوەشاندنەوە لەلایەکەوە نەرێ(نێگەتیڤ) و لەلایەکی دیکەوە ئەرێ (پۆزەتیڤ). بەڵام پێویستە ئەو پرسیارەش بکرێت، ئایا چی

[213] Jacques Derrida. *Margins of Philosophy*, translated by Alan Bass, Chicago: The University of Chicago Press, 1972. Pp. 21- 22

هەڵدەوەشینینەوە؟ یان هەڵوەشاندنە وە کە تاکو چ ڕادەیەک کاریگەرو روخێنەرە؟ ئەگەر من لەسیاسەتی پارتێک ناڕازبم ولە هەڵبژاردنی داهاتوودا دەنگی بۆ نەدەم وپشتگیری لایەنێکی تر بگرم، نابێتە هۆی گۆڕانێکی بنەڕەتی، یان ناوەڕۆکی لەسیاسەتدا. ئەگەر من ڕەخنەش لەولایەنە سیاسیە بگرم، هێشتا ڕەخنەگرتنەکەشم ئەو گۆڕانکارییە بنەڕەتیە ناهێنێتە کایەوە. کەوابوو، ناتوانین هەڵوەشاندنەوە بەگۆڕانکاری لە(شێوە) دا یان ڕەخنەکاری دابنێین. هەڵوەشاندنەوەی واتا، بەها، یان تێگەیشتنمان لە بابەتێک گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی(جەوهەری) یە، کە بەسەر واتاکە یان بەهاکەدادێت و ڕێگە بۆ واتا و بەهایەکی نوێتر خۆشدەکات. ئەگەر هەڵوەشاندنەوە بەم ئاکامە نەگەیشت ئەوا، وەکو پرۆسەیەکی ڕوخینەری نەرێ(نێگەتیڤی) ڕووت دەمێنێتەوە و داهێنەرانە نابێت. هەڵوەشاندنەوەی واتا دامەزرێنراوەکەش هاوکات، بەدیدی دێریدا، ڕوخاندنی (دەستەڵات) ە، لەناوبردنی دەستەڵات و هێزی واتاکەیە، کە بووە بە بناخەبۆی. ئەمەش پەیوەندی بە(ناوەڕۆک) ەوە هەیە، چونکە دەستەڵات لەناوەڕۆکدایە، لەوزەمینەدایە، کە ئەو واتایە سەقامگیردەکات.[٢١]

214 Jacques Derrida. “The Time is Out of Joint”, in *Deconstrucfian is\in America* Anselm Haverkamp (ed.), New York: New York University Press, 1995. P. 25



دەبینین کاریگەرێتی هایدیگەر سنورێکی بەرفراوانی داگیرکردوە. ئەوبیریارانەی لەگەڵ بیرکردنەوەی فەلسەفی هایدیگەریشدا هاوبیر نین و دژی دەوەستن، وەکو ئەدۆرنۆ وهابەرماس، ڕەخنەگرانەش بووبێت، باسی هایدیگەریان کردوە. هەندێک نوسەریش، بۆنموونە ریچارد ولێن و تیموتی کلارک هە وڵیان داوە کاریگەرێتی هایدیگەر لەگەڵ هیگڵدا بەراوردبکەن و ئەو بیریارانەی کەوتونەتە ژێر کاریگەرێتیەکەوە لەدووگروپدا (هایدیگەریی چەپ) و (هایدیگەریی ڕاست) دایانناون.[٢١٥] هایدیگەرییە چەپەکان جەخت لەسەر چەمکی مێژوویی دازاین و ڕەسەنیەتی بوون(بەنامۆ نەبوونی دازاین) و بوونی دازاین (لە- گەڵ) کەسانی دیکە و پرۆسەی (هەڵوەشاندنەوە) دەکەن و ئاوەر لە تێگەیشتنی هایدیگەر لەهونەر نادەنەوە. ئەمەش پەیوەندی بە تێگەیشتنی هایدیگەر لە هونەرو تەفسیری بۆ هونەر نیە. یەکێک لە کەم و کورتیەکانی بیرکردنەوەی مارکسی لەپەراوێز دانانی هونەردایە و ئاوڕێکی (جیدی) لەم لایەنەی کەلتووری مرۆڤایەتی ناداتەوە.

لەم دواییەدا چەند بیریارێکی ژن هاوڵیانداوە لەسەر

215 پاش مردنی هیگڵ لەساڵی ١٨٣٠ دا خوێندکارەکانی بوون بەدوو دەستەوە: هیگڵیی چەپ و هیگڵیی ڕاست. کارل مارکس، بۆنموونە، کەیەکیک بوو لە هیگڵییە چەپەکان تەفسیرێکی مێژوویی و ئەنترۆپۆلۆجیانەی بۆ فەلسەفەی هیگڵ دەکردو لە بۆچوونە مێتافیزیکییە ئایدیالیستیەکەی ڕووتدەکردەوە.

بزوتنەوەی ژنان (فێمەنیزم) لەبەر ڕۆشنایی بیرکردنەوەی فەلسەفی هایدیگەردا بنوسن. ساندرا لیبارتکی یەکەم نوسەرە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی بوونی ژن لەنێو کۆمەڵدا ڕوویکردۆتە هایدیگەر. ساندرا چەپە و فەلسەفەی هایدیگەری خوێندۆتەوە. لەساڵی ١٩٧٠ نوسراوێکی لەسەر بیرکردنەوەی داهێنەرانە لە فەلسەفەی قۆناخی دوایی هایدیگەردا بڵاوکردەوە و تەفسیرێکی فێمەنیستانەی بۆ کرد.[٢١٦] ساندرا لەوباوەڕەدایە هایدیگەر لەتەفسیرەکەیدا بۆ دازاین و مێژوو سەرکەوتوە، بەڵام هێشتا نەیتوانیوە پێکەوە بیانبەستێتەوە. لەبەرئەمە دازاین لەمێژوو دابڕاوە. لەساڵەکانی ١٩٩٠ دا کۆمەڵێک بیریاری ژن، وەکو نانسی توانا، پاتریشا هانتنگتۆن، نانسی هۆڵاند، تینا چانتەر، جین گرەبییەڵ، کارۆڵ بیگ ود، جولیا کریستیڤا و چەندی دیکەش هایدیگەریانە لەکێشەی بوونی ژنیان کۆڵیەوە. بیرکردنەوەی فەلسەفی هایدیگەر سەبارەت بە (دازاین)، واتای مێژوو، بوونی ڕەسەن و نارەسەنو هونەر بوون بە زەمینە بۆ بۆچوونەکانیان. کارۆڵ بیگ ود، بەپێچەوانەی ساندرا لیبارتکییەوە بۆچوونە شیکارییە بوونگەرایەتیەکەی هایدیگەر بۆ دازاین و مێژوو بە زەمینێکی بەپیت بۆ بزوتنەوەی ژنان دادەنیت. (دازاین) یان بوونی مرۆڤ، کە

216 ئەم نوسراوەی ساندرا لیبارتکی لەساڵی ١٩٧٠ لە ژمارە(٣) ی گۆڤاری *Philosophy and Phenomenological Research* دا بڵاوکرایەوە.



هایدیگەر بە (پیاو) ی نەداوەتە قەڵەم و ئاماژە بۆ (مرۆڤ) دەکات و بوونی هەموو تاکێکی نێو کۆمەڵە. ژن، وەکو دازاین، لەڕوانگەی ئەم فەلسەفەیەوەدەبێتڕەسەنانە بژی و داهێنەرانە مێژووی خۆی بنوسێتەوە. کارۆڵ بیگ ود ڕەخنەش لەبیریارانی پاش تازەگەری دەگرێت و گوایە ئەم بیریارانە ناسنامەی ژنانیان خستۆتە نێو بەرگی زمان و زمانەوانیەوە و بوونیان شێواندوە. هایدیگەر، بەپێچەوانەی ئەوانەوە، ناسنامەیەکی ئۆنتۆلۆجی و مێژووی بۆ داناوە، کە ژن دەتوانێت لەمێژوودا دایهێنێ و بیخاتە بەر ڕۆشنایی بوون.[٢١٧] پاتریشا هەنتنگتۆن بیریارێکی دیکەیە هەوڵیداوە بیردۆزێکی کۆمەڵناسی فێمەنیستانە لەسەر فەلسەفەکەی هایدیگەر دامەزرێنێت. ئەم بیریارە ژنەش لەوباوەڕەدایە، کە هایدیگەر زەمینێکی بەپیت و فراوانی بۆ بیرکردنەوەی ژنان داناوە. بەڵام هاوکات ڕەخنەش لە هەڵوێستی ڕامیاری هایدیگەری ساڵی ١٩٣٣ دەگرێت و ئەو قۆناخە کورتە لەساڵی ١٩٣٣- ١٩٣٤ لە نێو فەلسەفەکەیدا دەردەهێنێت و بەهەڵوێستێکی (پیاوانە) ی دادەنێت.[٢١٨] ئەم ڕەخنەیەش لەسەر ئەو بۆچوونە دامەزراوە، کە زۆر بیریاری ژن

217 Carol Bigwood. *Earth Muse: Feminism Nature and Art*, Phildelphia: Temple University Press, 1993. P. 44

218 Patricia Huntington. *Ecstatic Subjects, Utopia, and Recognition:*

*Kristeva, Heidegger, Irigaray*, Albany: State University of New York Press, 1998. P. 78

دیاردەی سەرهەڵدانی بزوتنەوە ڕامیارییە فاشستەکانی، وەکو(نازیزم و فاشیزم و ستالینیزم) بۆ نەریتی پیاوسالاری و خۆدەرخستنی ماسولکەی پیاو دەگەڕێننەوە. چەند بیریارێکی ژن هەوڵیانداوە بیرکردنەوەی فەلسەفی هایدیگەر بەسیاسەتی ژنان و ڕەوشتی ژینگەیی (ژن) ەوە ببەستنەوە. ئەم بیریارانە، وەکو تریش گلازیبروک و میشتیلد ناگەڵ و ئایرس ماریۆن یۆنگ، جەختیان لەسەر گرنگی تەفسیری هایدیگەر بۆ بوون- لەنێو- جیهان و بوون، وەکو وڵات (نیشتمان) و واتای بوونگەرانەی (جێنشین) بوون لەنێو جیهاندا کردوە. دەیانەوێت لەسەر ئەو پەیوەندییەی هایدیگەر لەنێوان دازاین و بووندا باسیکردووەو گرنگی پێشمەرجی ئۆنتۆلۆجی (نیگەرانی Care ) و بەها ڕەوشتییە ژینگەرایەتیەکان و هەڵسوکەوتی مرۆڤ لەگەڵ ژینگەدا ڕوونبکەنەوە.



# بەشی حەوتەم
# لە کۆتایی ئەم پڕۆژەیەوە بۆ سەرەتا

بەگەیشتن بەم قۆناخە لەم نوسراوەدا دەکریت ئاماژە بۆ چەند خاڵێکی هەرە گرنگ بکەین، کە لە ناوەڕۆکی ئەم توێژینەوەیەدا دەبن بە کۆڵەکەکانی تێزەکەمان و باشتر هەڵوێستی ڕادیکاڵانەی فەلسەفی هایدیگەر ڕووندەکەنەوە. لەسەرەتاوە لەوە دواین، کە مەبەستمان لەم توێژینەوەیە ناسینی شۆڕشە فەلسەفیەکەی هایدیگەرە ئێستاش، پاش شیکردنەوەی بیروباوەڕە فەلسەفیەکەی کاتی ئەوەهاتووە لەناوەڕۆکی ئەوشۆڕشە بپرسین. ئایا مەبەستمان لە شۆڕشی فەلسەفی چیە؟ تاکو چ ڕادەیەک بیرکردنەوەی فەلسەفی هایدیگەر مژدەی سەرهەڵدانی شۆڕشێکی فەلسەفی پێداوین؟ بۆ تێگەیشتن لەواتای شۆڕشی فەلسەفی پێویستە دوو کاتیگۆری ڕەچاو بکرێن، نەریت و گۆڕانکاری. دەبیت هەڵوێستی بیروباوەڕە شۆڕشگێڕەکە بەرابنەر نەریت (مەبەست نەریتی فەلسەفیە) دیاریبکرێت و گۆڕانکارییەکانیش بناسرێنەوە.[٢١٩] مامەڵەکردن لەگەڵ نەریتدا فەلسەفیانە کێشەیەکی ئاڵۆزە. ناکرێت (ڕابردوو) بە گشتی ڕەتبدرێتەوە و لەبیربچێتەوە. زۆر بیری نوێ ڕەگوڕیشەی لەنێو ڕابردوودا داکوتاوەو لەوێوە

219 لەبەرئەوەی باسی شۆڕشی فەلسەفی دەکەین مەبەستیش لە نەریت Tradition نۆرم و دابی فەلسەفیە لەمێژوودا.

سەریهەڵداوە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت، نەتوانرێت ڕابردوو ڕەتبکرێت و بیرکردنەوە بەداهاتوو نەگات. هەڵوێستی هایدیگەر بەرانبەر نەریتی فەلسەفی لەم بۆچوونەوە، دوولایەنییە. لەلایەکەوە سودی لەو گەنجینەی بیرە وەرگرتووە و کردوویەتی بەسوتەمەنی گەشتەکەی. لەلایەکی دیکەوە ڕادیکالانە ڕەتیدەداتەوە و لەنێو ئێستا و ڕابردوودا ناژی. ئێستا و ڕابردوو، دوو ڕەهەندی بیرکردنەوەی نەریتێکی فەلسەفین، کەپرسیارە گەورەکانی سەبارەت واتای بوون فەرامۆش کردووە. نەریتی فەلسەفی ئێستا و ڕابردوو بارودۆخی لەبیرچوون و کەژێکی بۆ کوشتنی پرسیارەگەورەکان خۆش کردووە. هایدیگەر گوتەنی، ێڕگە نادات مرۆڤ بیربکاتەوە. نەریتەکە توشی شێوازێکی بوونی کردووە، کە بیرنەکاتەوە، چونکە پرسیارکردن، نەک لەبەرئەوەی ڕێگەی پێنادرێت، بەپێویست دانانرێت. نەبوونی پرسیارکردن مەرگەساتی بیرکردنەوەیە. مرۆڤی ئەمڕۆ پێویستیەکانی بۆ ئامادەکراوە. کۆمەڵێ پێویستی نا- پێویستیشی بەسەردا سەپێنراوە. ئەم شێوازی بوونەی ئەمڕۆ لە ناوەڕۆک و ڕوانگەی فەلسەفی بەدەرنیە. هەموو سەردەمێک ڕەنگدانەوەی نەریتێکی فەلسەفیە. نەریتی فەلسەفی ئەمڕۆش ، کە بەخەسڵەتەکانیەوە، وەکو لەبیرچوون و کوشتنی پرسیارکردنەوە دەناسرێنەوە، بەبیروڕای هایدیگەر لەمێژووی بیرکردنەوەی فەلسەفی ڕۆژئاوادا لەئەفلاتونەوە سەریهەڵداوە و بەنیتشەی دوابیریاری تازەگەرایەتی کۆتایی دێت. ئەم نەریتە لەبەرئەوەی مامەڵە لەگەڵ گەورەترین پرسیارە



فەلسەفیەکە سەبارەت بەواتای بوون ناکات و بوونیش بەهیچ دادەنێت تێڕوانینێکی مێتافیزیکی هیچگەرانەیە. لەگەڵ رەتدانەوە و ڕەتکردنی ئەم نەریتەدا و بەم کۆتاییە بانگەشەی سەرەتایەکی نوێ لەمیژووی بیردا دەکرێت. بەبێ ڕەتدانەوەی ئەم نەریتە زاڵبووە گۆڕانکارییەکانیش سەرهەڵنادەن. ژیانەوەی پرسیارکردن بەتایبەتی پرسیارە گەورەکان دیاریکردنی سەرەتایەکی نوێ و کۆتاییهێنانە بەئێستا وڕابردوو. لەم سەرەتا نوێیەدا، بەپێچەوانەی شێوازی بوون لە نەریتە فەلسەفیەکەی ڕابردوودا، مرۆڤ لەگەڵ پرسیارکردندا بۆبوونی ڕەسەنی خۆی دەگەڕێتەوە و لەنێو چوارچیوەی وەبەرهێنانی تەکنەلۆجی سەردەم و *کەوتنەخوارەوە* *verfallen* خۆی دەربازدەکات. بەم شیوەیە دەبینین، نیتشە دوابیریاری تازەگەری ئەو نەریتە فەلسەفیەی ئێستایەو لەگەڵ خۆیدا کۆتایی پێدەهێنێت و هایدیگەریش بەڕەتدانەوەی نەریتەکە سەرەتایەکی نوێ بۆ بیرکردنەوەی فەلسەفی دادەمەزرێنێت. هەڵوێستی هایدیگەر لەئاستی نەریتی فەلسەفیدا لەبەرڕۆشنایی هەڵوێستی هیگڵ بەرابنەر نەریتی فەلسەفی (کانت) باشترئاشکرادەبێت. کانت لەئاکامی توێژینەوە ئەپستمۆلۆجیەکەیدا گەیشتە ئەو باوەڕەی (ڕاستەقینە) لەبەر ئەوەی دەکەویتە ژوور دەستەڵات و بڕستی هەستکردن و زانینی هۆشەکییەوە هەرگیز ناناسرێت. ئەم ئاکامە نەرێییە بۆ هیگڵ تاڵ و کورت بین بوو. ئەگەر ڕاستەقینە نەناسراوبێت، مرۆڤ ناتوانیت مامەڵە لەگەڵ بووندابکات و لایەنەکانی بناسێت. بەهەمان شێوەش، نەریتی فەلسەفی

ئێستا و ڕابردوو بۆ هایدیگەر لەبیرچوونەوەی ڕاستەقینەیە. ئەمەش دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی دەستەڵاتی داهێنان و ناسینی بوون یان بەنامۆکردنی بوون. ڕەتدانەوەی ئەم نەریتەش لەناوبردنی نامۆبوونە. ئەوپرسیارەی گرنگە بکرێت ئەوەیە، کە چۆن ئەم ڕەتدانەوەیە دەبێت بە شۆڕشێکی فەلسەفی؟

هەموو ڕەتدانەوەیەک یان بەرەنگارییەک شۆڕش نیە، بەڵام هەموو شۆڕشێک ڕەتدانەوە. ڕەتدانەوە بە(ڕەتکردن) ی ئێستا و ڕابردوو خەسڵەتی شۆڕشگیرانە وەردەگرێت. ڕەتکردنیش زەمین گواستنەوە نیە و ڕەوتێکی بەرەو پێشەوە چوونە لەنێو(کات) دا. بەجێهێشتنی ئێستا و ڕابردووەو گەیشتنە بە داهاتوو. کات بۆ شۆڕش (داهاتوو) ە نەک ئێستا و ڕابردوو. ڕەتکردن لە ڕەتدانەوەدا ئاماژە بۆ گۆڕانکارییەکان دەکات. (پێویستی) گۆڕانکاری دەبێت بە دیاردەیەکی زەق و خۆسەپاندوو، بۆیە لەگەڵ ڕەتدانەوەدا ڕەتکردنیش خۆی فەرز دەکات و گۆڕانکارییەکانیش دەبێت سەرهەڵبدەن. گۆڕانکاری پێشمەرجە بۆ ڕەتکردن و ڕەتکردنیش پێشمەرجە بۆ ڕەتدانەوەی شۆڕشگێڕانە. ڕەتدانەوە، لەم ڕوانگەیەوە، دەبێت بەڕەتکردن و ڕەتکردنیش بەگۆڕانکاری. ئەم سێ کاتیگۆرییەش(ڕەتدانەوە و ڕەتکردن و گۆڕانکاری) کۆڵەکەکانی شۆڕشێ فەلسەفین. هایدیگەر، لەگەڵ ڕەتدانەوەی نەریتدا، سەردەمەکەی ڕەتکردووە و گۆڕانکاری هێناوەتەکایەوە. شۆڕشە فەلسەفیەکەی کۆتایی بەو کۆتاییە هێناوە، کە ئاماژەمان



بۆ کردو سەرەتای گەشتێکی فەلسەفی بۆ کردووینەتەوە و لەسەر ڕێگایەکی نوێی بیرکردنەوە ڕایگرتوین. پڕۆژەی فەلسەفی هایدیگەر کۆتایی هێنانە بەو نەریتەو لەناوبردنی لەبیرچوونەوەی بوون و هیچگەرایەتیە.

بۆ ئەم مەبەستەش گەڕانەوە بۆ پرسیارکردن و بیرکردنەوەی داهێنەرانە دەبێت بە ئامانجی سەرەکی گەشتەکەمان و پرسیارە هەرەگەورەکان سەبارەت بەواتای بوون سەرهەڵدەدەنەوە و داهێنەرانەش مامەڵە لەگەڵ وەڵامەکانیاندا دەکرێت. بیرکردنەوەی فەلسەفیانە (نەک زانستانە) دەبێت بەپێشەوای کاروانی گەشتەکە. لەمێژووی فەلسەفەدا، بەتایبەتی لە ئەفلاتونەوە بۆ نیتشە، بەوشێوەیەی هایدیگەر شیدەکاتەوە، بوون بە(هیچ) دانراوەو ئاوەڕ لەوبابەتانە(هەبوو) دراوەتەوە، کە شیاوی ئەوەنین لەپێشتر و بنەڕەتی هەموو شتێک بن، چونکە ئەوان بۆ بوونیان پێویستیان بە(بوون) هەیە. لەگەڵ ئەم سەرەتا نوێیەدا و ڕەتدانەوە و ڕەتکردنی ئەو نەریتە لەو مێژووە درێژەدا و هەڵوەشاندنەوەی ناوەڕۆکی فەلسەفی نەریتەکە بۆ (بوون) دەگەڕێننەوە و (بوون) نەک هەبوویەکی کەمتر لەبوون دەبێت بەبنەڕەتی هەمووشتێک و ڕاستەقینەی داکەوت و مێژوو. ڕێگەچارە بۆ نامۆبوونی ئاگامەندی لەڕاستەقینە، کە لەلای هیگڵ لەیەکگرتنی ئاگامەندی و بابەتی ئاگامەندیدا دەبینرێت، لەپڕۆژە فەلسەفیەکەی هایدیگەردا لەدامەزراندنی فەلسەفەی بوونگەرایەتی یان فینۆمینۆلۆجی ئۆنتۆلۆجیدایە. بوونگەرایەتیەک، کە

بەمیتۆدی فینۆمینۆلۆجی لە واتای بوون دەکۆڵێتەوە. مادامەکی (بوون) یش بنەڕەتی هەمووشتێکە، ئەوا ئۆنتۆلۆجیەکەش، یان ئەوزانستەی بوونی پێدەناسرێت و لەواتاکەی دەکۆڵێتەوە ئۆنتۆلۆجیەکی بنەڕەتیەو لە بەشەکانی دیکەی ئۆنتۆلۆجیەوە جیاوازە.[٢٢٠] لەگەڵ ئەم سەرەتا نوێیەدا ڕاستەقینە نابێت بە(هیچ) یان جۆرێک لە (هەبوو). ئاگامەندی لەنێو بۆشایی و لەبیرچوونەوە و نەناسینی بنەڕەتی خۆیدا ناژی. ئەو دەزانێت ڕاستەقینە(بوون) ە و بەبێ (بوون) تەنانەت (هیچ) یش نیە و نابێت.

گەورەترین پرسیاری فەلسەفی، کە سەرهەڵدەدات سەبارەت بەواتای ئەوڕاستەقینەیەیە. ئاشکرایە بەبێ بوون هیچ شتێک نیە و نابێت. بەڵام واتای بوون پێویستی بە

[220] مەبەست لەوشەی (زانست) لێرەدا بۆ فینۆمینۆلۆجی بەکارم هێناوە، گوتارDiscourse یان توێژینەوەیە بەواتا یۆنانیە کۆنەکەی. من(فینۆمینۆ- لۆجی)، یان زاراوەی (لۆجی) بە (زانست) ی تاقیگەرایەتی و سروشتی، وەکو فیزیا یان کیمیا دانانێم. زمانێکی نوێی فەلسەفی و ڕەتکردنی زمانی فەلسەفی نەریتەکە، کە خۆی لەسەر کاتیگۆرییەکانی ئەریستۆ ڕاگیرکردوە پێویستیەکی دیکەی ئۆنتۆلۆجی فینۆمینۆلۆجیە. لەم ڕووەوە ناوەڕۆکی فەلسەفی توێژینەوەکەمان لەگەڵ خۆیدا، لەبەرئەوەی نوێیە، زمانێکی فەلسەفی نوێی پێویستە وشۆڕشە ئۆنتۆلۆجیەکە هاوکات زمانەکەشمان دەگۆڕێت و ئەوەش دەسەلمێنێت، کە زمان بنەڕەتی ئۆنتۆلۆجی خۆی هەیە.



ڕوونکردنەوە هەیە و هێشتا بەتەواوی نەزانراوە. بوون ئەم و ئەو شتە و دازاین(مرۆڤ) نیە، بەڵکو بوونی هەموویانە. هەموویان بەشێکن لەو ڕاستەقینەیەو هەر بەشەیان بەشێوەیەک لایەنێکی بوون دەردەخات. شێوەی خۆدەرخستنی بوون لەهەبوویەکدا(بۆنموونە مێز) لە خۆدەرخستنی لە بوونی مرۆڤدا جیاوازە. بوون لە سروشت و مێژوودا لەدووشێوازی جیاوازدا خۆی دەردەخات، کە بەئاسانی شێوازەکان دەناسرێن و جیاوازییەکانیان دەردەکەون. لەبەرئەمە توێژینەوەمان بۆ ناسینی بوون و تێگەیشتن لەواتاکەی لەنێو سروشتدا دەبێت جیاوازتربێت لە توێژینەوەمان بۆ مێژوو. لێرەدا ئۆنتۆلۆجی ناوچەگەری و زانستە سروشتی وکۆمەڵایەتیەکان سەرهەڵدەدەن، کە لەسەر ئۆنتۆلۆجی بنەڕەتی ڕاوەستاون. بوون یەک ڕاستەقینەیە، بەڵام شێوەی خۆدەرخستنی چەندلایەنی و جیایە . جیاوازی یان جیاوازییەکان لەنێوان بوون و هەبووەکاندا، هەبووەکان و بوونی مرۆڤدا، سروشت و مێژوودا، زمانەوانی نیەو بناخەیەکی ئۆنتۆلۆجی هەیە. جیاوازییەکە لەبنەڕەتەوە. بۆنموونە جیاوازی بوونی مرۆڤ لەمێزەکەوە لە بونیادی ئۆنتۆلۆجی مرۆڤ و مێزەکەدایە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت ئەم دوو بوونە سەر بە دوو جۆر ڕاستەقینەی دووری ئۆنتۆلۆجین. دەزانین، کە (بوون) بنەڕەتی هەردووکیانە، بەڵام شێوازی خۆدەرخستنی بوون لەڕێگەی بوونی ئەم دووشتەوە جیاجیایەو جیاوازییەکی ئۆنتۆلۆجی پێبەخشیون. ئەگەر بوون ڕاستەقینەی هەمووشتێک و بنەڕەتی سروشت و مێژوو بێت، ئەوا لە

هەمووشتێک زیاتر لەئێمەوە نزیکە و هێشتا لەهەموو شتێکیش دوورتر دەبینرێت و لەبارەیەوە بەتەواوی نازانین و لەواتاکەی ناکۆڵینەوە. بە ڕەتدانەوە و رەتکردنی هیچگەرایەتی و گەڕانەوە بۆ (بوون) پێویستیەکی هەرە گەورەی فەلسەفی یەخەمان دەگرێت، ئەویش سەبارەت واتای بوونە.

تێگەیشتن لە واتای (بوون) داوای سەرەتای توێژینەوەمان لێدەکات. دەبێت گەشتەکەمان لەسەرەتایەکەوە بکەوێتەگەر، کە لەهەموو سەرەتایەکی دیکە لەپێشتر وگرنگترە. لێرەدا، لەگەڵ هەڵبژاردنی ئەم سەرەتایەدا بۆ بەرێخستنی گەشتەکە لەلایەنێکی بوونەوە بەرەو بوون دەڕۆین. هەڵبژاردنی ئەم سەرەتایەش هاوکات دەبێت لەسەربناخەی شۆڕشە فەلسەفیە بوونگەرایەتیەکە دامەزرابێت و هاوکات تێگەیشتنیشمان لەسەرەتاکە دەبێت نوێ بێت و لە نێو سترەکچەری نەریتە فەلسەفیەکەدا نەمێنێتەوە. لەبەرئەمە خەسڵەتەکانی شۆڕشەکە بەتەنیا لەهەڵبژاردنی سەرەتاکە بۆ ناسینی واتای بوون نیە، بەڵکو لە چۆنیەتی سەرەتاکەو تێگەیشتنمان و بەکارهێنانی زمانە فەلسەفیەکەشدایە لە تەفسیرکردنی چۆنیەتی سەرەتاکەدا. داهێنانی گەڕانەوە بۆسەر زمانی لۆجیکی سیستەمی کاتیگۆریتەکانی ئەریستۆ لەدوو ڕووەوە نەگونجاوە. ئەگەر کاتیگۆرییەکان لەم توێژینەوە ئۆنتۆلۆجیە فینۆمینۆلۆجیەدا بەکاربهێنرێنەوە ئەوە دەگەیەنێت، کە گۆڕانکارییە بنەڕەتیەکان ڕوویاننەداوە، یان گۆڕانکارییە بنەڕەتیەکان



بەزمانێکی نارێک و نادروست مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت. ئەمەش لەگەڵ ئەو بیرۆکەیەدا ناکۆکە، کە بناخەیەکی ئۆنتۆلۆجی بۆ زمان دیاریدەکات زمانی فەلسەفی بە سیستەمی ئۆنتۆلۆجی خۆیەوە گرێدەدات.

ئەو سەرەتا لەپێشترو گرنگترینە بۆ دەستپێکردنی گەشتەکەمان لەپێناوی دۆزینەوەی واتای (بوون)، بوونێکە یان لایەنێکی بوونە، کە پرسیار لەبارەی واتای بوونەوە دەکات. بوونێکە دەیەوێت لەواتای بوون تێبگات و ئاگامەندانەو بەنیگەرانیەوە مامەڵە لەگەڵ بووندا دەکات.

ئەم سەرەتایە بوونی مرۆڤە، کە لەنەریتە فەلسەفیەکەدا بە ناوەڕۆک و (خۆ) دانراوە. (خۆ) یەک بتوانیت بەبێ جیهانی دەرەکی هەبێت و (شتێک) ی جیاوازتربێت لە مێژوو. ئەم خۆیە لەبەر ڕۆشنایی سیستەمی کاتیگۆرییەکاندا لەنەریتەکەدا واتای بوونی لێکدراوەتەوە و بە (شت) ێکی جیا لە(لەش) دانراوە. بەڵام هێشتا جیاوازییەکەی لەگەڵ (لەش) دا نەبۆتە هۆ بۆ باسکردنی ئەم بوونە لە زمانێکی جیاوازتردا. بوونی مرۆڤ، بەپێچەوانەی بۆچوونی نەریتەوە، لەم شۆڕشە فەلسەفیەدا، سەرەتای گەشتەکە و بوونێکی مێژووییە. بوونێک نیە خاوەنی لەش بێت و لەمێژوو دابڕابێت. ئەو لەشە و مێژووش داستانی بوونی ئەوە. بەبێ مێژوو ئەم بوونە هەبوویەکی وەستاو و لاشەیەکی مردووی بێ داهاتووە. بیر لەم بوونە بەبێ مێژوو، مێژووش بەبێ ئەم بوونە ناکرێتەوە. بەڵام

چۆن یان بەچ زمانێکی نوێی فەلسەفی لەسەرئەم بوونە بدوێین؟ پێش هەموو شتێک، بەدرێژی لەپێشتریش ڕوونمانکردەوە، کە مرۆڤ خاوەنی بونیادی ئۆنتۆلۆجی خۆیەتی. ئەم بونیادە ناوەڕۆکێکی لەپێشتر ئامادەکراو بەبوونی مرۆڤ نادات و بوونیشی لەمێژوودا ناچار ناکات. بونیادەکە خەسڵەتە ئۆنتۆلۆجیەکانی ئەم بوونەمان بۆ دیاریدەکات، کە تایبەتمەندێتی و جیاوازی مرۆڤ لەهەبووەکانەوە دەردەخات. لەبەرئەوەی میتۆدی توێژینەوە ئۆنتۆلۆجیەکەش فینۆمینۆلۆجیانە یە، ئەم بوونە لە سەرەتاوە بەوشێوەیە دەناسرێتەوە، کە خۆی دەردەخات. ئێمەش پێش بیرو بیردۆزەکانی لەپێشتر لەبارەی ئەم بوونەوە ڕەتدەدەینەوە و ڕاستەوخۆ هەوڵدەدەین بوونی بناسین. بەوجۆرەی ئەم بوونە ڕاستەوخۆ خۆی دەردەخات، تێدەگەین، کە بوونێکە لێرەدا (دازاین *Da-Sein*) لەنێو جیهاندا دەژی. مرۆڤ هەرگیز فینۆمینۆلۆجیانە خۆی ، وەکو ناوەڕۆکی هۆشەکی دێکارتی یان مۆنادی لایبنیز دەرناخات. ئەو بوونێکە لێرەدا (بەبێ ناوەڕۆک پەیدابووەو هەوڵی داهێنانی ناوەرۆک بۆ خۆ تەواوکردن دەدات). بێگومان ئەم دەستەواژەیە کێشەیەکی فەلسەفی ئاڵۆزە. ئێمە ئەم بوونە دەبینین، کە لیرەدایە. ئەی چۆن بزانین ناوەڕۆکی نیە و خۆی ناوەرۆک دادەهێنێت؟

دروستە(بوون) بنەڕەتی لەبنەڕەت بەدەری هەموو هەبوویەک و ئۆنتۆلۆجیەکە. بەڵام (بوون) بنەڕەتێکی ئاگامەند نیە. نەخشەو پلانێکی لە پێشتر بۆ هەبووەکان



بەتایبەتی بوونی مرۆڤ (دازاین) دانەناوە. دازاین بوونێکی بەبێ ناوەڕۆکێکی لەپێشترە (لێرە) دا. بوونێکە بەو هەژاری و ناتەواوییەوە پەیدابووە. گرنگی ئەم بوونەش لە ئاگامەندیدایە. ئەو بەپێچەوانەی هەبووەکانەوە لەبوون بەئاگایەو ئاگامەندانە مامەڵەی لەگەڵدا دەکات و هەوڵدەدات لەواتاکەی تێبگات. ناتەواوی بوونی مرۆڤ لەبونیادی ئۆنتۆلۆجی ئەم بوونەدایەو هاندەریشە بۆ خۆ- تەواوکردن. پرۆسەی خۆ- تەواوکردنی مرۆڤ داستانی میژوو تۆماردەکات. ئەگەر مرۆڤ بەپڕی و تەواوی بەشێوەی هەبووەکان پەیدابوایەو ناوەڕۆکێکی نەگۆڕو چەسپاوی لەپێشتری پێبدرایە ئەوا هەوڵدان بۆ خۆ- تەواوکردن لەمێژوودا نادروست و نا- لۆجیکمەندانەش دەبوو. پێویسست ناکات بوونێکی پڕو تەواو خۆی تەواوبکات. ئەمە کێشەیەکی پارادۆکسە. هەوڵدانی بێوچانی دازاین بۆ خۆتەواوکردن و داهێنانی مێژوو بەڵگەیە بۆ بوونی مرۆڤ بە(نەبوون) یەوە. تێگەیشتنیش لە مێژوو لەبەر ڕۆشنایی ئەم شیکردنەوە بوونگەرایەتیەدا واتایەکی دروستی هەیە. چونکە ناتەواوی و کەموکورتی پێش مەرجن بۆ گۆڕانکارییەکان. بەم جۆرە، دەبینین مرۆڤ بوونێکی ناتەواو و ئاگامەند و مێژووییە. بەتەنیا مرۆڤ مێژووی هەیە، چونکە مێژوو داستانی ڕەوتی ژوورکێشی ئەم بوونەیە لەپێناوی خۆ تەواوکردندا. ئەم شێوازی بوونەش بەناتەواوی و ئاگاوە هاوکات خسڵەتێکی بنەڕەتی و گرنگی مرۆڤمان بۆ دەردەخات، کە مرۆڤ بەبێ ئەم خسڵەتە ناتوانێت ڕۆڵی مێژوویی خۆی ببینێت، ئەمەش (داهێنان) ە. مرۆڤ داهێنەرانە و بە ئاگاوە دەژی و جەخت

لەسەر بوونی ڕەسەنی خۆی دەکات. نەریتی مێتافیزیکی سەردەمەکەمان، کە خۆی لەکالآی تەکنەلۆجیادا دەرخستوە و مێتافیزیکییەکی هیچگەرایەتی و بەرهەمهێنەرە. هیچگەرایەتی و هەڵوێستی بەرهەمهێنەری تەکنەلۆجیا وابەستە بەمامەڵە کردنی ئەم مێتافیزیکە لەگەڵ بوون و تێگەیشتن لەواتاکەی. هایدیگەر ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە، کە نەریتی مێتافیزیکی لە ئەفلاتونەوە بۆ نیتشە هیچگەرانەیە. (بوون) لەبیرچۆتەوە و بە(هیچ) دانراوە. لەباتی (بوون) ئاماژە بۆ لایەنێکی کراوە و ئەولایەنە بە بنەڕەت و ڕاستی خوێندراوەتەوە. هاوکات لەئەفلاتونەوە(بوون) کراوە بە کارخانەی بەرهەمهێنان و سودی لێوەرگیراوە. سەردەمی تەکنەلۆجی ئەمڕۆش بەردەوامی و پەرەسەندنی نەریتە مێتافیزیکییە هیچگەرایەتیەکەیە. ناوەڕۆکی تەکنەلۆجیا لەتێگەیشتنی تەکنەلۆجیادایە بۆ واتای بوون. تەکنەلۆجیا لەبەرئەوەی سەربە مێتافیزیکی هیچگەرایەتی بەرهەمهێنەرە (بوون) بەسامان و گەنجینەیەکی ئابووری بۆ (وەبەرهێنان) دادەنێت. بایەخدانی بەبوون بەستراوە بە سود بەخشینی بوون لە پرۆسەی وەبەر هێنانەکەدا. گرنگی و نرخی پارچەزەوییەک لەکاتی وەبەرهێناندا دەردەکەوێت. ئەم ناوەڕۆکە تەکنەلۆجیە هەموو لایەنێکی بوون لەبەرڕۆشنایی سودو زیان بەپرۆسەی وەبەرهێناندا دەبینێت و لە واتاکانیان تێدەگات. زیادەڕۆیی تەکنەلۆجی بەتەنیا لەوەدانیە، کە زەمین و ئاسمان و ئەستێرەکانیش، وەکو سەرمایەو سامانی وەبەرهێنان دادەنێت و توانیویەتی لە



زۆر بواردا بەتایبەتی بواری زانستە سروشتیەکاندا بالآدەست بێت. زیادەڕۆیی تەکنەلۆجیا لەوێدایە، کە بوونی مرۆڤیشی خزانۆتە نێو چوارچێوەی وەبەرهێنانەوە و ئەم بوونەش، وەکو زەمین و ئاسمان و ئەستێرەکان، بەبێ جیاوازی بووە بە سامانی وەبەرهێنان. لێرەدا، هیچ جیاوازییەکی ئۆنتۆلۆجی لەنێوان بوونی مرۆڤ و هەبووەکاندا دانەنراوەو هەموویان خراونەتە نێو هەنبانەیەکەوە و بۆ سودلێوەسگرتن بەکاردەهێنرێن.[٢٢١]

مەترسی گەورە لەتەکنەلۆجیا لەم زیادە ڕۆییەدایە. ئەو پرسیارەی لێرەدا دێتە پێش ئەوەیە، ئایا تەکنەلۆجیاو نەریتەمێتافیزیکییەکەی چ گۆڕانکارییەک لەبوونی مرۆڤدا دەهێننەکایەوە؟ بەخزانە نێو چوارچێوەی وەبەرهێنانەوە بوونی مرۆڤ لەخەسڵەتە بەمرۆڤ بووەکانی خۆی ڕووتدەکرێتەوە. دەبێت بە شتێکی هەبوو، کەلوپەلێک، وەکو کەلوپەلەبەردەستەکانی دیکە و بەکاردێت. ئەمەش بەناڕەسەن بوون و نامۆکردنی ئەم بوونەیە. تەکنەلۆجیا بوونی مرۆڤی بەناڕەسەنی و نامۆوە دەوێت، چونکە ئەوبوونە بەسامان و گەنجینەیەکی ئابووری دادەنێت.

---

[221] لەم ساڵانەی دواییدا لە دەستگا ئابووری و فەرمانگەکانی دەولەتدا لەرۆژئاوا بەشێک بە ناوی(سامانی مرۆڤانە Human Resources) کرایەوە. ئەم بەشە بەرپرسە لە دامەزراندن و لابردنی کرێکارو فەرمانبەران و مامۆستایان لەسەرکار. سیستەمی تەکنەلۆجی مامۆستاش بەسامان بۆ وەبەرهێنان دادەنێت، وەکو کەلوپەل مامەڵەی لەگەڵدا دەکات.

ئاکامەکانی نامۆبوونیش نەرێن و لەم خاڵانەی خوارەوەدا کۆدەبنەوە:

1. مرۆڤ نارەسەنانە دەژی و ناتوانێت ببێت بەخاوەنی خۆی.
2. دەستەڵاتی داهێنان و بیرکردنەوەی داهێنەرانە دەدۆڕێنێت.
3. وەکو کەلوپەل دادەنرێت.
4. دەخزێنرێتە نێوسترەکچەرێکی تەسکەوە و لە دەرەوەدا بڕیار لەسەر پرۆژەکانی بوونی دەدرێت.
5. دواجاریش دەستەڵاتی پرسیارکردن دەدۆڕێنێ و ناتوانێت پەنجەی یاخیبوون بەرزکاتەوە.

سەردەمی تەکنەلۆجی، سەرەڕای پێشکەوتنی زانستە سروشتیەکان و ئاسانکردنی هەندێک لایەنی ژیان، نامۆبوونە. مرۆڤی سەردەمی تەکنەلۆجی نارەسەن دەژی و دەستەڵاتی داهێنان و پرسیارکردنی لەدەستداوە و بیرناکاتەوە. مەبەست لەبیرکردنەوە لەنێو ئەم توێژینەوەیەشدا لەپێشتر باسمکردووە بیرکردنەوەی داهێنەرانەیە نەک ژمێریاری (ماتماتیکی)، کە تەکنەلۆجیا پیویستی پێیەتی و بووە بە تاجی سەری.

بۆ ڕزگاربوون لەنامۆیی دەبێت خۆمان لەنێو چوارچێوەی وەبەرهێنانی تەکنەلۆجی دەربازبکەین و دەستەڵاتی پرسیارکردن و داهێنان بەخۆمان بدەین و هونەرمەندانە بژین. مرۆڤی هونەرمەند داهێنەرەو بەردەوام ڕاستیەکانی



بوون دەردەخات. بوونی داهێنەرانە یان هونەرمەندانە بوونی ڕەسەنانەیە، کە لەگەڵ بڕیاردان لەسەر پرۆژەکانی مێژوو تۆماردەکات. ئەو هێزەی دژی تەکنەلۆجیا و نەریتی مێتافیزیکی تەکنەلۆجیا و بیرکردنەوەی ژمێریاری دەوەستێت و لەنێو زەلکاوی وەبەرهێنان و تاریکستانی تەکنەلۆجیا ڕزگارماندەکات هێزێکە لەبوونی ڕەسەنی مرۆڤ و داهێنان و بیرکردنەوەی داهێنەرانەوە هەڵدەقولێت.

فەلسەفەی بونگەرایەتی، یان ئۆنتۆلۆجی فینۆمینۆلۆجی لەئەنجامی توێژینەوە ڕادیکالییە فەلسەفیەکەیدا ڕەتدانەوە و ڕەتکردنی نەریتی مێتافیزیکی بەرهەمهێنەردا تێگەیشتنی نوێی لەبوون و بوونی مرۆڤ و پەیوەندییانەوە هەیە. تێگەیشتنەکەش چاکسازی و داپۆشینی چەندلایەنێکی نا- پێویست نیە بەڵکو هەڵوەشاندنەوە و دامەزراندنە. هایدیگەر لەسەرەتای پرۆژە فەلسەفیەکەیەوە ئاشکراو نا- ئاشکرا بەردەوام هەوڵیداوە ئەو نەریتە، کە بە درێژای مێژووی مێتافیزیکی ڕۆژئاوا لە ئەفلاتونەوە خۆی سەپاندووە، هەڵوەشێنێتەوە.

هەڵوەشاندنەوە گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی و ناوەڕۆکی لەبیردا دروستدەکات و بەتەنیا ڕەتدانەوە نیە. لەهەمان کاتدا پرۆسەی دامەزراندنیشە. گۆڕانکارییە ناوەڕۆکییەکەی هاتۆتە پێش، پاش هەڵوەشاندنەوەی نەریتەکە، تێڕوانینێکی فەلسەفی جیاوازترمان بۆ مسۆگەردەکات. لەم تێڕوانینەدا گەورەترین پرسیار سەبارەت بوون دەبێت بە یەکەم

پرسیاری فەلسەفی و بیرکردنەوە خۆی بەو پرسیارە گەورەیەوە ماندوو دەکات. بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، پاش هەڵوەشاندنەوەی نەریتەکە، بوونی مرۆڤ دەبێت بەسەرەتای گەشتەکەو هەڵوێستی ئەم بوونە لەگەڵ بوونە گشتیەکەدا لەسەر زەمینە فەلسەفیە بوونگەرایەتیەکە ڕووندەکرێتەوەو لەئاسمان دادەبرێت. مرۆڤ لەم بۆچوونە فەلسەفیەدا بوونەوەرێکی جیهانی‌یە. جیهان پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجیە بۆ بوونی و نیشتمانی ئەوە. بوون، وەکو پێشمەرج و نیشتمان، نابێت بەسامان و گەنجینەی وەبەرهێنان. مرۆڤیش بەنیگەرانیەوە مامەڵە لەگەڵ نیشتمان و خاکی خۆیدا دەکات و نابێت بەڕوخێنەرو وێرانکەری نیشتمانی. بەبیروڕای من، ئەم هەڵوێستەی مرۆڤ بەرانبەر بوون، کە یەکێکە لە پێشمەرجە ئۆنتۆلۆجیەکانیش بۆ بوونی بناخەیەکی نوێیە بۆ ڕەوشتی ژینگەیی، کە کەم بیریار ئاوەڕیلێداوەتەوە. دژوەستانی بوونگەرایەتی بەرابنەر نەریتی مێتافیزیکی تەکنەلۆجیا تەنیا ئۆنتۆلۆجیانە نیە و نەبەستراوە بەتێگەیشتن لەواتای (بوون). ناکۆکییەکانی لەسەر بەها ڕەوشتیەکان بۆ پاراستنی ژینگەش هۆکاری دژوەستانەکەن.

خاڵێکی دیکەی گرنگ لەگەڵ سەرەتا نۆێکەدا پێویستە باسکرێت ڕەتدانەوەی یاسای ناسنامەی ئەریستۆو لەجێدانانی یاسای (وەکۆخۆی) یان یەکێتیە لەگەڵ جیاوازییەکاندا. بەگوێرەی ئەم یاسایەو بۆچوونی ئۆنتۆلۆجی فینۆمینۆلۆجیەوە (جیاوازی) ڕاستەقینەی بوونی



شتەکانە. بێجگە لەوەی سیستەمە ئۆنتۆلۆجیە ناوچەگەرییەکان لەیەکدییەوە جیاوازن و بابەتی توێژینەوەکانیان لەیەکدی ناچن، دیاردەکانی بوونیش، هەرتاکەیان لەوی دیکەیانەوە جیاوازە. لەسەرو ئەمانەشەوە، لەبە ر ئەوەی بوونی مرۆڤ ناوەڕۆکێکی نەگۆر و ناسنامەیەکی لەپێشتری پێنەدراوە، هەربوونێک یان دازاینێک، تایبەتمەندو جیاوازە. جیاوازیش دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی تێگەیشتن و تەفسیر و داهێنانی فرەجۆر لەژیاندا. بوونیش پێکەوە ژیانی جیاوازییەکانە. مانەوەی جیاوازییەکانیش ڕەسەنیەتی بوون دەپارێزیت و مرۆڤ توشی نامۆیی ناکات.

لەکۆتایی ئەم پڕۆژەیەدا، دەمەویت بڵێم، کە نیتشە کۆتایی بە قۆناخیکی دریژخایەنی نەریتی فەلسەفە دەهێنێت و دوا نوێنەری ئەو قۆناخە کۆتایی پێهێنراوەیەو هایدیگەر لەو کۆتاییەوە دەبێت بەسەرەتایەکی نوێ بۆ قۆناخێکی نوێ و تەواوکردنی پڕۆژەی تازەگەری. بیرکردنەوەی فەلسەفی هایدیگەر لەگەڵ ئەوگۆڕانکارییانەدا هێناوییەتەکایەوە مژدەی سەرەتایەکی نوێمان دەداتێ و بیرکردنەوەی فەلسەفیمانی بەقۆناخیکی دیکەی مێژووی بیرکردنەوە گەیاندووە. مرۆڤی سەردەم، دەتوانیت لەم سەرەتایەوە لەتاریکستانی نەریتی میتافیزیکی بەرهەمهێنەرو تەکنەلۆجیاوە بەرەو ڕووناکی بوون و داهێنان و ڕەسەنی هەنگاو بنێت. بیرکردنەوەی داهێنەرانە و ژیانی هونەرمەندانە بکات بە(هێزی رزگارکەر).

# پاشکۆی یەکەم

ئەم پاشکۆیە بەشی یەکەمی پەرتووکەکەی (هێنریک ویگاند پێزێت) ە بەناوی *Encounters and Dialogues With Martin Heidegger 1929-1976* لەسالّی ١٩٨٣ لەفرانکفۆرت بەزمانی ئەلّمانی بلاّوکرایەوە. لە سالّی ١٩٩٣ پرویز ئیماد و کێنیت مالی وەریانگێڕا بۆ ئینگلیزی و دەزگای چاپی زانکۆی شیکاگۆ لەچاپیداوە. منیش ئەم بەشەم لە زمانی ئینگلیزییەوە بۆ کوردی وەرگێڕاوە. نوسەری ئەم پەڕتووکە لە سالّی ١٩٢٩ لەزانکۆی فرایبۆرگ لەژێردەستی هایدیگەردا فەلسەفەی خوێندووەو بووە بەهاوڕێی ئەم فەیلەسوفە و تا مردنی هایدیگەر هاوڕێیەتیان بەردەوام بووە.[٢٢٢]

## وانە لەسەر مێتافیزیک ١٩٢٩

**"هاوڕێکانم، فەیلەسوفێکی شاراوە لەنێو هەموو مرۆڤێکدا هەیە."**

ئەم گوتەیەی ئەفلاتونم لە دایەلۆگی *Phaedrus* لەوانەکان لەسەر کلاسیکی یۆنانی لە ئامادەیی برێمنی کۆن خویندەوە و چەندجارێکیش بۆ خۆ ئامادەکردنم بۆ خویندنی فەلسەفە

[222] Heinrich Wiegand Petzet. *Encounters and Dialogues With Martin Heidegger 1929-1976*, translated by Parviz Emad and Kenneth Maly, Chicago: University Press, 1993.



بەرچاوکەوتەوە و سەرنجی ڕاکێشام. گوتەکە دلّخۆشکردنێک بوو بۆ ئەو ئالّۆزی و تێگەیشتنەم لەهەندێک کێشەی فەلسەفی. توێژەری هاندەدا بۆ ناوەوەی خۆی بگەڕێتەوە و تەوانای خۆی بدۆزێتەوە. تەواناییەک، کە مرۆڤ خۆی خاوەنیەتی و کەسێکی دیکە دەستەلاّتی بەسەرداناگرێت. هەرگیز نیازی خوێندنی فەلسەفەم نەبوو، تەنانەت نەمدەویست ببم بەمامۆستای فەلسەفەش. با، گوتەکەی نیتشە وەرگێڕم و بلّێم، بۆ من، بیرکردنەوەی ڕووت خەم و ئازار بوو نەک ئاهەنگ گێڕان. لەگەلّ تەواوکردنی خوێندنی ئامادەییدا حەزو ئارەزووم بۆ مێژوو زۆرتر بوو. کاتێک بیرم لە کارپەیداکردن لەشارەکەم هانسیاتیک لەبرێمن کردەوە ڕێزم لە بیروڕاکەی باوکیشم گرت، کە دەیویست یاسا بخوێنم. زانکۆی فرایبۆرگیش مامۆستای باشی هەبوو زۆر لە خوێندکارەکانی شارەکەشم ڕوویان کردبووە ئەوزانکۆیە و بەشە زانستیەکانی دیکەشی پێشکەوتووبوون.

لەو سالاّنەدا گێرهارد ڕیتەر Gerhard Ritter ژمارەیەکی گەورەی خوێندکارانی لە وانەکانیدا لەسەر مێژوو کۆکردبوەوە. هۆلّی وانەکانی فینۆمینۆلۆجیستی بەناوبانگ ئەدمۆند هوسرلّیش بەهەمان شێوە پڕبوو. هەولّدانم بۆ تێگەیشتن لەهوسرلّ سەرکەوتوانە نەبوو. لەپشوی یەکەمی خوێندندا نارەزایی و نائومێدی خۆمم بۆ یەکێک لە مامۆستاکانی فەلسەفە باسکرد. ئەو مامۆستایەش ئاگاداریکردم، کە ئەستێرەیەکی نوێ لە ئاسمانی فەلسەفەدا دۆزراوەتەوە و لەماربۆرگەوە بۆ فرایبۆرگ

هاتووەو ناوی مارتن هایدیگەرە. داوای لێکردم بچمە وانەکانیەوە. ئەمە ئەوکاتەبوو، کەهانا ئارنت لەدواییدا لەسەری نوسی و ناوی هایدیگەر، وەکو پاشایەکی نهێنی فەلسەفە گەیشتە هەموو جێگایەک لە ئەڵمانیا. پێش ئەوەی لەجێگاکەی هوسرڵ دامەزرێت و لەتەمەنی چل ساڵیدا، هایدیگەر ژمارەیەکی زۆری لەخوێندکاران بەرەو لای خۆی ڕاکێشا، لەهەموو وڵاتانی ئەوروپا و ئاسیاشەوە دەهاتن بۆلای. ئەمەش پەیوەندی بەوشێوازە ئازادەی هایدیگەر لە وانەگوتنەوەی فەلسەفیدا دژی نەریتی خوێندن هەبوو، کە وەکو موگناتیس، خویندکاری بەرەو لای خۆی ڕادەکێشا. هەرگیز بینینی هایدیگەرم بۆ یەکەمجار لەهۆڵی وانەگوتنەوەکەدا لەبیرناچێت. لەتێرمی هاوینی ١٩٢٩، هایدیگەر وانەی لەسەر پێشەکییەک بۆ خوێندنی ئەکادیمی پێشکەشکرد و باسی ئەشکەوتی ئەفلاتونی کرد. هۆڵی ژمارە پێنج بەو بەیانییە پڕبوو لەخوێندکاران. هایدیگەر بە پەلە هاتە نێو هۆلەکە. پێش ئەوە هەندێک لەخوێندکارەکانی، وەکو بیمیڵ و وایز زێکەر و بۆڵناو باسی هایدیگەریان کردبوو، کە چۆن دێتە ژوورەوە. گوایە هایدیگەر بە ڕواڵەت لەجوتیار دەچێت. بەڵام، کە تاماشای نێوچاوەکانی دەکەیت، دەکەویتە ژێر سیحروجادوی ئەم مامۆستایەوە و دەیناسیتەوە، کە ئەم کەسە دەبێت هایدیگەر بێت. کاتێک لاپەڕەکانی بەردەستی هەڵدەدایەوە و دەستی بەوانە گوتنەوە دەکرد، لاپەرەکانی نەدەخوێنەوە تەنانەت باسی نوسینی نێو لاپەڕەکانیشی نەدەکرد و لایدەداو بیری نوێی لا پەیدادەبوو. لای خوێندکارەکان، گرانترین و ئاڵۆزترین



کێشەی فەلسەفی ئاسان دەبووەوە و تێدەگەیشتن. دەنگە بەرزەکەی بەبێ گۆڕان لەشێوەی گوتندا پێویستی بەگوێگرتن و بیرکردنەوەی چڕ هەبوو. بۆڵناو لەم بارەیەوە دەڵێت: (فیختە بەم شێوەیە کاریدەکردە سەرگوێگرانی. دەتوانین بەراوردی هایدیگەر لەگەڵ مارتن لوسەریش بکەین. لێرەدا، لەهۆڵی وانە گوتنەوەدا هایدیگەر فەلسەفەی زیندوو کردەوە) .

وانەکانی ئێمەی جولان و ئۆقرەنەگیرانە گومانمان لەو فێربوونەکرد بەتایبەتی لەسەر جیهانی یۆنانی ، کەلەوەوپێش وەرمانگرتبوو. دنیاو ڕەهەندێکی نوێی بیرکردنەوەمان بۆاکرایەوە. لەهەمان کاتدا ئەم وانەیەی هایدیگەر، کەپێشەکی بوو زۆر لەو بابەتانەوە دوورنەبوو، کە لەپێشتر خوێندبوومان. بەڵام بەئاماژەکردنی بۆ ئەشکەوتەکەی ئەفلاتون و تەفسیرکردنی لەو وانەیەدا و ئێمەش لەو سەرەتایەدا تینوێتی بۆ زانیاری و خوێندنی ئەکادیمی لە فزیۆلۆجیەوە بۆ ڕۆمانی ئەڵمانی نوێ زۆرترکرد. میتافۆرەکەی ئەفلاتون گەلێک لەوانەکەی جۆناس کۆهن لەسەر سیستەمەکانی ڕەوشت، کە زۆر فۆرمەلێستانە بوو، کاریگەرتربوو.

هایدیگەر وەڵامی گەلێک پرسیاری نەئەدایەوە. ئەو وەڵامانەی ئامادەشی دەکرد پرسیاری دیکەیان تێدا پەیدا دە بوو. ئەو بەبێ وەستان پرسیاری دەکرد. ئەوخوێندکارانەی لەسەرەتاوە خۆیان ڕادەگرد لەکۆتاییدا لەئەنجامی

پرسیاکردنەکانی دەکەوتنە نێو گومانەوە. وانەکەی (لەسەرپێشەکیەکە) دەیگەیاندە ئەو دیو سنوورەکانی زانستەکانەوە. بەڵام بەرەوکوێ ئەیبردن؟ وادەردەکەوت، کە مێتافۆری ئەشکەوتەکە لەنێو هۆڵی وانەگوتنەوەکەدا، وەکو مەتەڵ بێت. ئەوانەی دانیشتبون بەپەرۆشەوە گوێیاندەگرت. مەتەڵێک، کە نەماندەزانی چۆن چارەدەکرێت و ئێمەش خۆمان لەبەر ڕۆشناییدا نەدەبینی. تەنیا ئەو مرۆڤە ئەسمەرە کورتە باڵایەی لەبەردەمماندا وانەکەی دەوتەوە و سەرنجی ئێمەی ڕادەکێشا، وادەردەکەوت خۆی بەڕووناکی {دەرەوەی ئەشکەوتەکە} گەیاندبێت و کلیلی نهێنیەکانی دۆزیبێتەوە. زۆرشتی ئەو تێرمەی فرایبۆرگم بیرنایەت. بەڵام زۆر ڕێگەم بۆکرایەوە و هیچ کامیان ئەو ڕێگەیە نەبوو من دەمویست. لەگەڵ خۆئامادەکردنیشم بۆ خوێندنی فەلسەفە، لەگەل وانەکانی هایدیگەردا بەردەوام نەبووم. چەند مانگێکم خۆش بوو، توانیم کەسانی ڕۆشنبیر لەنێو بازنەی ئەدەب و ئەکادیمیا لەڕێگەی(ئێرنست زین) ە وە بناسم. بەڵام لەخوێندندا دواکەوتم. چەند دنیای جیاوازهەن! ئەوانەی ناسیمن، زانایەکی سایکۆلۆجی لود ویگ کلاگس و فەیلەسوف نیکۆلای بێردیائێڤ و زانای ئایینی جو مارتن بیوبەر و زانای ئایینی کاتۆلیک ئێرک پرزیوارو ئەندازیار و پلانەری شار ئێرنست مەی، نوسەر ئەلفرێد نیومان و ئەندازیار مۆهۆل- ناگی بوون.

بەڵام هایدیگەرم لەبیرنەچوو. زۆرجار دەنگێک لەناخمەوە دەیگوت، وازم لەشتێکی گرنگ هێناوە. هاوڕێ



خوێندکارەکانم باسیاندەکرد لەوانەکانیدا چی ڕوودەدات. من یەکجار بەشداری وانەکانیم کرد و لێ ی پچرام. وادەردەکەوێت هایدیگەر دەستەڵاتی بەسەر ژیانی ڕۆشنبیری زانکۆدا گرتبێت. تەنانەت لەوشوێنانەشادا کەچالاکی نەدەنواند دۆست و دوژمنی هەبوو. زۆرکەس بەخۆشیەوە شوێنی دەکەوتن و هەندێکیش گاڵتەیان پێدەکرد. گاڵتەیان بە جل و بەرگی دەکرد، کەشیاونەبوو. ئەوشەرواڵ و چاکەتێکی کورتی لەبەردەکرد و یەخەی کراسەکەشی دەردەهێنا. بەڕواڵەت لەجوتیارێکی (هێسیان) دەچوو. لەماوەیەکی کورتدا گاڵتەپێکردنەکە نەما. زۆر خوێندکاران، وەکو من، کە لە فەلسەفە تێنەدەگەیشتن، هایدیگەر بۆئەوان بوو بەو مامۆستایەی ژیانیانی گۆڕی.

٢٤ ی مایسی ١٩٢٩ هایدیگەر ڕۆبێکی مامۆستایەتی لەبەردابوو، هاتە نێو هۆڵەکەوە و وانەیەکی بەناوی (مێتافیزیک چیە؟ ) گوتەوە. ئەو وانەیە کاریگەرێتی قوڵی لەمندا بەجێهێشت- هەستم کرد بروسکەیەکی ڕووناکی لەئاسمانی دەرەوەی ئەشکەوتەکەوەپێکامی. هەمووشتێکم لەدەوروبەرما بەڕووناکی دەبینی. وانەکەی بەبێ کێشە نەبوو، چونکە هەموو ئەو زانینانەی هەڵدەوەشاندەوە، کە باو بوون. ئێمەش خۆمان لەبەردەم توێژینەوەیەکی ئەکادیمییدا نەبینی، بەڵکو لەئاستی پێویستیدا بۆ بیرکردنەوە خۆمان دۆزییەوە. هەستمان کرد نەک لەگەل سیستەمدا بەڵکو لەگەڵ بووندا مامەڵە دەکەین. پەردەکان لە بەردەم ڕوانینمدا لاچوون. باوەرەکانم، کە سیستەمی

فیربوون دروستیان کردبوو لەلام ونبوون. پرسیاری چوارەمی کانت، بوون بەمرۆڤ چیە؟ جارێکی دیکە لەلام سەریهەڵدایەوە. کاتیک هۆڵەکەم جێهێشت دەمم بەسترابوو. بۆساتێک هەستم کرد لەسەر بنی دنیا ڕاوەستاوم. لەناخمدا، شتێک جولا، کە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن نوستبوو. هایدیگەر بە پرسیارەکەی، بۆچی لەباتی (هیچ) بوون هەیە؟ لەخەو ڕایچڵەکاندم.

دوا تێرمم لەفرایبۆرگ سەبارەت پرسیارە بنەڕەتیەکانی مێتافیزیک بوو (جیهان، بڕاوە و تاکەکان). کات و شوێنی ئەو تێرمەم لەبیرناچێت. چوارجار لە هەفتەیەکدا کاتژمیر پێنج بۆ شەشی ئێوارە لەهۆڵە گەورەکە کۆدەبوینەوە. ئەو کاتە پەیوەندیم لەگەڵ هایدیگەردا نەبوو. هەوڵیشم بۆنەدا چونکە لەئاستی ئەو مرۆڤەو ئەو ئاگرەی لەناخیا دەسوتا شەرمن بووم. (ڕووبەڕووبوونەوەکەم لەگەڵ هایدیگەردا یادی جۆرج شمید{بەڕێوەبەری مۆزەخانەی باسیل} م هاتەوە، کەچۆن چووە بۆلای پیکاسۆ.) باسدەکات جەند بەگران توانیویەتی لەگەلێدا بدویت. ترساوەلەوەی شتێک بڵێت و گوتەکەی بێتەهۆی نیگەرانی و ڕێگر لەبەردەم سۆزو فلچەی هونەری ئەم هونەرمەندەدا. تەنانەت، پێویست بوو خوێندکار ئازاو چاونەترس بێت چونکە هایدیگەر لەنزیکەوە سەرنجی خوێندکارەکانی دەدا. لەنێو ئەوهۆڵەدا بارودۆخێکی ڕۆشنبیری تایبەت سەریهەڵدا بوو، کە ئەمڕۆ نازانم چۆن بیگێڕمەوە.



گفتوگۆکان لەو تێرمەدا لەسەر ئەو ڕاپۆرتانەبوو خوێنکارانی Dauoser Hochshulkurseلەبارەی دایەلۆگی نێوان هایدیگەر و ئێرنست کاسیرێر Ernst Cassirer ئامادەیانکردبوو. ڕاپۆرتەکان یادی ئەو دایەلۆگانەیان دەخستینەوە، کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لەنێوان بیریارەکاندا ڕوویاندەدا. گوتەیەکی هایدیگەر مێشک خەوتوەکانی هەژاند و باوەڕەکانی شێواندن. لەم گوتەیەدا هایدیگەر دەڵێت، ڕۆڵی فەلسەفە (ڕزگارکردنی مرۆڤە لە تەمەڵی بیرکردنەوەو گەڕانەوەی بەرەو چارەنوسی خۆی و بەکارهێنانی بیرکردنەوەی.) کێ ئەم گوتەیە ڕەچاوناکات؟ ئەم گوتەیە لەساڵس ماریاوە، پەنجاساڵ لەمەوبەر بوو بە سەرباسی کۆڕو گفتوگۆکانی هۆڵی وانەکانی زانکۆی فرایبۆرگ و خانوی نێو چیا بەفراوییەکان. ئەمەش گەڕان و لێکۆڵینەوە لە بیردۆزە نەبوو، بەڵکو لەبارەی بوونی مرۆڤ خۆیەوە بوو. زنجیرەی وانەکانی ئەو تێرمە بەگوتەیەکی نۆڤاڵیس کرایەوە، کەدەڵێت: (فەلسەفە خەموپەژارەی دوورەوڵاتیە-ئارەزوی مرۆڤە بۆ هەستکردن بەوەی لەهەرشوێنێکدابێت ئەوشوێنە بەخاکی خۆی دابنێت.) بۆ من دژواربوو فرایبۆرگ جێهێڵم. بۆشوێنێک، کەچالاکی بیرکردنەوەی تێدابیت و لێی دووربم خەموپەژارەی دوورەوڵاتی بوو.

# پاشکۆی دووەم

ئەم پاشکۆیە بەشێکە لە پەڕتووکێکی هایدیگەر بەناوی *Besinnung* لەساڵەکانی نێوان ١٩٣٦-١٩٤١ دا نوسراوەو بەرگی (٦٦) ی بەرهەمە کۆکراوەکانی هایدیگەرەوە لەساڵی ١٩٩٧ لە فرانکفۆرت بڵاوکرایەوە. پارویز ئێماد و تۆماس کالاری وەریانگێڕاوە بۆ ئینگلیزی و لەساڵی ٢٠٠٦ دا بەناوی *Mindfulness* دەزگای کوانتینوم لە لەندەن لەچاپیداوە. منیش ئەم بەشەیم بۆکوردی وەرگێڕاوە. ئەوەی سەرنجڕاکێشە لەم بەرهەمەی هایدیگەردا شێوازی نوسینەکەیەتی، کە بەپێچەوانەی نوسینەکانی پێشویەوە، وەکو نیتشە لەبەش و پەرەگرافی کورت و خەستدا بیروباوەڕە فەلسەفیەکانی دەربڕیوە. ئەم بەشەی وەرمگێڕاوە بەناوی (تەواوبوونی تازەگەری) پەرەگرافی (١٠،١١) و ژمارەی لاپەڕەکانی لە (١٩) بۆ (٢١).

## ١٠- تەواوبوونی تازەگەری[223]

لەگەڵ تەواوبوونی تازەگەرییدا کۆتاییش بەمێژووی

223 Martin Heidegger. *Mindfulness*, translated by Parviz Emad, Thomas Kalary, London: Continuum, 2006. Pp. 19- 21



مێتافیزیکی ڕۆژئاوا دێت- ئەو مێژووەی بەئاشکرا و شاراوەیی بیرکردنەوەی مێتافیزیکی ڕایگرتووە. دەتوانین بڵێین، کە کۆتایهێنان بە میتافیزیک سەرەتای تەواوبوونی تازەگەری دیاریدەکات. لیرەدا مەبەست لەتەواوبوون کاریگەرێتی تەواوی دەستەڵاتە بەسەر سەردەمەوە. تەوابوون، لەم ڕووەوە نەئامازەکردنە بۆ دۆزینەوی سەردەمێکی ونبوو، نە کۆتایی هێنانیشە بە شتە زانراوەکان. بەڵکو تەواوبوون مژدەی هەڵوەشاندنەوە و شێواندنی شتەکانی نێو سەردەمە بەبێ ئەوەی لەناوبچن و زەمینەیەکی دیکە بۆ دەستەڵاتیش دادەمەزرێت. کۆتاییهێنان بەسەردەمی میتافیزیک (بوون) لەواتای (بەماکینەکردن) دەردەهێنێت و بەو دەستەڵاتەی دادەنێت، کە لە واتای بەماکینەکردندا بوون لەبیرچۆتەوەو هاوکات بووە بە بناخەش بۆ هەموو نوێنەرایەتیکردن و بەرهەمهێنانێک. ئەم مامەڵە کردنە بۆ نوێنەرایەتیکردن و بەرهەمهێنانەی (بوون)، بوونی بە نە- بوون{هیچ} داناوە. بەرهەمهێنانی هەبووەکان بەماکینەکردنە {machination}، کە ڕۆڵی هەبووەکان دیاریدەکات و واتایان پێدەبەخشێت.

کاریگەرێتی بە کورت نەفەسی هەبووەکان ناپێورێت. وابەستە بە کاریگەرێتی بەماکینەکردنی (بوون) ەوە. بەماکینەکردن، هاوکات، دەبێت بە دیاردەیەکی واقعی و زاڵبوی (ویستی هێز) و زەمینەیەک، کە بە کاریگەرێتیەکەی نەناسراوەو لەنێو مێتافیزیکیشدا بڕوای پێنەکراوە. کاریگەرێتیەکەی دەستەڵاتێکی پێویست و نەوەستاوی

باڵادەستی هەموو دەستەڵاتەکانە. دەستەڵاتێکە بەرەوپێشەوە دەڕوات و نابێتە هۆ بۆ دروستکردنی بەماکینەکردن. پلان دانان، پێوەرەکان، ئامادەبوون و زاووزێکردن هەبوویەک پەروەردەدەکات، کە دەیەوێت ببێت بەشتێک. ئەمەش لەپێناوی گەیشتن بەئامانج و ئایدیایەک نیە و تەنیا گەیشتنە بەوەی دەیەوێت. چونکە گەیشتن بەوە سەقامگیرکردنی دەستەڵاتەو خۆشی بەو دەسڵاەتەوە دەهێڵێتەوە. وەدیهێنانی ئەم کارەش لەسەر بەماکینەکردن ڕاوەستاوە چونکە بەماکینەکردن لەئەنجامی کاریگەرێتی بوون، وەکو ئامادەبوون و بەردەوامی سەرهەڵدەدات. "بوون، بوونە بەئەو" ئەمە نکۆڵی کردنە لەبوون. لە "بوون، بوونە بەئەو" کاریگەرێتی بنەڕەتی بوون لە بەماکینەکردنی بووندا و لادان لەسەرزەمینەی ڕاستی خۆی تەواودەکات. دانانی بوون بەئەو{becoming} لە پێش بووندا دەستەڵاتی بەرهەمهێنان و ئامادەبوون دیاری دەکات. کاتێک بیرکردنەوە خۆی لە نێو دژوەستانی نێوان بوون و بوون بەودا دەبینێت نازانێت بیر لەچی بکاتەوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە بیرکردنەوە نازانێت چی لە مێتافیزیک بکات.

مێتافیزیکی هیگڵ و نیتشە، پێکەوە، لەنێو تەواو بوونی مێتافیزیکی ڕۆژئاوادا، بە چەپ و ڕاست تەفسیرێکی سەرتاپاسەری بۆ هەمووەکان دەکەن، کە دەبێت بە بیرۆکەی (هۆشی ڕەها) بۆ هیگڵ و (لەش) بۆ نیتشە، بەکورتیەکەی بۆ هەردووکیان بوون ئاژەڵێکی هۆشەکی ڕەهایە. سەردەمی



کۆیابیهێنان بەمیتافیزیک بوون دەخاتە ژێر دەستەڵاتی ماکینەوە، مرۆڤیش ( ئەوبوونەی بڕوای پێنەکراوە و پاسەوانی ڕاستی بوونە) بەهەڵوێستێکی ڕقاوییەوە و بێ سەرنج خۆی تەواودەکات. ئەم ئاژەڵە هۆشەکییە بووە بە خۆ(subject) و لەنێو مێژوودا خۆی پێشخستوە و کاریگەرێتیەکەی بە تەکنیکەوە گرێدراوە. مرۆڤی سەردەمی تەواوبوونی تازەگەری ئاژەڵێکی مێژووییە، هاندەرەکانی پاڵپێوەدەنێنێ بگاتە ژوور کردەوەکانی. ئارەزومەندانە لە ئەزموونەکانی ژیانیدا هەبووە سەرتاپاسەرەکان وەکو ژیان دەبینێت.

سەرهەڵدانی دوو جۆر گۆڕانکاری لەئاکامی مێتافیزیکی ڕۆژئاوایی نیتشە لە تەواوبوونی تازەگەرێتیدا شایەنی باسکردنن. میتافیزیکی قەیسەری Caesars و سپێنگلر Spenglr بۆ مێژوو هەروەها مێتافیزیکی کرێکاری یونگەر Junger . یەکەمیان مرۆڤ بەدڕندە دادەنێت و تەوابوونەکەش لە سەقامگیرکردنی دەستەڵاتی (قەیسەر) دا دەدۆزرێتەوە، کەخەڵکی بۆ خزمەتگوزاری ئەو دەستەڵاتە لە ڕێگەی ئابووری و تەکنیکی و جەنگی جیهانیەوە بەکارهێنراون. دووەمیان بیر لە ژیانی ئەم ئەستێرەیە(نە ئابووری و نە کۆمەڵایەتی و نە ڕامیاری) ناکاتەوە، بەڵکو دەڕوانێتە کرێکار، کە هەموو مرۆڤایەتی نوێ تیایدا دەبێت بە ئەندامی بونیادێکی ئۆرگانیکی سەرتاپاسەری هەبووەکان. بەهەرحاڵ، ناکریت بیروباوەڕەکانی سپێنگلر و یونگەر بەتەنیا لەبەر ڕۆشنایی زاراوەکانی، وەکو قەیسەر و

کرێکاردا بناسرێن. ئەم زاراوانە، کە پەیوەندییان بە بۆچوونیان سەبارەت بەتاکەکان هەیە ئاماژە بۆ مرۆڤی بەرز دەکەن، کە هاوکات ئاژەڵێکی ناچاریشە. بەهەرحاڵ، ئاماژەکردن بۆ یەک شێوەی چەسپاو بۆ زنجیرەیەک بیرکردنەوە بەردەوامبوون کورتە نەفەس و پاش دەخات. ئەم ئاماژەکردنە تەنیا پێشنیاری ئەو خاڵە دەکات تێکۆشان بۆ جێگەگرتن و دامەزراندنی بیروباوەڕ بەردەوامە و دەستەڵات بەرجەستەدەکات. شپلینگر و یونگەر سەر بە یەک سەرچاوەی مێتافیزیکن، بەڵام پاش دەرچوونیان لەم سەرچاوەیەوە بیروباوەڕەکانیان جیادەبنەوە. گرنگ نیە بزانین تاکو چ ڕادەیەک ئەمان ڕەتکراونەتەوە، بەکارهێنراون یان بی زیانن. ڕەشبینیەکەی شپلینگر و دینامیکیەتی ڕەوانی یونگەر لەهەرحاڵەتێکدا، دەبن بە زەمینەیەکی لەپێش بۆ ناونانی بوارە پێویست و لە بیرۆکەبەدەری نێو کۆمەڵ.

لەدەرخستنی مێتافیزیکی نیتشەدا لەلایەن شپلینگر و یۆنگەرەوە سەرتاپاسەری هەبووەکان میکانیکیانە بیریلێکراوەتەوە. لەبەرئەوەی مرۆڤیش بە ماکینەکردنەوە ئاڵۆزاوە، ئەوا بووە بە جێبەجێکەری ئەوپرۆسەیە. مرۆڤ، وەکو جەماوەری ڕێکخراوو ئەندامێکی ئەو ڕێکخراوەش، پێکرا دەستەڵاتدارو بێباکە، سەرۆک و ژێردەستەشە. لەبەرئەمە، دوا زاراوە لەئاکامی بەیەک گەیشتنی (سەرتاپاسەری هەبووەکان) و مرۆڤ (چارەنوس) ە. وەکو باڵاترین ویستی هێزی مرۆڤی دڕندە، بیرکردنەوەی



سەربازانە، کە لە جەنگی جیهانی و چەکدارکردنی بێ مەرج دێتە کایەوە ئاماژە بە کۆتاییهێنان بەمێتافیزیکی سەردەم دەکات. جەنگی جیهانی و ئاشتی بۆ جیهان(لەبیرکردنەوەی ئالۆزی، یەهودی- مەسیحایەتیدا) پەیوەندیەکانی نێو ڕیکخراوەکانی سەربە ماکینەکردن دەگرێتەوە. جەنگ و ئاشتی لەم سەردەمەدا وەسیلەیەک نین ئێمە بەئەنجامیک بگەیەنن و خۆشیان نابن بە ئەنجام بۆ خۆیان. جەنگی جیهانی و ئاشتی تەنیا لە تەواوکردنی هەبووەکاندان-ئەوهەبوانەی، کە بەهێزبوون و لە ناوچوونیان بەستراوە بە لەبیرچوونەوەی بوونەوە. بانگکردن بەرەو(چارەنوس) لەچەکدارکردنی هەبووەکاندایە بە لەبیرچوونەوەی بوون. هاوکات، چارەنوس، سەرکەوتنی بێ واتای ئەوقارەمانەیە، کە بە(خۆ) ناسراون‌و خاوەنی بڕیاردان نین. ئەمە پاشگەزبوونەوەیە لەواتای چەمکی مێژوو و تێگەیشتنە لەسەر ڕوونکردنەوەی هۆ و ئەو ئاکامانەی دەمانەوێت. سوربوون لەسەر چارەنوس دەرچوونێکی بێدەرە لە مێتافیزیکێک هەموو وزەکانی خۆی لەدەربڕین و دەرخستندا بەکارهێنابێت و هێشتا لەناوخۆیدا پەنگی خواردبێتە وە. بەتەنیا بانگی بوونێک، یان هەبوویەک، وەکو خوا (رووکردن لەخوای یەهودی- مەسیحایەتی دابینکەر) ناکات. بانگەوازەکەی بەرەو مرۆڤ و داهێنانی مرۆڤە، کە بەرزێتی خۆی دۆڕاندوە. بەرەو شوێنێکە، کە تەنیا کردەوەی دەستبەسەردا گیراو لەجیهاندا ڕۆڵی هەیەو داوا لەمرۆڤ و حەزو ئارەزووی بۆ ژیان و خواش بۆ دڵدانەوە دەکات. لێرەدا، خوا و جیهان و مرۆڤ،

هەرسێکیان دەبن بە بونیادێکی سێ کوچکەی سەرتاپاسەری هەبووەکان- بوارێکی مێتافیزیکی، کەلەبێ بناخەیی ڕاستی بووندا مرۆڤی سەرسوڕما و بەبێ باکانە لەنێوان هەڕەشەکردن و ئاسودەییدا دادەنێت.

## ١١- هونەر لەسەردەمی تەواوبوونی تازەگەرییدا

لەسەردەمی تەواوبوونی تازەگەرییدا مێتافیزیکیانە هونەریش تەواودەبێت. بەڵگەش بۆ ئەمە دیارنەمانی بەرهەمی هونەرییە، نەک هونەر. هونەر ئەو شێوەیە وەردەگرێت، کە بەماکینەکردن تیایدا هەبووەکان دادەمەزرێنێت و بەبێ مەرج بۆ مسۆگەرکردنی بەکارهێنان بەڕێوەیاندەبات. وەکو شێوەی بنەڕەتی کاریگەرێتی بەماکینەکردن هەبووە دروستکراوەکان (ڕێگەوبان، عەمباری فرۆکە خانە، بازدانی سەربەفر، دەستگاکانی وزە، بەرهەمهێنانی ڕووەک و خۆبەهێزکردن) بەشیوەیەکی جیاواز و بەگۆڕانی چیەتیەکەیان لەنێو سروشت و بۆ خەڵکی ئاسانکراون. سروشت بەگوێرەی دامەزراندنەکان (instalations) خۆی دەگۆڕێت و لەنێویاندا خۆی دەردەخات و دەبینرێت. سروشت لەنێو ئەم دامەزراندنانەداو لەسەرشێوەی ئەوان دەبێت بەشتێکی (جوان). لەبەر ڕۆشنایی مێتافیزیکی هونەردا، کە تەواوبووە (جوانی)، وەکو خسڵەتێکی بەدەستەڵات ماوەتەوە. جوانی ئەوەیە، کە ئارەزووی دەستەڵاتی مرۆڤی دڕندە دەجوڵێنێ و دڵخۆشیدەکات. ئەمەش وابەستە بە کۆڵدان و وازهێنان لە بوونی هەبووەکان. لەبەرئەمە گەڕان بەدوای(واتا) ی ئەم



هونەرەدا، کە لەسەرو بەرهەمەکانیەوە خۆی نیشاندەدات بێبەرە.

بێگومان، لەشێوازی تەکنەلۆجی نوێ و مێژوودا هونەر جارێکی دیکە دەبێتەوە بە تەکنیک *techne*– نەک لەبەرئەوەی خۆی بەوەوە دەبەستێتەوە، بەڵکو کۆتایی پێدێت یان تەواو دەبێت. لەشێوازی خۆ گونجاندنی لەگەڵ بەماکینەکردندا بۆنموونە بۆ ئەوەی ببێت بە دڵخۆشکەر، بەبێ مەرج پێکهاتەی هەبووەکان لەنێو بەماکینەکردنەکەدا ڕێکدەخات.

ئێستا، وانەکانی هونەر لەناوچووندان، بواری نادروستی دیکە بۆ ڕۆمانتیکییە دواییەکان کراوەتەوە، کە داهاتوویان نادیارە. وانەکانی هونەر بەناو ماونەتەوە و بوون بە کۆپیکردنی هۆنراوەو دراماو مۆسیقا و وێنەکێشان و پەیکەرسازی. ئەوەی هونەر دایدەهێنێت لەم بەرهەمانەدا، بەتایبەتی ئەو بەرهەمانەی خەسڵەتی مێژوویان پێوە دیارنیە، ڕاستی بوون، کەبنەڕەتی هەبووەکانە، دەرناخەن. ئەوەی هونەر بەرجەستەی دەکات دامەزراندنە (instalations) شێوەکانی هەبووە ڕێکخراوەکانە: (هۆنراوەکان) دەبن بە بانگەواز و لافیتە، لەوشتانە دەدوێت، کە هەن و بڕیاریان لەسەردراوە و خەڵکی ئاسودەدەکات. وشە، دەنگ و شێوە دەبن بە وەسیلە بۆ بونیادنان و ڕێکخستنی جەماوەر. نابێت فۆتۆگرافی و سینەما لەگەڵ بەرهەمە هونەرییەکانی دیکەدا مێژووییانە بەراوردبکرێن. هەردووکیان لەنێو مێتافیزیکی

تەواوبوونی هونەردا خەسڵەتی و نەریتی خۆیان هەیە. فلیمی سینەما دامەزراندنێکی گشتیە لەنێو ڕەفتارو هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتی نوێدا و مۆدێل و نیەتی نوێی ئەزموونی ژیانە. فلیم لە خۆیدا بێکەڵک نیە، بەڵکو ئەوەی دەریدەخات لە پێناوی پرۆسەی بە ماکینەکردنەکەدا بۆ ئەزموونی ژیان بڵاویدەکاتەوە بێکەڵکە. لەبەر لاساییکردنەوە و کۆپیکردن ئەوەی ئێستا هونەر ئامادەیدەکات لەناوچوونی بەرهەمی هونەرییە. هونەری کاڵوکرچ سەرهەڵدەدات و بە کاڵوکرچی نابینرێت. کاڵوکرچی هونەر بە بەرهەمێکی نزم دانانرێت، بەڵکو دەبێت بە بلیمەتی و وەستایی لەدەربڕینی بەتاڵ و بێ ناوەڕۆک و مسۆگەرکردنی بیروڕای جەماوەر.

نەک تەنیا بەراوردکردنی مێژوویی ئەم کاڵ وکرچیە لەگەڵ بەرهەمی هونەرییدا ئێستا نادروستە، تەنانەت ناگونجێت لەسەر بەهاکانیش بدوێین، کە بەدرێژایی میژوو بە ئێمە گەیشتون. ئەوەی لەمێژوودا بە ئێمە گەیشتووە و فێریکردووین و بیرکردنەوەمانی وروژاندوە هونەرێکی تەواوکۆیە. ئەوەی ئەمڕۆ بە بەرهەمی هونەری دادەنرێت لەشێوە بەدەرنیە. بەڵام شێوەکەی لەپرۆسەی بەماکینە کردنەکەوە گرێدراوە، کە خۆی بۆ ڕێکخستنی ژیانی خەڵکی تەرخانکردووە. لەبەرئەمە هەڵوێستی دۆستانەی هونەر بەرانبەرخەڵکی لەنێو پرۆسەی بەماکینەکردن و دەستەڵاتی تەکنەلۆجیادا ڕەگوڕیشەی داکوتاوە. بەپێچەوانەی سەدەی نۆزدەهەمەوە، شێوەی هونەری مێژوویی ئەوە نیە بەتام



بێت و بەرپرس نەبێت.[224] مێژووبوونی هونەر لەسەر بەماکینەکردنی هەبووەکان ڕادەوەستێت و لەوێوە بەرپرسی خۆی دەستنیشان دەکات. (مۆزەخانە) شوێنی پاراستنی ڕابردوو نیە، پێشانگایە بۆ بانگەواز و نەخشەکێشانەکە. بەواتایەکی فراوانتر بۆ ڕێکخستنی "زەمین" ، نەخشەکێشانەکە پارچە پارچەو لەیەکداپچڕاو نیە بەڵکو، لەپێشتر و بەر لە کاریگەرێتیەکەی گشتگرانە بۆی ئامادەکراوە. ئەوەی لەونەخشەیەدا دانراوە ڕاستەوخۆ خۆی دەردەخات و دەکەوێتەگەر: داواکردنی دەستەڵات، خۆپیشاندانی ژمارەکان، درێژی و پانی و بەرزی. پێشانگا ئەو واتایە دەدات، کە ئەوەی پیشاندراوە لەوەو پێش لەسەرئەو پرنسیپاڵە لە پێشترە دامەزراوە. بەرهەمەکانی هونەر لەسەردەمی تەواوبوونی تازەگەرییدا[225] خەسڵەتی دامەزراندنیان هەیە، کە لەژێرچاودێری نەخشەو پلانە لەپێشترەکەدا ئەو هەبووانە دەهێنێتەکایەوە بتوانرێت

[224] ئەو زاراوە و ڕستانەی خراونەتە نێو ئەم جۆرە کەوانەیەوە، وەرگێڕ بۆ ڕوونکردنەوەی واتای دەقە وەرگێڕاوەکە دایناوە و لەنێو دەقەکەدا نیە.

[225] هایدیگەر واتای تەکنیکی لەزمانی یۆنانی کۆندا، کە بۆ یەکەمجار بەکارهێنراوە ڕوونکردۆتەوە. لەوباوەڕەدایە زاراوەی تەکنیک بەتەنیا واتای پیشەی دەستی و هونەر نابەخشێت و ئەو واتایەشی نیە ئەمڕۆ لەسەردەمی تەکنەلۆجیدا بەکاریدەهێنین. بەڵکو، لەزمانە یۆنانیە کۆنەکەدا تەکنیک ڕێگەی زانینە. بروانە:

Martin Heidegger. “The Origin of the Work of Art”, in *Off the Beaten Track*, translated by Julian Young and Kenneth Haynes, Cambridge: Cambridge University Press, 2002. P. 35

دەستەڵاتیان بەسەردا بگیرێت و لەنێو ڕێکخستن و گونجاندنی دیمەنی پێویستی و پێوەرەکاندا جێگەی خۆی بکاتەوە. بەهەرحاڵ، لەبەر ڕۆشنایی کاریگەرێتی پرۆسەی بەماکینەکردنی بەرهەمەکان، بۆنموونە ئەوەی لەگەڵ دیمەنەکەدا دەگونجێت پێویستە لەپێشتر تەکنەلۆجیانە ببینرێت و بەرهەمە تەکنەلۆجیەکانیش دەبێت لەنێو دیمەنەکەدا جێگەیان ببێتەوە.

شێوەی نواندنی بەرهەمەکان پەیوەندی بەخە سڵەتی دامەزراندنەوە هەیە، کەبەرهەمەکان لەئامێزدەگرێت و داگیریاندەکات. ئەمە، وەکو" ئەزموونی ژیان" ، "ڕاهێنان لەنێو ئەزموونی ژیاندا" هەمووشتێک لەژێر کاریگەرێتی بەماکینەکردنەکەدا دەپێورێت و بەهای بۆ دادەنێت. ئەمەش ئەو واتایە دەبەخشێت بەدوای بوونەکاندا نەگەڕێن و هەست بە بۆشایش نەکەین. گەڕان و دۆزینەوە بەتەواوی دەخرێتە نێو ژیانی بەماکینەکردن. ئەوەی دەبێت بە بوونی تاکەکەسێک، خە سڵەتی کەسانی دیکەیە بەمەوەلکاوە یان ئەو هەڵیگرتووە.

هونەر بەدەربڕینی ژیان دادەنرێت، بەهاکەشی لە سەرکەوتنی دەربڕینەکەیدا دەبینرێت. ئەوەی لەژیاندا هەبێت لەبەرهەمی هونەرییدا ڕەنگیداوەتەوە( بۆنموونە، پیاوەتی بەماسولکەی گەورەو دڕندەییش بە دەموچاوی ناشیرین و نەناسراو) دە ربڕوان. بەڵام، لێکدانەوەی هونەر، وەکو دەربڕین ئەوەش دەگەیەنێت، کە هونەر دەبێت لەژێر



کاریگەرێتی دامەزراندندا{ instalations} لایەنەکانی ڕاهێنان لەئەزموونی ژیاندا دەربڕێت. کەوابوو، مێژوو، وەکو زانستیک تەفسیرێکی نوێی بۆ ناکرێت، لەژوور پەیوەندییەکانەوە زانینی نوێ مەزنی بە توێژەرەکان بدات و ئاگاییبیان ڕاچڵەکێنێت. لەنێو پێویستیەکاندا زانست بووە بە شتێکی زۆر جیاوازتر لەوەی کاتی پێشوتر بیریلێکراوەتەوە. نە زەمینەیەکە، نە ڕێگەیەکیش بۆ زەمینە. بووە بە تەکنیکی ڕێکخستن بۆ مەشق و ڕاهێنان و مسۆگەرکردنی ئەزموونی ژیان لە ڕێگەی بەماکینەکردنەوە. شێوەکانی کارکردنی زانستەکانی ئەمڕۆ لەڕێگەی ڕێکخراوەکانەوە، بۆنموونە زانکۆکانەوەیە. ئەمانەش دەزگای توێژینەوە و خوێندگاکانن بۆخوێندنی باڵاو فێربوون. بەم جۆرە، هونەر دەبێت بە بەشێک لە پەرەسەندنی بەماکینەکردنی بەرهەمهێنانی هەبووەکان و لەخزمەتگوزاری ئەوپرۆسەیەدا سنوور بۆ هیچ شتێک دانانێت. هونەر دەبێت بە ڕێکخستنی دامەزراندن لەپێناوی بەرهەمهێناندا. لەبەرئەمە پێش سەرهەڵدانی دەزانین، کەخاوەنی بڕیاردان نیە. هونەر لەبەشداریکردنیدا لەگەڵ کاریگەرێتی تەکنەلۆجیاو مێژوو دەیەوێت ئەوبەرهەمانە ڕێکبخات، کە لەپێشتر پرۆسەی بەماکینەکردنەکە بڕیاری لەسەرداون. لەبەر ئەمە هونەر{لەم سەردەمەدا} دەستەڵاتی بڕیاردانی نیە. بەپێچەوانەی ئەمەشەوە،

ئەگەر بمانەوێ هونەر کاریگەرێتی خۆی لە دۆزینەوەی ڕاستی بووندا بخاتەگەر، دەبێت خۆمان بەسەردەمێکی

مێژوویی دیکە بگەیەنین. تەنیا لەڕێگەی تەفسیرێکی چەواشە بۆ ئەم مێژووە مێتافیزیکی هونەر دەناسرێت.

تێگەیشتنی نیتشە لەهونەر، وەکو "هاندەری ژیان" جێگەیەکی سەیر لەنێوان ئێستاتیک و مێتافیزیکی بەرهەمی هونەری هونەریش، وەکو پرۆژەیەکی تەواوبووی بەماکینەکردندا دەستنیشاندەکات. ئەم چەمکە {هاندەری ژیان} لەبواری مێتافیزیکی خۆیدا گیردەخوات، کە لای نیتشە هەڵگێڕانەوەی ئەفلاتونیزمە. ئەمڕۆ تێگەیشتنی نیتشە بۆهونەر کاریگەرێتی کاڵوکرچی بەسەرهونەر و هەڵوێستی هونەر بەژیانەوە هەیە.

هونەری ڕەسەنی مۆدرێن، ئەوهونەرەی لەژوو بۆچوونی هیگڵ بۆ هونەر وسەدەمی نۆزدەهەمەوەیە بەداهێنانی ئاشکرای پرۆسەی دامەزرانندا دەناسرێتەوە، کە لەنێو هەبووەکاندا دەبینرێت. لەسەرو ئەمەشەوە بەردەوامییە مێژووییەکەی (هونەری پێشەسازی) سەدەی نۆزدەهەمە، کەئەمڕۆ بە کەلتووری ڕامیاری دادەنرێت لەتەنیشت ئەم بەردەوامییە شەوە، تێڕوانین و چێژوەرگرتن لەو نەریتەهونەرییەی میراتی ڕۆژئاوا بۆ مەبەستی خوێندن و توێژینەوەی هونەری ڕەگوڕیشەی داکوتاوە.

لەلایەکی دیکەوە، دەبینین ئەوانەی بیرلەهونەردەکەنەوە ناتوانین بڕیارلەسەر بیرکردنەوەکەیان لەدەرەوەی چواچێوەی دەستەڵاتی بەماکینەکردنەکەدا دامەزرێنن و



زەمینەیەکی بۆ بدۆزنەوە. بیرکردنەوەی بڕیاردان لەسەر هونەر دەبێت لەدەرەوەی بیردۆزە هونەرییەکاندابێت. بۆیە تێپەڕکردنی ئێستاتیک کارێکی پێویستە، ئەوەی بەهەڵەش تەفسیرکراوە ئەو خاڵەیە، کە ئێستاتیک بەجۆرێک لەهونەری دیکەی جێگەی پڕبکرێتەوە. ئەم بیرکردنەوەیە هیچ مامەڵەیەک لەگەڵ بەرهەمی هونەری و پەیوەندییەکەی بەهونەرمەند و ئەوانەوەنیە چێژی لێوەردەگرن. تەنانەت ئەم مامەڵە کردنەش مێتافیزیکیانە نامگەیەنێتە ئەو هونەرەوە. کاتێک ناوەڕۆکی بەرهەمی هونەری بەڕاستی بوونەوە دەبەسترێتەوە و لەسەرئەو زەمینە دادەنرێت. واتایەکی جیاواز بەپرسیاری مێژوویی سەبارەت بەرهەمی هونەری دەدرێت. لێرەدا، بەرهەمی هونەری دەبێت بەکردەوەیەکی بنەڕەتی بۆ دەرخستن و بڕیاردانی بوون. ئەمم جۆرە بەرهەمە هونەرییە نەهێمایە نە دامەزراندنی هەبووەکان. ڕۆشنکردنی بوونە، کە بڕیاردان بۆ مرۆڤ و شێوەی بوونی ئاشکرادەکات. هونەردەبێت بەخەسڵەتی دازاین[مرۆڤ] .

## پاشکۆی سێیەم

ئەم پاشکۆیە وەرگێڕانی چەند برگەیەکی( لەبرگەی ١٢٦ بۆ ١٣٠) ی پەرتووکی (بوون وکات) ی  هایدیگەرە، لەزمانی ئینگلیزییەوە بۆ کوردی وەرمگێڕاوە. ئەم پەرتووکە دوجار وەرگێڕاوەتە سەرزمانی ئینگلیزی. ئەم برگانە لەوەرگێڕانەکەی جۆن ماکوێری و ئێدوارد رۆبسنەوە وەرگیراوە.[226]

### بوون بە- خۆی ڕۆژانە و "ئەوان"

ئەنجامی ئۆنتۆلۆجیانەی شیکردنەوەکەمان بۆ بوون_ لەگەڵدا داوامان لێدەکات پێناسێکی بوونگەرانە بۆ بوونی دازاین و کەسانی دیکە بکەین_ ڕوونیکەینەوە بوون بۆ هەرکەسە چۆن دەبێت. لەوێدا خۆمان بەوخاڵەوە ماندوودەکەین، کە چۆن ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ کەسانی دیکەدا بەوجۆرەی هەن و بەوجۆرەی هەڵسوکەوت دەکەن ڕوودەدات.

ئەوەی گرنگە لەهەڵسوکەوت بەرانبەر کەسانی دیکە، ئەو هەڵسوکەوتە دژی ئەوان بێت یان نا، پێویستە بزانرێت، کە

[226] Martin Heidegger. *Being and Time*, translated by John Macquarrie and Edward Robinson, London: Blackwell, 1997. Sections 126- 130, Pp.163-168



جیاوازی لەنێوان تاکێک و ئەوانداهەیە. ئینجا ئەوجیاوازییە شتێکی ڕیزپەڕانە بێت، یان دازاین خۆی بە تێپەڕکردنی ئەوان پەیدای کرد بێت، یان جیاوازییەکی لەپێشترە و بۆ تێپەڕبوونی ئەوان دانراوە لەهەموو ئەم حاڵەتانەدا، دوورکەوتنەوە لە ئەوان {لەسەربنەمای جیاوازی} دەمانشێوێنێت. ئەگەر ئەمە بوونگەرانە دەربڕین، بوون_ لەگەڵ_ئەوانی دیکە خەسڵەتی دوورکەوتنەوە{ *Abstandigkeit*} ی هەیە. چەند ئەم خەسڵەتە شاراوە بێت و بەرچاونەکەوێت ئەوەندە زیاتر خۆی دەسەپێنێت.

لەم دوورکەوتنەوەیەدا، کە لەبوونی مرۆڤدایە لەگەڵ ئەواندا و دازاین [مرۆڤ] لەژیانی ڕۆژانەدا، وەکو بابەتێک لە بەردەم ئەواندا ڕادەوەستێت. ئەوخۆی نیە{ *Nicht es selbst ist*} وئەوان بوونیان داگیرکردووە. پرۆژەکانی ڕۆژانەی دازاین بەدەست ئەوانە و ئەوان بەوجۆرەی دەیانەوێت بڕیاری لەسەردەدەن. ئەوانیش، کەسانێک نین بناسرێنەوە. بەپێچەوانەوە، هەموویان لەیەکدی دەچن و نوێنەرایەتی یەکدی دەکەن. لەم داگیرکردنە بەرچاونەکەوتوەدا تاک دەبێت بەئەوان و دەستەڵاتی ئەوان زۆرتردەکات. " ئەوان" نیش، کە تاک ئاماژەی بۆدەکات لەژیانی ڕۆژانەدا لەوێدان و لەگەڵ تاکدان. " ئەوان" کەسێ یان ئەم و ئەو ، نیە و بەڵکو "ئەوان" ن

{ *das Man*} بەگشتی.[٢٢٧]

لەپێشتر باسمانکرد، چۆن لەژینگەی کۆمەڵایەتیدا، کە نزیکترینە و لەبەردەستماندایە، بۆ ئێمە جێگەی بایەخدانە. لەبەکارهێنانی وەسیلەی گواستنەوەو ڕاگەیاندن، وەکو خوێندنەوەی ڕۆژنامە، کاسانی دیکە هەموو لەیەکدی دەچن. بوون_ لەگەڵ_ کەسانی دیکەدا، بوونی دازاین لەنێو بوونی ئەواندا بەجۆرێک دەتوێنێتەوە، کە جیاوازییەکانی نێوانیان ووندەبن و دەستەڵاتی دیکتاتۆری ئەوان دەردەکەوێت. { لەژێر ئەم بارودۆخەدا} ئێمە خۆشی لەوشتە وەردەگرین، کە ئەوان لایان خۆشە، وەکو ئەوانیش دە خوێنینەوە، دەبینین، هونەر و ئەدەب هەلدەسەنگێنین، ئەوەی ئەوان دەهەژێنێ ئێمەش دەهەژێنێ. " ئەوان"، کە پێناسێکیان بۆ ناکرێت و هەموون، بەڵام کۆی تاکەکان نیە، جۆرێک بوون دیاریدەکەن، کە بەبوونی ژیانی ڕۆژانە ناوزەد دەکرێت. " ئەوان" شێوەی بوونی خۆی هەیە. ئەوشێوازی بوونەی لەگەڵ_ کەسانی دیکەدا بە" دوورکەوتنەوە" دامانا، دەبێت بە بوونێکی مامناوەندی{ averageness} و خسڵەتێکی

[٢٢٧] "ئەوان" بۆ هایدیگەر خەسلەتێکی دیاریکراوی نیە، تاکو بەو خەسڵەتە پێناسبکرێت. تەنانەت هایدیگەر بەبێلایەن neuter ناوزەدی دەکات. مەبەستیش لەبێلایەنی ئەوان ئەوەیە، کە نە نێرن و نەمێ، نە سەربەم یان بەو بیروباوەڕو ئایینەن، هاوکات هەموویانن، ئەوانن بەگشتی.



بوونگەرانەی " ئەوان" و بوونی " ئەوان " هۆکاری خۆی لەشیوازی مامناوەندییدا گلدەداتەوە. لێرەوە بەهاکان بە ڕەوا و ناڕەوا، گونجاو و نەگونجاو دەبینێت. لێرەوە دەڕوانێت و چاودەخاتە سەر ئەوانەی دەیانەوێت لێیدەرچن. نهێنیەکان هێز و دەستەڵات وندەکەن.

مامناوەندێتی ژیانی ڕۆژانە بایەخ بەشێوازێکی بوونی مرۆڤ دەدات، کە لێرەدا بە " تەخت کردن" ی { Levelling down} هەمووپڕۆژەکانی بوونی دادەنێم. دوورکەوتنەوە، مامناوەندێتی و تەخت کردن دەبن بە خسڵەتی ئەوان لەبوونی گشتیاندا { *die offentlichkeit*}.[٢٢٨] بوونی گشتی دەست بەسەر جیهان و دازاییندا دەگرێت و هەمیشە خۆی بەڕاست دادەنێت. نەک لەبەرئەوەی پەیوەندییەکی دروستی بە شتەکانەوە هەیە، یان بەئاشکرا مامەڵە لەگەڵ دەستکەوتەکاندا دەکات، بەڵکو گوێناداتە جیاوازییەکان و ڕەسەنی. لەبەرئەمە بەناخی مەسەلەکان ناگات و هەمووشتێک بەئاسانی دەستدەکەوێت. "ئەوان" لەهەمووشوێنێکدان و بڕیارەکانی دازاین دەقۆزنەوە. لەبەرئەوەی " ئەوان" خۆیان دەکەن بەخاوەنی بڕیارەکان و

[228] زاراوەی ( بوونی گشتی ) یم بۆ (Publicness) ی ئینگلیزی داناوە. ئەم زاراوەیە هاوکات بەرانبەر بوونی تایبەتی ڕادەوەستێت. مەبەستی هایدیگەر لەم بوونە ژیانە لە نێو خەڵکیداو کۆڵدان و وازهێنانە لە پڕۆژە تایبەتیەکان بۆ خەڵکی، کەدەبێتە هۆی نامۆیی و بوونی ناڕەسەنانەی تاک.

حوکمدەدەن، مافی وەڵامدانەوە لەدازاین دەسەننەوە و خۆیان وەڵامەکان ئامادە دەکەن. ئەمەش کارێکی ئاسانە چونکە " ئەوان" هیچ کەسێکنین تاکو بەرپرسبن. هەمیشە، دەڵێین، " ئەوان" کردیان، ئەوانیش دیارنین کێن. لەژیانی ڕۆژانەی دازاییندا { "ئەوان" } ە ی کارەکان جێبەجیدەکەن {کەس} نین.

لەم ڕووەوە، دازاین لەژیانی ڕۆژانەیدا "ئەوان" لێپرسینەوەی بریاردان لەسەرکارەکانی دەگرنە ئەستۆ. تەنانەت لەئەرکی لێپرسینەوە لەئاستی بوونی خۆشیدا دووردەخەنەوە. ئەوان باوەش بۆ دازاین دەکەنەوە، ئەگەر دازاین لەگەڵیاندا خۆش ڕەوبێت. لەبەرئەوەی "ئەوان" لێپرسینەوەی دازاین لادەبەن، زیاتر لەسەقامگیرکردنی بڕیارەکاندا پێدادەگرن.

هەمووکەسێک ئەوی دیکەیە و کەس خاوەنی خۆی نیە. "ئەوان"، کە وەڵامی هەموو پرسیاریکی ژیانی ڕۆژانەی دازاین دەدەنەوە و دازاین لەنێویاندا دەژی و تەسلیمیان دەبێت هیچ {کەس} نین. لەم خەسڵەتانەی بووندا، وەکو بوون لەگەڵ_کەسانی دیکەدا، لەژیانی ڕۆژانەدا، دوورکەوتنەوە، تەخت کردن و گشتبوونی و سووککردنی لێپرسینەوە، (نەگۆڕان) ی دازاینیش نیشاندەدات. ئەم نەگۆڕانە بەردەوامی و مانەوەی بابەتێک نیە، بەڵکو بوونی دازایینە لەگەڵ ئەواندا. لەم مانەوەیەدا نە دازاین، نە ئەوان دەتوانێت خۆی بناسێت. لەم بارودۆخەدا شێوازی



بوون نارەسەنانەیە و لەناسینەوەی خۆیدا سەرنەکەوتووە. ئەم شێوازی بوونە چی لەو فاکتۆرە کەمتر نیە، کە دازاین دە کات بە (ئەوان) و کەسایەتی لەدەستدەدات و لەنێو داکەوتدا {*ens realissimum*} دەمێنێتەوە.

بەهەرحاڵ، ئەوان، وەکو دازاین دەبێت بە بابەت. چەند هەڵسوکەوتیش بکات، بۆ ناسینەوەی دژوارتردەبێت و زیاتریش بەرەو هیچ دەڕوات. ئەگەر بێلایەنانە لەروانگەی ئۆنتۆلۆجیانەوە تەماشابکرێت، خۆی وەکو (خۆیەکی ڕیالیستانە) ی ژیانی ڕۆژانە دەردەخات.

هەرچەندە، وەکو بەردیش بابەتێک نیە بناسرێت، هێشتا بوونی خۆی دەسەپێنێت. ئێمە ناتوانین " ئەوان" بەهیچ دابنێین، یان تەفسیرێکی لەسەر کۆکردنەوەی چەند خۆیەکی تاک بۆ بکەین. لەسەرئەمەوە، " ئەوان"، خۆیەکی هەمەکی نین، کە کۆی خۆیە تاکەکان بێت. ئەمە لەحاڵەتێکدا دەبێت، کە خەسڵەتەکانی بە دازاینەوە گرێنەدەین، یان جینسێک بێت بۆ بابەتەکان. لێرەدا دەبێت هەموو شتێک لەپەیوەندی نێوان جینس و جۆرەکانیدا ببینرێت.

" ئەوان" جینسی {Genus} دازاین نین. تەنانەت لۆجیکی کۆنیش ناتوانێت تەفسیری ئەم دیاردانەمان بۆ بکات. هەنگاوەکانی لۆجیک لەچاکسازییەکانیدا بەرەو زانستە کۆمەڵایەتیەکان زیاتر توشی تەمومژی ئۆنتۆلۆجیانەمان

دەکەن.

"ئەوان" پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی و دیاردەیەکی لەپێشتری بوونی دازاینە. ئەم پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی و چەندڕێگەیەکی دیاریکراوی بۆ خۆ چەسپاندن دیاریکردووە. بەهۆی ئەم ڕێگەیانەوە دەستەڵاتی داگیرکردنی لەنێو مێژوودا دادەمەزرێنێت. خۆی ژیانی ڕۆژانەی دازاین خۆی "ئەوان" ە، کە لەخۆیەکی ڕەسەنی جیادەکەینەوە_ ئەوخۆیەی شێوەی بوونی خۆی هەیە { *eigens ergriffenen* }. دازاین {لەشێوازی بوونی نارەسەندا} لەنێو "ئەوان" دا ونبوە، بەڵام پێویستە خۆی بدۆزێتەوە. خۆ دانانی دازاین بە "ئەوان" ئەوە دەگەیەنێت، کە دازاین ڕازیبووە بەو تەفسیرەی "ئەوان" بۆجیهان و بوون_ لەنێو_ جیهانیاندا کردووە. دازاین لەپێناوی ئەواندا دەژی و ئەوانیش ئاماژە بۆناوەڕۆکی هەمووشتێک دەکەن. دازاین واز لەو بابەتانە دەهێنێت، کە بەرەورووی دەبنەوە و بەجێیاندەهێڵێت بۆ "ئەوان". لێرەدا "من" ئەو کەسەنیم، کە "هەم" ، هەمووشتێک "ئەوان" ن. لەزاراوەی "ئەوان" دا، لەنێو ئەواندا "من" لەخۆم نزیکدەبمەوە. ئەگەر دازاین { بەپێچەوانەی ئەم شێوازی بوونەوە} جیهان لەڕێگەی خۆیەوە بدۆزێتەوە و ڕەسەنانە بژی، دۆزینەوەی خۆی و جیهان هاوکات ڕێگەی بۆ ڕۆشندەکاتەوە و شتە شاراوەکانی لائاشکرادەکات. لەگەڵ تەفسیرکردنەکەمان بۆ بوون_ لەگەڵ و خۆ_ بوون لەنێو "ئەوان" دا وەڵامی پرسیارەکەمان سەبارەت (کێ) لە ژیانی ڕۆژانەی بوون_ لەگەڵ ئەواندا



مسۆگەر دەبێت. هەروەها بونیادی بنەڕەتی دازاینیش لەژیانی ڕۆژانەو مامناوەندێتی بووندا بۆ دیاریدەکات.

لەم بوونەوە، کە سەربە "ئەوان" ە، ژیانی ڕۆژانەی دازاین تەفسیرێکی نا_ ئۆنتۆلۆجیانە، { یان، پێش ئۆنتۆلۆجیانە} مان بۆ دەکات. هەرچەندە تەفسیری ئۆنتۆلۆجیانەش بوونی دازاین لە نێو جیهاندا ڕووندەکاتەوە، بەڵام لێرەدا ناوەستێت. لەبەرئەوەی لەنێو دیاردەی جیهاندا شتەکانی دیکەش، بابەتەکان هەن، بوونی ئەم بابەتانە لەگەڵ ئێمەدان و بە بابەتی دەرەکی دەناسرێن. لەبەرئەمە لەتەفسیرەکەمان بۆ بوون لەژیانی ڕۆژانەدا ئەوە دەردەخات، کە لایەنێکی دیکەی بوون هەیە باسنەکراوە. ئەم شێوازی بوونەی ژیانی ڕۆژانە لەلایەکەوە خۆی دەردەخات و لەلایەکی دیکەوە خۆی دەشارێتەوە. ئەگەر بوون لەژیانی ڕۆژانەدا و بوون_لەگەڵ_ ئەواندا لەبنەڕەتەوە لەبابەتەکانەوە جیاوازبێت، هێشتا بوونێکی ڕەسەن بە بابەت دانانرێت. بوونی ڕەسەن لەسەر ئەو بابەتە سەربەخۆ و جیایە لەئەوانەوە ڕاناوەستێت، گۆڕانکارییەکی بوونگەرانەیە لە "ئەوان" دا. هاوکات، دوورییەکی ئۆنتۆلۆجی لەنێوان خۆیەکی ڕەسەن و ئەو "من" ە دا هەیە، کە بەردەوام بەنێو ئەزموونەکاندا دەگوزەرێ و وەکو خۆشی دەمێنێتەوە.

# پاشکۆی چوارەم

ئەم پاشکۆیە نوسراوێکی (هانا ئارنت) ە، لە یادی لەدایکبوونی هایدیگەر لەهەشتا ساڵییدا لە کۆڕێکدا خوێندویەتیەوە. ئەم نوسراوە چەند جاریک بڵاوکراوەتەوە. دواجار لەپەڕتووکی (هایدیگەر و فەلسەفەی نوێ) بەزمانی ئینگلیزی لەساڵی١٩٧٨ لەچاپدراوە. من لەزمانی ئینگلیزییەوە بۆ کوردی وەرمگێڕاوە.[٢٢٩]

## مارتن هایدیگەر لە هەشتاساڵیدا

**نوسینی : هانا ئارنت**

ساڵڕۆژی هەشتا ساڵەی مارتن هایدیگەر، هاوکات یادی تێپەڕبوونی پەنجا ساڵەیەتی نەک وەکو نوسەرێک، هەرچەندە پەڕتووکێکی لەسەر دەنس سکۆتس Duns Scotus نوسیبوو، بەڵکو وەکو مامۆستایەکی زانکۆ. تەنانەت سێ چوارساڵیش پاش لەچاپدانی ئەوپەڕتووکە خوێندکاران هایدیگەریان وەکو مامۆستا باشتر لەنوسەری پەڕتووکەکە دەناسی. ئەگەر گوتەکەی ئەفلاتونیش ڕاست بێت، کە دەڵێت (سەرەتا خوایەک بێت و ئەو خوایەش لەنێو خەڵکدا

[229] بڕوانە :

Hannah Arendt. “Martin Heidegger at Eighty”, in *Heidegger and Modern Philosophy*, Michael Murray (ed.), New Haven: Yale University, Press, 1978. Pp. 293- 303



بژی ئەوا هەموو شتێک دەپارێزرێت.) [*Laws* 775]. لەم ڕووەوە، لەکێشەی هایدیگەردا سەرەتا نەڕۆژی لەدایکبوونیەتی و (٢٦ ی سپتەمبەر ١٨٨٩ لەشاری مێسکرش) نەبڵاوکردنەوەی یەکەم پەڕتووکی، بەڵکو دەستپێکردنی پیشەی مامۆستایەتی وسێمنارەکانیەتی وەکو یاریدەدەری هوسرڵ لەزانکۆی فرایبۆرگ لەساڵی ١٩١٩ دا.

ناودارێتی هایدیگەر بۆ هەشت ساڵ پێش نوسینی بوون وکات (١٩٢٧) دەگەڕێتەوە، بێگومان سەرکەوتنی ئەم پەڕتووکە نەک تەنیا وابەستە بە کاریگەرێتی ڕاستەوخۆیەوە. لە دەرەوەو ناوەوەی جیهانی ئەکادیمی، لەبەردەوامبوونی دەستەڵاتی کاریگەرێتیەکەشدایە، کە کەم پەڕتووک لەسەردەمەکەماندا هاوشانی ڕادەوەستن. ناکریت ئەم سەرکەوتنە بەبێ ناودارێتی نوسەرەکەی وەکو مامۆستایەک لەنێو خوێندکارەکانیدا باسبکرێت. بۆخوێندکارەکان سەرکەوتنی پەڕتووکەکە ئەو بۆچوونەیانی سەلماند، کە چەند ساڵێک لەپێشتر لەبارەی مامۆستاکەیانەوە هەیانبوو.

لەسەرەتاوە ناودارێتی هایدیگەر لە ناودارێتی کافکا لەبیستەکاندا و براک و پیکاسۆ سەرسوڕهێنەرترە. ئەوانیش نەناسراوبوون و کاریگەرێتی گەورەشیان بەسەر دەوروبەریانەوە خستبوەگەر. لەکێشەی ناودارێتی هایدیگەردا بێجگە لە ڕەشنوسەکانی بۆ وانەکانی هیچ نوسراوێکی دیکە لەبەردەستانەبوو. وانەکانی مامەڵەیان

لەگەڵ دەقە {فەلسەفیە} ناسراوەکاندا دەکرد و شوین ڕاڕەویێکی دیاریکراو نەدەکەوتن تاکو پەیرەوی بکرێت. هەروەها لەم گۆڤارەشدا لەساڵی ١٩٧١ دابلاوکراوەتەوەو ئەلبێرت هۆفشتادەر لە ئەڵمانیەوە بۆ ئینگلیزی وەرگێڕاوە:

*The New York Review of Books*, October, 1971, translated by Albert Hofstadter. Reprinted by Permission of Harcourt Brace Jovanovich, Inc.

{ هایدیگەر}. تەنیا ناوێک بوو، کە بەهەموو ئەڵمانیادا، وەکو ناوی پاشایەکی نهێنی بڵاوبووەوە.

ئەمەش لەودەستەو گروپانەوە جیاوازبوو، کە پێشەوایەک سەرپەرشتیاندەکات، (بۆنموونە گروپی ستیڤان جۆرج)، کە لەلای خەلکی ناسراون، بەڵام تەنیا ئەندامانی نهێنیەکانیان دەزانن. لێرەدا بەئەندامبوون و نهێنی نە بوو. ئەوانەی هەواڵی{هایدیگەر} یان دەبیست، لەگەڵ یەکدی ئاشنادەبوون و دەبوون بەهاوڕێی یەکدی، چونکە هەموویان خوێندکاربوون. لەدواییدا چەند بازنەیەک لەچەند شوێنێکدا سەریانهەڵدا بەڵام نەبوون بەدەستەو گروپێکی دامەزراو یان خاوەنی نهێنی.

هەواڵەکان چییان دەگەیاند و بەکێ دەگەیشتن؟ لەوکاتەدا، دوای جەنگی جیهانی یەکەم، یاخیبوون لەنێو زانکۆکانی ئەڵمانیادا نەبوو. بێزاربوون لەدەستگا ئەکادیمییەکان، لەو بەشانەی کارکردنی لە پاشەڕۆژی خوێندکاران مسۆگەردەکرد بەئاشکرا دەبینرا. فەلسەفە بابەتێک نەبوو



بۆ نان پەیداکردن بخوێنرێت، بەڵکو بۆ چارەسەرکردنی برسێتی بوو، بۆیە دژوارانە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرا. خوێندکاران بەرەوزانایی نەدەبران. هەرچ خوێندکارێکیش سەرقاڵی کردنەوەی گرێی نهێنیەکان بوایە، ئەوا کۆمەڵێک بۆچوونی لەپێشتر ئامادەکراو لەبەردەستیابوو شوێنی بکەوێت. پێویستی نەدەکرد بۆ هەڵبژاردن و شوێنکەوتنی یەکێک لەم بۆچوونانە فەلسەفەی بخوێندایە. بەڵام خوێندکاران نەیاندەزانی داواکارییان چیە. بەرنامەی فەلسەفی زانکۆکان لەسەر کانتیە نوێکان و هیگڵییە نوێکان و ئەفلاتونیەتی نوێ و هتد... یان بەرنامەیەکی ئەکادیمی کۆن بوو. فەلسەفە بەسەر بوارەکانی ئەپستمۆلۆجی و ئیستاتیک و ڕەوشت و لۆجیکدا دابەشکرابوو. ئەوەندە بەتێگەیشتنەوە مامەڵەی لەگەڵدا نەدەکرا. لەنێو ئۆقیانوسی سیستی و بێزارییدا نوقم ببوو. هەرچەندە لەپێش هایدیگەردا چەند یاخیبوونێک دژی ئەم بارودۆخە سەریانهەڵدابوو، لەمانە هوسرڵ و بانگەوازەکەی "گەڕانەوە بۆ خودی شتەکان"، ئەمەش ئەو واتایەی دەبەخشی " باواز لە بیردۆز و پەڕتووکەکان بهێنین" . فەلسەفە، وەکو زانستێکی چەسپاو لەگەڵ زانستە ئەکادیمییەکانی دیکەدا هاوتەراز دابنێین. بەڵام، هێشتا بانگەوازەکەی هوسرڵ هاوارێکی بەرزی یاخیبووانە نەبوو. بۆ یەکەمجار شیلەر و دواتریش هایدیگەر سودیلێوەرگرت.

بێجگە لەمە، کارڵ یاسپەرزیش لە هایدڵبەرگ هەرچەندە فەلسەفەزان نەبوو، بەڵام یاخیبوویەکی دیکەبوو. وەکو

دەزانین بۆ ماوەیەکی درێژخایەن هاوڕێی هایدیگەربوو. یاسپەرز هەڵوێستی یاخیبووانەی هایدیگەری بە بنەڕەتی و ڕەسەن دەبینی. هاوڕابوونی {ئەم دوو هاوڕێیە} بەو جۆرەی هایدیگەر باسیدەکات لەسەر جیاکردنەوەی (دوو بابەتی خوێندنی ئەکادیمی و بیرکردنەوە).[٢٣٠] بوو ئەمانە { هایدیگەر و یاسپەرز} بایەخیان بەبابەتی خوێندنی ئەکادیمی نەدەدا. ئەوکاتە هەواڵی هایدیگەر بەو کەسانە گەیشت، کەچاوەڕوانی ڕوخاندنی نەریت و سەردەمە تاریکەکانیان دەکرد. شارەزاییان لەکێشە فەلسەفیەکاندا گیریخواردبوو. دەیانویست بایەخ بە (بابەتەکانی بیرکردنەوە) بدەن یان هایدیگەر گوتەنی (ئەو بابەتانەی بیرکردنەوە دەیانگرێتە خۆی) *Zur Sache des Denkens* *1969*. ئەم هەواڵە خوێندکارانی بەرەو فرایبۆرگ و لای ئەو مامۆستایە ڕاکێشاو هایدیگەریش پاش ماوەیەکی کورت لە ماربۆرگ بوو بە پرۆفیسۆر. مامەڵەی لەگەڵ ئەو شتانەدا دەکرد، کە هوسرڵ ئاماژەی بۆکردبوون. ئەو{ هایدیگەر} دەیزانی شتەکان بابەتی ئەکادیمی نین و کەرەسەو بابەتی ئەوانەیە بیردەکەنەوە. هەروەها کێشەیەک نیە لەمڕۆدا

---

230 لیرەدا ووشەی (خوێندنی ئەکادیمی) م بۆ (Scholarship) ی ئینگلیزی داناوە.

مەبەستی هایدیگەر لەم جۆرە خوێندنە لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی باوە لە زانکۆکاندا بەبۆچوونی ئەو مەرج نیە خوێندنی ئەکادیمی ببێتە زاگەی بیرکردنەوەی فەلسەفی.



سەریهەڵدابێت و لەمێژەوە هەبووە. بەڵام پەیوەندی خۆی لەگەڵ نەریتدا پچڕاندوە و لەڕوانگەیەکی نوێوە دەیڕوانیە رابردوو. بۆ ئەو گرنگ بوو باس لە ئەفلاتون بکرێت بەڵام با لەسەر بیردۆزەی ئایدیاکەی نەدوێین، لەسمیستەرێکدا {نیوساڵی خوێندن} دایەلۆگێکی هەنگاو بەهەنگاو شیکرێتەوە و بیردۆزە باوەکە لەناوببرێت و گرفتی نوێ خۆیان بسەپێنن. ئەمڕۆ ئەم شێوازی توێژینەوەیە ئاساییە و زۆرکەس پەیڕوی دەکەن، بەڵام کەس پێش هایدیگەر نەکەوتوە.

هەواڵەکەش لەبارەی هایدیگەرەوە بەکورتی ئەمەبوو: بیرکردنەوە ژیاوەتەوە، ئەو زەخیرە کەلتوورییەی ڕابردوو، کە بەمردوو دادەنرا دەدوێتەوە و باس لەشتی جیاوازتر دەکات. مامۆستایەک پەیدابووە فێری بیرکردنەوەت دەکات. لەم ڕووەوە، پاشای نهێنی دەستەڵاتی خۆی بەسەر جیهانی بیرکردنەوەدا دامەزراند. جیهانێک، کە دڵنیا نیت لەوەی هەیە بەڵام هێشتا ژمارەی ئەوانەی لەوجیهانەدا دەژین زۆرترە لەوەی دەزانرێت. ئەگینا چۆن کاریگەرێتی نایاب و شاراوەی هایدیگەر دەتوانێت ئەوەندە ڕۆڵی خۆی بەسەر بیرو ڕاڤەکردنی دەقە فەلسەفیەکانەوە لەناوەوەو دەرەوەی بازنەی خوێندکاران و تێگەیشتنی گشتی لە فەلسەفە ببینێت؟ ئەمەش نەبەستراوە بەفەلسەفەی هایدیگەرەوە (کەجان بۆیفرت) یش پرسیاری لەبارەوە دەکات، بەڵکو لەبەشداربوونی چڕی بیرکردنەوەی هایدیگەردایە، لەدامەزراندنی شێوازی بیرکردنەوەی سەردەمەکەمان. ئەم

بیرکردنەوەیە خەسڵەتی قوڵبوونەوەی خۆی هەیە. ئەگەر بیخەینە قاڵبێکی زمانەوانیەوە دەتوانین بڵێین لەسەر وشەی(بیرکردنەوە) رادەوەستێت.   هایدیگەر سەبارەت شتێک بیرناکاتەوە و بیر لە شت دەکاتەوە. لەم چالاکییەی بیرکردنەوە یەوە خۆی بەقوڵایی یان ناخی شتەکان دەگەیەنێت بۆ ئەوەی لایەنە شاراوەکان بخاتە بەر تیشک و بیاندۆزێتەوە. لەوێدا بۆ دۆزینەوەی ڕێگاکان و نیشانکردنی *Wegmarke* دەمێنێتەوە.[231] ئەم شێوە بیرکردنەوەیە ئەرکێک بۆخۆی دیاریدەکات، لەوانەیە مامەڵە لەگەڵ چەند

[231] ئەمە ناونیشانی کۆمەڵێک نوسراوی هایدیگەرە، هانا ئارنت ئاماژەیان بۆدەکات. بۆ دۆزیوینەتەوە، یەکیک لەئاکامی بیرکردنەوەکەشی لەوێدایە، کە مێتافیزیکی نەریتە باوەکە هەرچەندە زۆرکەس بەرانبەری نایار بوون، ئەم هەڵیوەشاندەوە. لە ژێر زەمینەکەیەوە بناخەکانی لەق کردو ڕووخاندویەتی. ئەمەش پرۆسەیەکی مێژوییە، تەنانەت بەیەکەمیش دادەنرێت، بەڵام بائەمە نەبێتە کێشە بۆ ئەوانەی لەدەرەوەی ئەم پیشەیە ڕادەوەستن تەنانەت مێژووییەکانیش. ئەگەر مافبدەین بە کات، لەم ڕوووە دیاریکراوەوە بە(ڕوخێنەر) دادەنریت، ئەمەش پەیوەندی بەخودی کانتەوە نیەو دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆڵە مێژووییە پێهەڵسپێراوەکەی. سەبارەت هەوڵدانی هایدیگەر بۆ ڕووخانی مێتافیزیک، کەچاوەڕوانکراو بوو، لەوێدا خۆی دەسەپێنێت، کە ڕووخاندنەکە باشتر لەپێشو ئەنجامدراو کۆتاییەکەی ڕاڤەکرا.



گرفتێکدا بکات، کارێکی ئاساییە، کە بەبابەتێکی دیاریکراوەوە خۆی ماندووبکات، بەڵام ناتوانین بڵێین ئامانجی لەدوایە. ئەم شێوەیە ئەو بیرکردنەوەیەیە، کە بەردەوام لەچالاکییدایە، تەنانەت دیاریکردنی ڕێگاکانیش بۆ کردنەوەی ڕێگای دیکەیە و لەپێناوی گەیشتن بەئامانجێک نیە، کە لەپێشتر نەخشەی بۆ دانرابێت.

دەتوانین بەڕێگاکان بڵێین *Holzwege* ، تولە ڕێیەکانی نێو دارستان. (ئەمەش ناوی کۆمەڵێک نوسراوی هایدیگەرە لەپەرتووکێکدا لە نێوان ساڵەکانی ١٩٣٥- ١٩٤٦ دا نوسراون)، کە لە دەرەوەی دارستانەکەدا ووندەبن و (ناکاو بێهێزی و خاوبوونەوە) پەیدادەکەن. ئەمەش بۆ کەسێک دارستانی خۆش بوێت باشترە لە توێژینەوەی مێژوو نوسانی بیرو پسپۆڕەکانی فەلسەفە. میتافۆری " تولە ڕێیەکان" بنەڕەتییە نەک لەبەرئەوەی کەسێکی ونبوو دەخاتە سەر ڕێگە، کە لەوانەیە لە سەرەتاوە بەم شێوەیە لێی تێبگەین، بەڵکو ، وەکو ئەوە وایە کەسێکی داربڕ، کەژیانی لەنێو دارستانە، تولە ڕێیەکان دەدۆزێتەوە و بەردەمیان دەکاتەوە.

لەقوڵایی ئەم ڕووبەرە هەڵکەنراو و پاکراوەیەدا، هایدیگەر بە بیرکردنەوە کۆمەڵێک تولەڕێی

{ئەمە بۆ هایدیگەر} "کۆتایی فەلسەفە" یەو لەنوسراوەکەیدا بەناوی *Zur Sache des Denkens* باسیدەکات. کۆتاییەک

لەسەرشانی فەلسەفە و کەسێکیش لەهەمووان زیاتر خولیای فەلسەفە و نەریتی فەلسەفییە. بۆماوەیەکی دریژ خایەن وانەو سێمینارەکانی لەسەر دەقی نوسینی فەیلەسوفەکان بوو. تەنیا لە تەمەنی پیریدا توانی باسی نوسینەکانی خۆی بکات و دەقەکان شیبکاتەوە. نوسراوەکەی *Zur Sache des Denkens* هەوڵدانێکی سەرەتایی بوو بۆ سیمینار لەسەر بەشی یەکەمی پەڕتووکی بوون و کات.

خەڵکی شوێن هایدیگەر دەکەوتن تاکو فێری بیرکردنەوە بن. ئەوەی لەم ئەزموونەدا پێدەگەیشتن چالاکییەکی ڕووتی بیرکردنەوە بوو، کە نەبەسترابوو بەگەران بە دوای زانیندا. سۆزو عاتیفە بوو بۆ بیرکردنەوە بەبێ ئەوەی خۆی بەیاساو نەریتەکانەوە ببەستێتەوە.

ئێمە فێربووین هۆش و سۆز، گیان و ژیان لەیەکدی جیابکەینەوە و بەدژوەستاو تەماشایانبکەین، بۆیە، گوێمان لە سۆزی بیرکردنەوە دەبێت ڕادەچڵەکێین و پاشگەز دەبینەوە. جارێکییان هایدیگەر ئەم یەکێتیەی {لەنێوان سۆزو بیرکردنەوەدا} لەیەکێک لەوانەکانی لەسەر ژیانی ئەریستۆ بەم شێوەیە دەربڕی، (ئەریستۆ لەدایکبوو، نوسی و مرد).

ئەوسۆزی بیرکردنەوەیەی هایدیگەر باسیدەکات و لەدواییدا باوەڕپێپێدەهێنن، بارودۆخێکی پێویستە بۆ هەموو جۆرە فەلسەفەیەک. بەڵام ئەو پرسیارەی خۆی دەسەپێنێت



ئەوەیە، ئایا بەبێ بیرکردنەوەی هایدیگەر دەمانتوانی بیدۆزینەوە؟ سۆزی بیرکردنەوە، کە بوون لەنێو جیهان و ئێستادا واتای شتەکان بەرجەستەدەکات، دوا ئامانجی زانینی، بێجگە لەناسینی خۆی بۆ دیارینەکراوە. کۆتایی ژیان مردنە، بەڵام مرۆڤ ناژی بۆ ئەوەی بمرێت. مرۆڤ بوونێکە بیردەکاتەوە، بیرکردنەوەی لەپێناوی گەیشتن بە کۆتایی نیە، ئەوبیردەکاتەوە چونکە بوونەوەرێکی سەرسوڕهێنەرە. لەئاکامی ئەم بۆچوونەدا بیرکردنەوە ڕوخێنەرانە و ڕەخنەگرانە بەرەوکۆتایی دەڕوا. دڵنیام لەوەی فەیلەسوفەکان و فێرگە فەلسەفیە دێرینەکان بەناڕەزاییەوە ویستویانە سیستەمەکانیان دامەزرێنن. ئێمەش زۆرجار لەهەڵوەشاندنیاندا توشی کێشەو گرفت بووین. ئەم ویستە لەناخی بیرکردنەوەوە هەڵناقوڵێت و لەپێویستیەکی دیکەوە مافی دامەزراندن بەخۆی دەدات. ئەگەر بیرکردنەوە لەفۆرمە ڕاستە خۆییەکەی و سۆز داراییەکەی بە ئاکامەکانی بپێورێت ئەوا وەکو دەمامەکەی (پینەلۆپی) لێدێت، ئەوەی بەڕۆژ ڕوویدەدا و دەسوڕایەوە بەشەو هەڵدەوەشایەوە و ڕۆژی داهاتوو جارێکی دیکە سەرلەنوێ دەستپێدەکردەوە. هەموو نوسراوێکی هایدیگەر لەوەدەچێت لەسەرەتایەکی نوێوە دەستیپێکردبێت و ئەو زمانەشی بەکاریهێناوە زاراوەکانی تولە ڕێیەکانن، کە بیرکردنەوەی نوێ خۆیانی لەسەر دەدۆزنەوە.

من بزانم ئەفلاتون یەکەم کەسە بیرکردنەوەی بە ئازار *Pathos* لەنێو خۆڕاگرتندا دانابێت و لە دایەلۆگی (تیاتیتوس

155 d) دا سەرسوڕمانی بەسەرەتای بیرکردنەوەی فەلسەفی دەستنیشانکردووە. ئەم سەرسوڕمانە ئەوەنیە لەگەڵ بینینی شتێکی سەیردا سەرهەڵبدات. چونکە سەرەتا و جێگەزای زانستەکانە. هایدیگەریش لەسەرسوڕمان دەدوێت، بەڵام بۆچوونەکەی لەوەی ئەفلاتونەوە جیاوازە و دەڵێت، (سەرسوڕمان دەبێت بە نیشتمان) ( ,Vorträge und Aufsätze, 1954 Part III, p. 259) ئەم گوتەیە بۆ ناسینی هایدیگەر گرنگە. زۆرکەس بیردەکەنەوە بەڵام لەنێو بیرکردنەوەدا جێنشین نەبوون. کاتێک سەریاندەسوڕمێ و بیردەکەنەوە دەزانن بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ کێشە مرۆڤایەتیەکاندا لەهەموو شتێک دابڕاون، دەتوانن شتەکان بەجێبهێڵن و جارێکی دیش بۆیان بگەڕێنەوە. ئەو نیشتمانەی هایدیگەر {لەم گوتەیەدا} ئاماژەی بۆ دەکات مێتافۆرە و لەژوور هەموو نیشتمانێکەوەیە. هەروەها مێتافۆری (با) ش، (زینەفۆن دەیگێڕێتەوە) سوکرات بەکاریهێناوە، هێشتا مێتافۆری (زریانی سەردەم)، کە ناوزەدیدەکات بەهێزترە{ لەمێتافۆری (بای) سوکرات}.[٢٣٢]

ئەگەر بەراوردێکی نێوان نیشتمانی بیرکردنەوە و ئەوانی دیکە بکەین، دەبینین یەکەمیان{نیشتمانی بیرکردنەوە}

---

[232] ئەم جۆرە کەوانەیە لەم پەرتووکەدا دانراوە تاکو خوێنەر بزانێت وشەو دەقی نێوی نوسەری ئەم پەڕتووکە دایناون و لەنێو دقەڕەسەنەکەدا نیە. ئەمەش بۆ ئەوەیە خوێنەر باشتر لەواتای دەقە وەرگێڕاوەکان تێبگات.



(جێگای ڕاوەستانە.) Zun Sache des Denkens, p. 75 سەرسوڕمان ڕاوەستان پێکدەهێنێت و ئەو شتە لەدەنگەکان، تەنانەت دەنگی ناوەوەش دەپارێزێت. بەدیدی هایدیگەر، لەم ڕاوەستانەدا گۆڕانکارییەکان لەنێو ڕەهەندەکانی بیرکردنەوە ڕوودەدەن. لەتەنیایی و خەڵوەتدا، بیرکردنەوە مامەڵە لەگەڵ شتە شاراوەکاندا دەکات ڕووداو و فاکتۆرە نەناسراوەکان دەدۆزێتەوە. کاتێک بەرانبەر کەسێک ڕادەوەستیت، تۆ کەسەکە دەبینیت، بەڵام مەرج نیە بیریلێبکەیتەوە. ئەگەر بیرت لەوکەسەکردەوە، ئەوا خۆت لەبینینە ڕاستەوخۆیەکەت دوور دەخەیتەوە. بۆئەوەی بیر لەبابەتێک یان کەسێک بکەیتەوە پێویستە لە دوورەوە بیناسیت. لەم ڕووەوە هایدیگەر دەڵێت. (بیرکردنەوە نزیکبوونەوەیە لە بابەتەکە، بەڵام لەدوورەوە. ,Gelassenheit p. 45 بۆ تێگەیشتنمان لەم کێشەیە نموونەیەک دەهێنمەوە. بۆ بینینی شتەدوورەکان سەفەردەکەین، هەندێکجار ئەوشتانەی دەیانبینین و لێیان نزیکدەبینەوە و بەجێیان دێڵین، بیریان لێبکەینەوە و بیانهێنینەوە نێو یادمان. لەم حاڵەتەدا واتاکانیان، بەبێ ئەوەی شتەکان لەبەردەمماندابن، بۆئێمە ئاشکرا دەبن. ئەم کێشە چەواشەیەی بیرکردنەوە، کە بیرکردنەوە بۆ ناسینی بابەتەکەی لەنزنیکەوە دەبێت خۆی دووربخاتەوە گرنگە بۆ وەڵامی ئەو پرسیارەی ئێمە لەبیرکردنەوەدا لەکوێ ڕادەوەستین. بیرهاتنەوە، کەلەبیرکردنەوەدا دەبێت بەبیرەوەری و دەستەڵات ڕۆڵێکی گرنگی لەمێژووی بیرکردنەوەدا بینیوە، چونکە، هەر وەکو چۆن لە

هەستکردنیشدا ڕوودەدات، گەرەنتیشتمان سەبارەت بەو نزیکی و دوورییە دەدات.

هایدیگەر کەمجار لەمە دواوە، ئەوجارانەش دەربڕینەکەی لەبارەی (نیشتمان) و هەستکردن بەو نیشتمانە نەرێیە. بۆ نموونە ئەو دەڵێت،(پرسیارکردنی بیرکردنەوە بەژیانی ڕۆژانەوە نەبەستراوەتەوە.... داواکارییەکانی پەلەمان لێناکەن. پرسیارکردنەکە لەناوچووە.) *An Introduction to Metaphysics*, 1961, pp.10-11. بەڵام پەیوەندی نێوان نزیکی و دووری و چەواشەکردنی لەنێو هەموو بەرهەمەکانی هایدیگەردا دەدۆزێتەوە و بووە بەکلیل بۆ تێگەیشتنیان. لەهەموو شوێنێکدا ئامادەبوون و ونبوون، نزیکی و دووری،دیار و نادیار، بەستنەوە و دابڕان، سەرهەڵدەدەن. هەتاکو ونبوون و دووری و نادیاری و دابڕان نەبێت هەست بە ئامادەبوون و نزیکی و دیاری بوون و بەستنەوەش ناکرێت.

ئەگەر لەکێشەی (نیشتمانی بیرکردنەوەوە) تێبڕوانین، (وازهێنان لە بوون) جیهانی داگیرکردوەو گەمارۆی شوێنی بیرکەرەوەشی داوە( شتە باوەکانی.... ژیانی ڕۆژانە،) بۆنموونە ونبوونی ئەو بابەتەی بیرکردنەوە بایەخی پێدەدات، دەستە باڵابووە. لەناوچوونی (وازهێنانەکە) لەلایەکی دیکەوە، قوربانی داوە بە نزیکبوونەوە لەجیهانی کێشەمرۆڤایەتیەکان. لەبەرئەمە، ئەریستۆ، لەسەر نموونەکەی ئەفلاتون، داوا لەفەیلەسوفەکان دەکات خەو بە



(فەیلەسوفی پاشاوە) کە فەرمانڕەوایی جیهان و کۆمەڵ دەکات نەبینن.

(دەستەڵاتی سەرسوڕمان)، بەلای کەمەوە هەندێک جار، لای هەمووتاکێک هەیە. بیریارەکانی ئێستاو ڕابردووش دەبیت بەوەجیابکرێنەوە، کەدەستەڵاتەکە پێشکەوتووەو بۆ بەکارهاتووە. ئەودەستەڵاتەی (سەرسوڕمان بەنیشتمانی هەمیشەیی خۆی دادەنێت) شتێکی جیاوازە. ئەمە شتێکی نائاساییە ئەفلاتونیش بەڕادەیەک و چەند جارێک لە تیاتیتۆسدا (١٧٦-d ١٧٣) باسی کردووە. لەوێدا ڕووداوەکەی تالیس و تراسیان(کچە جوتیارەکە) دەگێڕێتەوە، کە دەبینێت ئەم فەیلەسوفە لەبەرئەوەی تەماشای ئاسمانی کردووە، بەرپێی خۆی نەبینیوە و کەوتۆتە ناو بیرەکەوە. ئەم کچە، کە تالیس دەیبینێت {دەکەوێتە ناوبیرەکەوە} پێدەکەنێت بەوەی کەسێک دەیەوێت ئاسمان بناسێت و نازانێت چی لەبەرپێیدایە. ئەگەر ڕاپۆرتەکەی ئەریستۆ دروست بێت، تالیس دڵگرانبووە لەوەی خەڵکی گاڵتەیان بەژیانی سادەو هەژارییەکەی کردووە. بەڵام لەبەرئەوەی زانیویەتی لەساڵی داهاتوودا ڕۆنی زەیتون گران دەبێت توانیویەتی دەوڵەمەندبێت.[٢٣٣] لەبەرئەوەی کچەجوتیارێک پەرتووک

[233] ئەریستۆ ئەم ڕووداوە لەسەر تالیس لە پەرتووکی( *Politics* 125 9a) دا دەگێڕیتەوە. لەبەرئەوەی تالیس زانیویەتی ساڵی داهاتوو باران کەم دەبارێت و بەرهەمی زەیتون کەم دەبێتەوە و ڕۆن گراندەبێت، پارەقەرزدەکات و ڕۆنێکی زۆر بەهەرزان دەکرێت و بۆ

نانوسێت پێکەنینەکەی تراسیان هیگلیشی جوڵاندوەو لەوەڵامدا دەڵێت، کە {تراسیان} ئارەزووی ناسینی شتە بەرزەکانی نیە.

ئەفلاتون، لەکۆمارەکەیدا، نەک هۆنراوە پێکەنینیشی قەدەغە کردووە، بەتایبەتی لەنێو دەستەو چینی فەرمانبەرەکاندا. ئەو لە پێکەنینی هاووڵاتیان زیاتر دەترسا لەوەی رەخنە لەبۆچوونی فەیلەسوف بگیرێت و خەڵکی دژی ڕاوەستن. ئەو دەیزانی نیشتمانی بیریارێک، کە لەدەرەوە تەماشایدەکرێت لەو خاکە دەچێت ئەریستۆفان لەسەر هەوری(کوکو) ڕایگرتوە. ئەوئاگای لەباری ئاستەنگی فەیلەسوف بوو، ئەگەر بیرۆکەکانی بخاتە بازاڕەوە لەوانەیە خەڵکی گاڵتەی پێبکەن. ئەمەش هانیدەدات لەتەمەنێکی گەورەدا سێ جار ڕووبکاتە سیسلی و پاش ازۆردارەکەی سایرەکۆز فێری ماتماتیک بۆ تێگەیشتنی لەفەلسەفە بکات و بیخاتە سەر ئەو ڕێگە ڕاستەی هونەری فەرمانڕەوایی وەکو پاشایەکی فەیلەسوف حوکم بکات.

هایدیگەر لەوێدا ئاماژە بۆ ئەم خەسڵەتەی بیرکردنەوە

---

ساڵی داهاتوو بەگران دەیفرۆشێ و دەوڵەمەنددەبێت. مەبەستی تالیس لەمە ئەوە بووە کە فەیلەسوف دەتوانێت دەوڵەمەندبێت، بەڵام مەبەستی ژیان بۆ ئەو دەوڵەمەندێتی نیە و بەدوای ڕاستیدا دەگەڕێت.



دەکات، کە بەبۆچوونی ئەو پرسیارە گرنگەکە لەبیردا بەبەردەوامی و پێویستیەوە لەنێو بیرکردنەوەدایە، کە لەسەر نیتشە دەدوێت، (لاساری بیرکردنەوە بۆ هەمیشە بەردەوام و نوێیە.) ؟ دەڵێت بیرکردنەوە (خەسڵەتی خەراپبوونی هەیە). کاتێک پەرتووکەکەی خۆی (بوون و کات) هەڵدەسەنگێنێت، یان لەوە دەدوێت، کە

ڕاڤەکردنەکەی بۆ واتای ڕاستی لای ئەفلاتون تەمومژاوییە یان باسی بۆچوونی بیریارەکان لەسەر نوسینەکانی خۆی دەکات و دەیەوێت بیرکردنەوەیەکی نوێتر بخاتەگەر.

هەموو بیریارێک، ئەگەر پیربوو، پێویستە ئاڵۆزییەکان لەناوبەرێت، کە لەئاکامی بیرۆکەکانیاپێکهاتوون. ئەمەش بە بیرکردنەوەیەکی نوێتر لەو ئاڵۆزیانە ڕوودەدات. (لەگەڵ یاسپەرزدا دەڵێت، " ئێستا" نیازی دەستپێکردنت هەیەو دەبێت بمریت.) ئەو (من) ەی بیردەکاتەوە پیرنابێت. بیریار لەنێو بیرکردنەوەدا گەورەدەبێت بەڵام پیرنابێت. سۆزی بیرکردنەوەش، وەکو سۆزەکانی دیکە، مرۆڤ داگیردەکات. هەموو خسڵەتەکان ، کە بە(کارەکتەر) ناوزەددەکرێن، کۆدەکاتەوە دەبن بەبەشێک لەوسۆزەو ئەوخەسڵەتانەش لەناودەبات، کە لەوسۆزەوە دوورن. ئەو (من) ەی بیردەکاتەوە و هایدیگەر گوتەنی لەناوەڕستی زریانێکی توڕەدا ڕاوەستاوە، بەتەنیا بۆ هەمیشە لاو نیە، هەروەها بەردەوام دەبێت بەشتێکی دیکە. (من) ی بیرکەرەوە هەمووشتێکە، بەڵام ئەوخۆیە ئاگامەندە نیە.

لەسەرو ئەمەوە، بەوجۆرەی هیگڵ لەنامەکەیدا بۆ زیلْمان لەساڵی ١٨٠٧ دا سەبارەت فەلسەفە نوسی، بیرکردنەوە(تەنیایی) یە. ئەمەش ئەو واتایەی ئەفلاتون ناگرێتەوە، کە مرۆڤ تەنیا بێت و(لەگەڵ خۆیدا لەدایەلۆگێکی بێدەنگدابێت.) (*Sophist* 263 e)، چونکە لە تەنیاییدائەوشتە هێشتا نەگوتراوانە دەردەکەون، کە ناخرێنە نێو قاڵبی زمان و گوتنەوە و دژواریشە بتوانرێت بەکەسانی دیکەی بگەیەنین. ئەفلاتون لە نامەی حەوتەمیدا باسی ئەم شتە نەگوتراوە دەکات، کە خەسڵەتێکی تەنیایی بەبیرکردنەوە دەدات لەسەر زەمینێکی بەپیتیش بۆ نوێکردنەوە ڕایدەگرێت. کاتێک بیرلەم حاڵەتە دەکەینەوە، دەبینین ئەمە بەسەر هایدیگەردا ساخنابێتەوە، چونکە لەوانەیە تەنیاییەکە لە ئاکامدا ئارەزوومەندەکە بڕوخێنێت.

ئەو نەیدەزانی، ئەگەر لەڕوانگەی کچەجوتیارەکەوە بڕوانێتە ئەم کارە، لە ڕووداوەکەی تالیس زیاتر شیاوی گاڵتەپێکردنە. بەڕادەیەکیش، ئەو{ئەفلاتون} حەقی بوو گوێنەداتە ئەمە، وەکو بزانم خوێندکاری فەلسەفە پێناکەنێت، هیچ نوسەرێکیش پێکەنین بەشتێکی باش لەئاستی ڕووخانی بیریارەکاندا دانانێت و کەمیش لەوان هەوڵیانداوە وەڵامی ئەو پرسیارە بدەنەوە، کە هۆی پێکەنین و گاڵتە پێکردن چی بێت.



ئێستا دەزانین، هایدیگەریش، جارێکیان، ویستی نیشتمانەکەی بگۆڕێ و خۆی بەکێشە مرۆڤایەتیەکانەوە ماندووبکات. بۆ هەموو جیهان، کارەکەی هایدیگەر لەوەی ئەفلاتون خراپتر دەرچوو، چونکە پاشا زۆردارەکەو لێقەوماوەکانی ژێر دەستەڵاتەکەی لەوپەڕی دەریاوە نەدەژیان و کەسانی وڵاتەکەی خۆی بوون. بۆهایدیگەریش، لەو باوەڕەدام، کێشەکە جیاوازە. ئەوهێشتا لاو بوو تاکو لەئازاری ڕووداوەکە تێبگات، کەپاش دەمانگی کورت و ماندووبوون سی وحەوت ساڵ لەمەوبەر گەڕایەوە بۆ نیشتمانەکەی خۆی تاکو ئەزموونەکەی هەڵسەنگێنێت.

ئەوەی {هایدیگەر} دوای ئەم ئەزموونە بۆیدەرکەوت (ویست) بوو، وەکو (ویستی ویست خواز) و (ویستی هێز). لەسەردەمی نوێدا زۆر لە بارەی ویستەوە نوسراوە، بەڵام پاش کانت و نیتشە، کەسێکی دیکە لەبارەی سروشتی ویستەوە هیچی نوێیان باسنەکردووە. کەس لەپێش هایدیگەردا ئاماژەی بۆ ئەو خاڵە نەکردووە، کە چۆن ویست دژی بیرکردنەوە ڕادەوەستێت و دەیڕوخێنێت. بیرکردنەوە خاوەنی ئارامی و لەسەرخۆیی و بەردانە، یان بەکورتی خۆئامادەکردنە بۆپەیداکردنەکان. لەبەرڕۆشنایی ویستدا بیریاران دەبێت ئەو پارادۆکسە بڵێنەوە، (ویستی نا- ویستی دەکەم)، چونکە بە وازهێنان لەویست خۆمان بۆ بیرکردنەوە تەرخاندەکەین، کە ویست نیە. ئێمە، ئەوکەسانەین ڕێز لەبیریاراندەگرین، هەرچەندە خۆمان لەناوەڕاستی جیهانیشدا ڕاوەستاوین و ناتوانین یاریدەی ئەوپەستی و بێزارییەی ئەفلاتون و

هایدیگەر بدەین لەسەرئەوەی مامەڵەیان لەگەڵ کێشە مرۆڤایەتیەکاندا کردووە و روویان کردۆتە زۆردارو سەرۆکەکان. ئەمەش پێویستە بەو بارودۆخەوە ببەسترێتەوە، کە تیایا ژیاون یان وەکو فەرەنسیەکان دەڵێن *déformation Professionelle*. دەشێت نزیکبوونەوە لەزۆردارەکان لەلای زۆر بیریاری گەورە بنەمایەکی بیرەکی هەبێت (با کانت نەخەینە ڕیزیانەوە). ئەگەر ئەم بنەمایە نەدۆزرایەوە، ئەوا هۆکەی بۆئەوە دەگەڕێتەوە، کە هەندێکیان سەرسوڕمانێکی سادەیان هەبوە و کردوویانە بەنیشتمانی خۆیان. بۆئەم چەند بیریارە گرنگ نیە زریانی سەردەمەکەیان بەرەوکوێی بردوون. ئەو بایەی لە بیرکردنەوەی هایدیگەرەوە هەڵیکردووە- وەکو ئەوەوایە پاش هەزار ساڵ تێپەڕبوون بەسەر نوسینەکانی ئەفلاتوندا- ڕێگاکانمان دەماڵێت، لەوسەردەمەوە نەهاتووە، کەخۆی تیایدا دەژی. {ئەو بایە} لەسەردەمە دێرینەکانەوە هەڵیکردووەو ئەوەی بۆ ئێمە جێدەهێڵێت شتێکی پڕو تەواوکۆیە، ڕیلکە Rilke گوتەنی، وەکو شتێکی پڕو تەواو بۆ سەرچاوەکەی خۆی دەگەڕێتەوە.



## سەرچاوە کوردییەکان


- نالی، دیوانی نالی، لێکدانەوەی مەلا عەبدول کەریمی مودەریس، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٦.
- مارتن هایدیگەر، گفتوگۆیەک لەگەڵ هایدیگەردا، وەرگێڕانی لەئینگلیزییەوە د. محەمەد کەمال، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٥.
- د. محەمەد کەمال، بوون وداهێنان، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٤.
- د. محەمەد کەمال ، فەلسەفەی سارتەر و خوێندنەوەیەکی نوێ، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٣.
- د. محەمەد کەمال ، نیتشە و پاش تازەگەری، دەزگای چاپ و پەخسی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٦.

# سەرچاوە ئینگلیزییەکان


Aristotle. "Metaphysics", in *Complete Works of Aristotle*, Vol.2, (ed.) Jonathan Barnes, Princeton University Press, 1995.

Aristotle. "Categories", in *Complete Works of Aristotle*, Vol.1, (ed.) Jonathan Barnes, Princeton University Press, 1995.

Aristotle. "On Interpretation", in *Complete Works of Aristotle*, Vol.1, (ed.) Jonathan Barnes, Princeton University Press, 1995.

Aristotle. "Prior Analytics", in *Complete Works of Aristotle*, Vol.1, (ed.) Jonathan Barnes, Princeton University Press, 1995.

Barnes, Jonathan. *Aristotle*, Oxford: Oxford University Press, 1986.

Bigwood, Carol. *Earth Muse: feminism nature and Art*, Philadelphia: Temple University Press, 1993.

Cahoon, Lawrence (ed.). *From Modernism to Postmodernism*, London: Blackwell, 1996.

Canovan, Margaret. *Hannah Arndt: A Reinterpretation of Her Political Philosophy*, Cambridge: Cambridge University Press, 1992.

Cate, Curtis. *Friedrich Nietzsche: A Biography*, London: Pimlico, 2003.

Chanter, Tina. Time, *Death, and feminine: Levinas with Heidegger*, Stanford: Stanford University Press, 2001.

Clarke, Simon. *The Foundations of Structuralism: A Critique of Levi Strauss and the Structuralist Movement*, the Harvester Press, 1981.

Cohen-Solal, Annie. *Sartre a Life*, London: Minerva, 1991.

Culller, Jonathan. *On Deconstruction: Theory and Criticism after Structuralism,* London: Routledge & Kegan Paul,





1983.

Curley, E. M. *Spinoza's metaphysics: An essay in Interpretation*, Cambridge: Harvard University Press, 1969.

De Beauvoir, Simone. *The Second Sex*, translated by H.M. Parshley, London: Jonathan Cape, 1956.

De Beauvoir, Simone. *The Prime of Life*, translated by Peter Green, New York: Penguin Books, 1965.

Derrida, Jacques. "The End of the Book and the Beginning of Writing", in *Modernism to Postmodernism: An Anthology*, London: Blackwell, 1996.

Derrida, Jacques. *Of Gramatology*, translated by Gayatri Chakravorty Spivak, Baltimore: the John Hopkins University Press, 1997.

Derrida, Jacques. *Margins of Philosophy*, translated by Alan Bass, Chicago: The University of Chicago Press, 1972.

Derrida, Jacques. "The Time is Out of Joint", in *Deconstruction is/in America*, Anselm Haverkamp (ed.), New York: New York University Press, 1995.

Descartes, René. "Meditations on First Philosophy", in *The Philosophical Writings of Descartes*, Vol.2, Cambridge: Cambridge University Press, 1999.

Diethe, Carol. *Nietzsche's Sister and the Will to Power*, Chicago: University of Illinois Press, 2003.

Dorter, Kenneth. *Form and Good in Plato's Eleatic Dialogues*, University of California Press, 1994.

Dreyfus, Hubert. *Being-in-the-World: A Commentary on Heidegger's Being and Time, Division 1*, The MIT Press, 1991.

Dreyfus, Hubert. and Hall Harrison, *Heidegger: A Critical Reader*, London: Blackwell, 1995.

Ettinger, Elzbieta. *Hannah Arndet and Martin Heidegger*, New Haven: Yale University Press, 1995.

Fried, Gregory. *Heidegger's Polemos*, New Haven: Yale University Press, 2000.

Gadamer, Hans-George. *Truth and Method*, translated by William Glen-Doepel, London: Sheed and Ward, 1979.

Gashche, Rodolphe. "Tuned to Accord: On Heidegger's Concept of Truth", in *Heidegger toward the Turn*, (ed.) James Risser, New York: State University of New York Press, 1999.

Harvey, David. *The Condition of Postmodernity*, London: Blackwell, 1990.

Hayman, Ronald. *Sartre: A Biography*, New York: Simon and Schuster, 1987.

Hegel, G. F. W. *Encyclopedia of Philosophical Sciences*, translated by William Wallace, London: Oxford University Press, 1985.

Hegel, G. F. W. *The Phenomenology of Mind*, translated by J. B. Baillie, New York: Harper Torchbook, 1967.

Heidegger, Martin. "Letter on Humanism", in *Basic Writings*, David Farrell Krell (ed.), London: Routledge, 1996.

Heidegger, Martin. "The Origin of the Work of Art", in *Basic Writings*, David Farrell Krell (ed.), London: Routledge, 1996.

Heidegger, Martin. "On the Essence of Truth", in *Basic Writings*, David Farrell Krell (ed.), London: Routledge, 1996.

Heidegger, Martin. "On the Essence of Truth", in *Basic Writings*, David Farrell Krell (ed.), London: Routledge, 1996.

Heidegger, Martin. "The Question Concerning Technology", in *Basic Writings*, David Farrell Krell (ed.), London: Routledge, 1996.

Heidegger, Martin. "What is metaphysics?", in *Basic Writings*, David Farrell Krell (ed.), London: Routledge, 1996.

Heidegger, Martin. *Being and Time*, translated by John Macquarrie & Edward Robinson, London: Blakwell, 1997.

Heidegger, Martin. *Being and Time*, translated by Joan



Stambaugh, Albany: State University of New York Press, 1996.

Heidegger, Martin. *Parmenides*, translated by Andre Schuwer and Richard Rojcewicz, Bloomington: Indiana University Press, 1998.

Heidegger, Martin. "The Onto-Theo-Logical Constitution of Metaphysics", in *Identity and Difference*, translated with an introduction by Joan Stambaugh, Chicago: Chicago University Press, 2002.

Heidegger, Martin. *Contributions to Philosophy (From Enowning),* translated by Parviz Emad and Kenneth Maly, Bloomington: Indiana University Press, 1999.

Heidegger, Martin. *Introduction to Metaphysics*, translated by Ralph Mannheim, Yale University Press, 1959.

Heidegger, Martin. *Phenomenological Interpretation of Aristotle*, translated by Richard Rojcewicz, Bloomington: Indiana University Press, 2001.

Heidegger, Martin. *Ontology-The Hermeneutics of Facticity*, translated by John van Buren, Bloomington: Indiana University Press, 1999.

Heidegger, Martin. *Nietzsche*, four volumes, (ed.) David Farrell Krell, New York: Harper Collins, 1982.

Heidegger, Martin. *Zollikon Seminars*, translated by Fanz Mayr and Richard Askay, Illinois: Northwestern University Press, 2001.

Heidegger, Martin. *History of the Concept of Time*, translated by Theodor Kisiel, Bloomington: Indiana University Press, 1985.

Heidegger, Martin. "…Poetically, Man Dwells…", in *Martin Heidegger's Philosophical and Political Writings*, (ed.) Manfred Stassen, New York: Continuum, 2003.

Heidegger, Martin. *Four Seminars*, translated by Andrew Mitchell and Francois Raffoul, Bloomington: Indiana University Press, 2003.

Heidegger, Martin. *What is called thinking?* translated by J.

Kisiel, Theodore. *The Genesis of Heidegger's Being and Time*, Los Angeles: University of California Press, 1995.

Kisiel, Theodore. *Heidegger's Way of Thought*, London: Continuum, 2002.

Kockelmans, Joseph J. *On the Truth of Being: Reflections on Heidegger's Later Philosophy*, Bloomington: Indiana University Press, 1984.

Ludz, Ursula (ed.). *Letters 1925-1975: Hannah Ardent and Martin Heidegger*, New York: Harcourt Inc., 2004.

Lowith, Karl. *Martin Heidegger and European Nihilism*, translated by Gary Steriner, New York: Columbia University Press, 1995.

Marcuse, Herbert. "Contributions to a Phenomenology of Historical Materialism", in *Telos*, No.4, (Fall 1969).

Marcuse, Herbert. *One Dimensional Man*, London: Routledge & Kegan Paul, 1964.

Meszaros, Istvan. *The Work of Sartre: Search for Freedom*, Vol.1, London: The Harvester Press, 1979.

Moran, Dermot. *Introduction to Phenomenology*, London: Routledge, 2000.

Mulhall, Stephen. *Heidegger and Being and Time*, London: Routledge, 1997.

Mure, G. R. G. *Aristotle*, Westport, Conn: Greenwood Press, 1975.

Nietzsche, Friedrich. *Thus Spake Zarathustra*, translated by Thomas Common, London: Wordworth Classics, 1997.

Nietzsche, Friedrich. *The Will to Power*, translated by Walter Kaufmann, New York: Vintage Books, 1968.

Okrent, Mark. *Heidegger's Pragmatism. Understanding, Being, and the Critique of Metaphysics*. Cornell University Press, 1988.

Ollman, Bertell. *Alienation: Marx's Conception of Man in Capitalist Society*, Cambridge University Press, 1971.

Partenie Catalin and Rockmore Tom. *Heidegger and Plato: Toward Dialogue*, Illinois: Northwestern University



Glenn, New York: Harper & Row Publisher, 1968.

Heidegger, Martin. "Nietzsche's Word: God is Dead", in *Off the Beaten Track*, translated by Julian Young and Kenneth Haynes, Cambridge: Cambridge University Press, 2002.

Heidegger, Martin. *The Essence of Truth: On Plato's Cave Allegory and Theaetetus*, translated Ted Sadler, London: Continuum, 2002.

Heidegger, Martin. *The Essence of Human Freedom*, translated by Ted Sadler, London: Continuum, 2002.

Heidegger, Martin. *Introduction to Phenomenological Research*, translated by Daniel O. Dahlstrom, Bloomington: Indiana University Press, 2005.

Heidegger, Martin. *Mindfulness*, translated by Parviz Emad and Thomas Kalary, London: Continuum, 2006.

Hume, David. *A Treatise of Human Nature*, second edition, Oxford: At the Clarendon Press, 1985.

Huntington, Patricia. *Ecstatic Subjects, Utopia, and Recognition: Kristeva, Heidegger, Irigaray*, Albany: State University of New York Press, 1998.

Husserl, Edmund. *Ideas: General Introduction to Pure Phenomenology,* translated by W. R. Boyce Gibson, London: George Allen and Unwin, 1931.

Husserl, Edmund. *The Shorter Logical Investigations*, translated by J.N. Findlay, London: Routledge, 2001.

Kamal, Muhammad. *Mulla Sadra's Transcendent Philosophy*, London: Ashgate Publisher, 2006.

Kant, Immanuel. *Critique of Pure Reason*, translated by F, Max Muller, New York: The Anchor Books, 1966.

Kaufman, Walter. *Existentialism from Dostoevsky to Sartre*, New York: New American Library, 1975.

Kaufman, Walter. *Nietzsche: Philosopher, Psychologist, Antichrist*, Princeton: Princeton University Press, 1974.

Kenny Anthony. *Descartes: A Study of His Philosophy*, New York: random House, 1968.

Press, 2005.
Philipse, Herman. *Heidegger's philosophy of Being: A Critical Interpretation***,** Princeton: Princeton University Press, 1998.
Randall, John Herman. *Aristotle*, New York: Columbia University Press, 1960.
Richardson, John. *Existential Epistemology: A Heideggerian Critique of the Cartesian Project*, Oxford: Clarendon Press, 1991.
Richardson, William J. *Heidegger: Through Phenomenology to Thought*. Den Haag: Martinus Nijhoff, 1963.
Ross, W.D. *Aristotle*, London: Methuen & Co., 1937.
Safranski, Rudiger. *Martin Heidegger between Good and Evil*, translated by Ewald Osers, Massachusetts: Harvard University Press, 1999.
Sallis, John. “Interpreting Truth”, in *Heidegger toward the Turn*, (ed.) James Risser, New York: State University of New York Press, 1999.
Sartre, Jean-Paul *Being and Nothingness*, translated by Hazel E, Barnes, London: Routledge, 1996.
Sluga, Hans D. *Heidegger's Crisis: Philosophy and Politics in Nazi Germany,* Cambridge: Harvard University Press, 1993.
Steiner, George. *Martin Heidegger*, with a new introduction, Chicago: Chicago University Press, 1989. Stenzel, Julius. *Plato's Method of Dialectic*, translated and edited by D. J. Allan, New York: Arno Press, 1973.
Thomson, Iain D. *Heidegger on Ontotheology*, Cambridge: Cambridge University Press, 2005.
Taylor, Charles. *Hegel*, Cambridge: Cambridge University Press, 1975.
Van Gogh, Vincent. *The Complete Letters of Vincent van Gogh*, Vol.1, New York: Graphic Society, 1959.
Victor, Farías. *Heidegger and Nazism*, edited with a foreword by Joseph Margolis and Tom Rockmore, translated by



Paul Burrell, Philadelphia: Temple University Press, 1989.
Wiegand, Petzet, Heinrich. *Encounters and Dialogues with Martin Heidegger, 1929-1976*, translated by Parvis Emad and Kenneth Maly, Chicago: University of Chicago Press, 1993.
Wolin, Richard. *Heidegger’s Children*, Princeton: Princeton University Press, 2001.
Young, Julian. *Heidegger’s Later Philosophy*, Cambridge: Cambridge University Press, 2002.
Young, Julian. *Heidegger, philosophy, Nazism,* Cambridge: Cambridge University Press, 1997.
Zimmerman, Michael E. *Heidegger’s Confrontation with Modernity: Technology, Politics, Art*, Bloomington: Indiana University Press, 1990.

## فەرهەنگۆک

**ئەپستمۆلۆجی** زاراوەیەکی یۆنانیە لە دووبەش پێکهاتووە: ئەپستمۆ(زانین) و لۆجی (زانست)، کەواتای زانستی زانین دەبەخشێت. ئەپستمۆلۆجی لقێکی فەلسەفەیەو لەچیەتی زانین دەکۆڵێتەوە.

**ئەنەلۆجی** شوبهاندن.

**ئەستۆ** ماتەر Matter

**ئەستویی** ماتەری .

**ئەندێشە** ڕامان، خەیاڵ، Imagination

**ئامێر** ئامراز، کەلوپەلی بەردەست.

**ئیشراقی** جۆرێك لەبیرکردنەوەی فەلسەفیانەیەشهابەدین سوهرەوەری(١١٥٣-١١٩٢) کەبە(المقتول) ناسراوە هێناوییەتە کایەوە.

**ئۆنتۆلۆجی** زاراوەیەکی یۆنانیە لەدوو بەش پێکهاتووە: ئۆنتۆ(بوون) و لۆجی(زانست)، کەواتای زانستی بوون دەبەخشێت. لقێکی فەلسەفەیەو لەواتای بوون دەکۆڵێتەوە.

**ئایینخواز** کەسێك ئایین بەسەرچاوەی ڕاستی و زانینی بەهاکان دانێت و شوێنی بکەوێت.

**ئۆنتۆ-تیۆلۆجی** زاراوەیەکی لێکدراوەلەدووبەش پێکهاتووە: ئۆنتۆ(بوون) و تیۆلۆجی (خواناسی).



بەوجۆرەمێتافیزیکەدەوترێت، کە بنەڕەتی بوون بەسەدەمی هۆشەکی و یەکەم بۆ بوون لەژوور هەموو هەبووەکانەوە دادەنێت و لەو باوەڕەدایە، ئەو سەدەمەغایەو مەبەستی بە بوون داوە. باشترین نموونە، بۆچوونە مێتافیزیکیەکەی ئەریستۆیە.

**ئاکار** Morality زۆرجار لەجێگەی ڕەوشت Ethics دادەنرێت، بەڵام جیاوازییەکی بنەڕەتی لەگەڵ ڕەوشتدا هەیە. هەرچەندە ئاکار و ڕەوشت لە چیەتی بەهاکانی، وەکو چاکەو بەختەوەری و ...هید. دەکۆڵنەوە لەڕەوشتدا ئەم بەهایانە لەدەرەوەی ویستی تاکەکاندا دەمەزرێنراون. بۆ ئاکار بەهاکان ویستی تاکەکانە.

**ئاگامەندی ڕەها** ئاگامەندی بێسنوور و هەمەکی.

**بابەت** Object

**بار** کاتیگۆری، دەخرێتە پاڵ بارهەڵگر، بۆ نموونە (سوقرات فەیلەسوفە) بارهەڵگرە و فەیلەسوفیش بارە.

بارهەڵگر ناوەڕۆک لەلۆجیکی ئەرستۆدا، کە بەرێگەی بارەکەیەوە باشتر دەناسرێت.

**بایۆلۆجی** زاراوەیەکی یۆنانیەلەدووبەش پێکگاتووە: بایۆ(ژیان) و لۆجی (زانست)، واتای زانستی ژیان یان ژیانناسی دەبەخشێت.

**بوون** بوونی گشتگر، بنەڕەتی هەموو شتێکی هەبوو، بوونێك کەبوونی هەموو شتێکی لەسەر ڕاوەستاوەو خۆی پێویستی بەچی دیکە بۆ بوونی نیە.
**بوون- لەناو – جیهان** پێشەکی ئۆنتۆلۆجی بوونی مرۆڤە و لە هەموو پێشمەرجەکانی دیکە هەمەکی و لە پێشترە.
**بوون – لەناو- شوێن** پێشمەرجێکی بوونی مرۆڤەو لەبوون لەناو جیهانەوە پەیدا دەبێت.
**بوونی دیاردە** بنەڕەتی دیاردە یان ئەو بناخەیەی دیاردەکەی لەسەر دامەزراوە.
**بوونی ڕەها** بوونی بێسنوور و تەواوکۆ و خۆبژێو.
**بێبڕوا** ڕەتدانەوەی بوونی سەدەمی یەکەم بۆ جیهان و بوونی مرۆڤ.
**بیرەهەمەکییەکان** مەبەست لەفۆرمەبەرزەکانی جیهانی بەرزی ئەفلاتونە.
**بیردۆزە** تیوری ، دیمانە.
**بیری زگماکی** جۆرێکەلەبیرۆکەیان زانین بەدیدی دێکارت مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێتە جیهانەوەو سەدەمی هۆشەکی لەناو هۆشی مرۆڤدا دایناوە.
**بێهودە** بێکەڵك و لەواتابەدەر.
بنەڕەتی لە بنەڕەت بەدەر مەبەست بوونی گشتگرە، کە دەبێت بە بنەڕەتی هەموو شتێک و خۆی پێویستی بە بنەڕەت نیە.



**بەڵگەنەویست** دیاردەیەك هێندەئاشکرابێت پێویستی بەبەڵگەو سەلماندنی بۆ بوونی نەوێت.
**پارادۆکس** کێشەیەك ڕەتدانەوەی مەحاڵ بێت. بۆ نموونە، ناتوانین بڵێین لاکێشە خڕە.
**پیرۆز** دەخرێتەپاڵ بوونێکی لەکەمووکورتی بەدەر یان بوونێك لەهەموو لایەنێکەوە پڕو تەواوبێت .
**پەیوەندی زەروری** پەیوەندی نەگۆڕ، بۆ نموونە، ئاگر بەبێ گەرمایی نیە. پەیوەندی نێوان ئاگرو گەرمایی نەگۆڕ و زەرورییە.
**پەیوەندی پێویست** پەیوەندییەکی دیالێکتیکی یەلەنێوان دوو هەبووی جیاوازدا، وەکو هۆ و ئاکام.
**پەیوەندی دیالێکتیکی** پەیوەندی نێوان بابەت و دژەبابەت، لە ڕاوەستانیان بەرانبەری یەکدی بەبێ یەکدی نابن. پەیوەندییەکی پێویست، کەنەتوانین بەپێچەوانەوە بیری لێبکەینەوە.
**پەیوەندی ناوەکی** پەیوەندییەك لەدەرەوەدانەمەزرێ.
**پێشتر** شتێك یان هۆکارێك پاش بوونی ئێمەبکەوێت، یان لەپێش ئەزموونی هەستەکیمانەوە سەری هەڵدابێت و پێویستی بەو ئەزموونەنەبێت.
**پێشمەرجی ئەپستمرۆلۆجی** ئەو پێشمەرجەپێویستانەن، کەبەبێ ئەوان زانین پەیدا ناکرێت.

**تازەگەری** بەو قۆناخە فەلسەفیە دادەنرێت لەگەڵ بۆچوونەکانی ڕێنە دێکارت (١٥٩٦-١٦٥٠) دەستپێدەکات.
**ترانسێندنتاڵ** بەرز، لەژوور ئاگامەندییەوە.
**تراجیدیا** جۆرێکە لە شانۆگەری، بۆ یەکەمجار یۆنانیەکان دایانهێناوە و لەمەڕ ناخۆشی بڕانەوەی ژیان دەدوێت. تراجیدیا زاراوەیەکی یۆنانی یەو لەو زمانەدا واتای (گۆرانی بزن) دەبەخشێت. ئەمەش لەو نەریتەوە هاتووە، کەیۆنانیەکان (بزن) یان بۆ دایۆنیس (خوای سەما و مۆسیقا و مەستبوون) کردووە بەقوربانی و سەریانبڕیوە.
**تیلۆ** *Teleo*وشەیەکی یۆنانیەواتەکۆتایی یان مەبەست.
**تێو- ئۆنتۆلۆجی** ئۆنتۆلۆجیەک خۆی لەسەر بناخەی سەدەمی هۆشەکی و (غایە) دەر بەبوون دادەمەزرێنێ.
**ترس** هەستکردنە بەلاوازی و بێدەسەڵاتی لەئاستی هێزێکی هەرەشەکەردا.
**جیهانگەری** بوون-لەناو جیهاندا. شێوازێکی تێگەیشتنەلەپێشمەرجی بوون-لەناو جیهاندا.
**جیهانی ئایدیاڵ** جیهانی فۆرمەهەمەکیەکانی مێتافیزیکی ئەفلاتون.
**جیهانی دەرەکی** جیهانی دەرەوەی بیرکردنەوە، داکەوت.



**جیهانی ناوەوە** مەبەست لەجیهانی بیرکردنەوەو ئەندێشەیە، نەك ناوەڕۆکێکی گیانەکی.
**حەدەس** دەرککردنی ڕاستەوخۆ بەبابەتی دەرەوەی ئاگامەندی.
**خۆ** زات Subject
**خۆی بەرز** خۆیەك لەژوور ئەزموونەهەستەکیەکانەوەیەکێتی لەنێوانیان دروست دەکات. خۆیەکەبەڕێگەی ئەزموونی هەستەکیەوەناناسرێت.
**خۆ پێزی** خۆ-خۆیی.
**دەرچوون** لەم توێژینەوەیەدا بۆ ڕەتدانەوەو ڕەتکردنی دۆگمای نێو ئەشکەوت بەکارمهێناوە. دەرچوون لەو ئەشکەوتە ڕەتدانەوەو ڕەتکردنی دۆگما باوەکەیەتی و ڕەهەندێکی (شوێن) یی نیە.
**دابڕانی سەرمەدی** مردن، لەناوچوونێکی هەمیشەیی و بێگەڕانەوە.
**دازاین** زاراوەیەکی ئەڵمانیە Dasein واتە بوون-لێرە. مارتن هایدیگەر بۆ بوونی مرۆڤ بەکاریهێناوە.
**داهێنان** پەلکێشکردنی بوونێك لەنەبوونەوە.
**دووەلیست** بۆچوونێکی مێتافیزیکییەباوەڕ بەبوونی دوو ڕاستەقینەی هاوتەراز دەهێنێت، کە هیچیان پێویستی بەوی دیکەبۆ بوونی بەبێت.
**دیاردەی بوون** خۆ دەرخستنی (بوون) لەشێوازێکدا.

**دیالێکتیك** زاراوەیەکی یۆنانیەبۆ یەکەمجار زینۆی ئیلیاو سوکرات و ئەفلاتون بەکاریانهێناوە. هیگل و مارکس بەرەوپێشەوەیان بردووەو، وەکو شێوە لۆجیك داکەوت و گۆڕانکارییەکانی نێو داکەوتیان لەسەر ڕاڤەکردووە.

**ڕەتدانەوە** (نەفی). هێزی دیالێکتیکیە و گۆڕانکارییەکان ئافەرید دەکات.

**ڕەسەن** بوونێکی خۆ ناس و خاوەن خۆ.

**ڕسکاو** بوونێك لە خۆیەوە پەیدابووبێت.

**ڕادیکاڵ** بنەڕەت، بناخە، بنەما.

**ڕاستی بەرز** ڕاستی ترانسێندنتاڵ. ڕاستیەك لەژوور ئەزموونی هەستەکییەوە.

**ڕاستی ڕەها** ڕاستیەکی هەرگیز نەگۆڕ.

**ڕووداو** لەلۆجیکی ئەریستۆدا خسڵەتێکی ناوەڕۆکە، کەناوەڕۆك دەتوانێت بەبێ ئەو بمێنێتەوەو بوونی بەردەوام بێت. مرۆڤی پێست ڕەش هەیە. بەڵام پێست ڕەشی ڕووداوە، ئەگەر مرۆڤ پێستی ڕەشیش نەبێت هێشتا مرۆڤە.

**ڕووداوگەری** بۆچونێکی مێتافیزیکییە بنەڕەتی پێویست بۆ ڕووداوەکان ڕەت دەداتەوە.

**ڕێکەوت** بێمەبەست.

**زانینی هەستەکی** زانینێك بەڕێگەی هەستکردنەوەپەیدادەبێت.



**زانینی هۆشەکی** زانینێك بەڕێگەی هۆشەوەپەیدا دەبێت و هەمەکییە.

**سەدەمی هۆشەکی** سەدەمی یەکەم لەفەلسەفەی ئەریستۆدا.

**سەدەمی یەکەم** هۆکار یان بنووسی یەکەم. لەفەلسەفەی ئەریستۆدا ئەو بوونەیە، کەلەوەوە جوڵان و گۆڕانکارییەکان لەبووندا دەکەونەگەڕ بەڵام خۆی جوڵان و گۆڕانکاری تێدا ڕوونادات.

**سەرمەدی** هەمیشەیی .

**سوپەرمان** مرۆڤی بەرز، ئامانجی مرۆڤە لەفەلسەفەی نیتشەدا.

**سێبەری خوا** پاسەواری مێتافیزیکی ڕووناکبینە، کەبەدیدی نیتشەپاش ڕەتدانەوەی ئەو شێوە مێتافیزیکییە دەمێنێتەوە.

**شت** یەککگرتنی فۆرم و ناوەڕۆك.

**شیکردنەوە** وردکردنەوەی واتای چەمکێك بۆ لایەنەکانی.

**عیرفان** زانینی سۆفیگەرانەبۆ ناسینی ڕاستی (حەقیقەی).

**فۆرم** شێوە.

**فۆرمەلیست** شێوەگەرایەتی، بایەخدان بەشێوەو بایەخنەدان بەناوەڕۆك.

**فینۆمینە** دیاردە، خۆدەرخستنی بوون. ئەو لایەنەی بوونەخۆی دەخاتەبەر ڕۆشنایی زانین.
**فینۆمینۆلۆجی** دیاردەگەری. ئەو میتۆدە فەلسەفییەیە ئەدمۆند هۆسرڵ بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر واتای دیاردەی بوون دایمەزراند.
**کارەکی** پڕاکتیك سەقامگیرکردنی بیردۆزەبۆ پێکهێنانی گۆڕانکارییەکان.
**کلتووری بازاڕی** نەریتی باوو، کەزۆرینەی کەسانی نێو کۆمەڵ شوێنی دەکەون.
**کۆیایی مێژوو** گەیشتن بەدوا قۆناخی پێشکەوتن لەمێژوودا. بۆچوونێکی هیگڵیانەیەو مارکسیانەیە. بەدیدی ئەم دوو فەیلەسوفەمێژوو لەئەنجامی گۆڕانکارییە دیالێکتیکەکەدا دەگاتە قۆناخێك، کەهەموو ناکۆکیەکانی تێدا وون دەبێ و لەوە زیاتر پێشناکەوێت.
**کۆجیتۆ** گوتە بەڵگە نەویستەکەی دێکارت (من بیردەکەمەوە کەوابوو من هەم.)
**گومانکاری** گومانایەتی، دڵنیا نەبوون لەڕاستی.
**گونجاو** پەیدابوو یان پەیدا کراو، داهێنراو. بۆ نموونە پڕۆژەکانی بوون گونجاون.
**گۆڕانی ڕادیکاڵ** گۆڕانی بنەڕەتی.
**مردن** پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجیە بۆ بوونی مرۆڤ. کۆتایی هەموو پڕۆژەکانی بوونە.



**مێتافیزیك** زاراوەیەکی یۆنانیە لەدوو بەش پێکهاتووە: مێتا (پاش) و فیزیك (سروشت)، کەواتای پاش یان ئەودیو سروشت دەبەخشێت. (ئەندرۆنیکۆس) ی شاگردی ئەریستۆ، کە نووسراوەکانی مامۆستاکەی کۆدەکردەوەو پۆلێنی دەکردن بۆ یەکەم جار ئەم زاراوەیەی بۆ ئەو نووسراوانەی ئەرستۆ دانا، کەلەڕاستی ئەودیو سروشت و جیهانی ئەستووەوە دەکۆڵنەوە. پاش ئەمە، زاراوەکەجێگەی خۆی گرت و بەو لقەی فەلسەفە دادەنرێت، کەبەدوای بنەڕەتی بوون و چیەتی ئەو بنەڕەتەدا دەگەڕێت.
**مێتافور** شوبهاندن.
**مێتاگۆتار** (مێتا) وشەیەکی یۆنانیە واتای (پاش یان ئەودیو) دەبەخشێت. مێتاگۆتار بۆ ئەو بیردۆزەو بۆچوونانە بەکاردێت، کەهەمەکین و لێکدانەوەیان بۆ هەموو ڕووداو و دیاردەیەك هەیە بەبێ ئەوەی جیاوازییەکانی نێوان ئەم دیاردەو ڕووداوانە بخوێننەوە.
**منی بەرز** لەبیردۆزی دەرونشیکاری فرۆیدا لایەنێکی (خۆ) یەو خاوەنی دەستەڵاتی ویژدانی و بەها بەرزەکانە.
**نەبوون** هیچ .
**ناڕەسەن** بوونێکی خۆنەناس و نامۆ، بوونێکی داگیرکراو.

**نادیار** شاراوە، نەناسراو یان بوونێك زانینمان لەبارەیەوەنەبێت.

**نازانمکاری** فێرگەیەکی مێتافیزیکییەو بانگەشەی نەزانینی ڕاستییە دوورەکانی بوون دەکات.

**ناسنامە** خسڵەتێك یان چەند خسلەتێکی تایبەت بەبوونێك، کەبەوا یان بەواندا بناسرێتەوە.

**ناچارەکی** فێرگەیەکی بوون و پڕۆژەکانی بوونی مرۆڤ بە هۆ دەرەکییەکانەوە دەبەستێتەوەو سەربەستی و دەستەڵاتی داهێنانی مرۆڤ ڕەتدەداتەوە. دووجۆر ناچارەکی هەن: گیانەکی و ماتەریاڵی.

**ناچارەیی** یان **ناچارەکی** ڕارەوێکی مێتافیزیکی و ئاکارییە ڕووداوەکان یان گۆڕانکارییەکانی ناو مێژوو بەدەسەڵاتێکی دەرەکییەوە بێجگە لە دەسەڵاتی مرۆڤ دەبەستێتەوە.

**نێرسیست** زاراوەیەکی یۆنانیەو لەو ئەفسانەیەوە هاتووە، کەگوایە (نێرسیس) لاوێکی جوان بووەو خۆی خۆشویستوەو ئاوەڕی لە کچە هەرزەکارەکانی دەوروبەری نەداوەتەوە. کچەکانیش داوایان لەخوا کردووەسزای بدات. ڕۆژێك، کەلەبەر ئاوی گۆمێکدا تەماشای خۆی دەکات دەکەوێتە نێو گۆمەکەوەو دەخنکێت و لاشەکەشی دەبێت بەگوڵی نێرگس و لەئاوەکەوە دێتەدەرێ. ئەم زاراوەیەلە سایکۆلۆجیدا بۆ کەسێکی خۆویست بەکاردەهێنرێت.



**ناوەڕۆکی گیانەکی** ناوەڕۆکێکی لەئەستو بەدەرە لەفەلسەفەی دێکارتدا سەرچاوەو بنەرەتی (خۆ) ی مرۆڤە. ناوەڕۆکی گیانەکی بەگوێرەی بۆچوونەکانی دێکارت خۆیەکی سەربەخۆ و خۆبژێوو نەگۆڕە.

**ناوەڕۆکی پێدراو** ناوەڕۆکێك مرۆڤ خۆی داینەهێنابێت.

**نامۆیی** نارەسەنی، بوونێکی داگیرکراو، خۆ نەناس.

**ناماقوڵ** بێ بناخە، بێ مەبەست، شتێك هۆش نەیسەلمێنێ.

**نۆمینە** بوون-لەناو-خۆی، جۆرێك بوونە بە بیروڕای کانت لە ژوور بوونی ئێمەوەیە و سەرچاوەی هەموو شتێکە.

**هەندەکی** Particular

**هەمەکی** Universal

**هەموو** Total هەمەلایەنی، هەمووایوتی Totality

**هەبوو** هەیەی بوونێکی پڕ و خاوە ن چیەتیەکی نەگۆڕ.

**هاوجنسخواز** Homosexuality حەزو ئارەزووی جوتبوونەلەگەڵ هاوجنسدا. بۆ نموونە، نێرینە لەگەڵ نێرینەو مێینە لەگەڵ مێینەدا.

**هاوجنسنەخواز** Heterosexuality حەزو ئارەزووی جوتبوونە لەگەڵ ناهاوجنسدا، بۆ نموونە، نێرینە لەگەڵ مێینەو مێینە لەگەڵ نێرینەدا.

**هەڵوەشاندنەوە** میتۆدێکەهایدیگەر لەتوێژینەوەکانیدا بەتایبەتی لەسەر مێتافیزیك بەکاریهێناوەو لای

هەندێك لەبیریارانی پاش تازەگەری ڕۆڵێکی گرنگی هەیە. (Deconstruction یان *Destruktion*)

**هۆ** سەدەم.

**هیچگەرایەتی** بۆ چوونێکی ئۆنتۆلۆجیە، کەبنەڕەتی بوون بە(هیچ) دادەنێت. لەم توێژینەوەیەدا باسی دوو جۆر هیچگەرایەتیم کردووە: هیچگەرایەتی ڕەشبین و ڕووناکبین، یان هیچگەرایەتی ڕەشبین و بەرنامەگەری.

**هیچگەرایەتی بەرنامەگەری** زاراوەیەکە بۆ هیچگەرایەتی نێو فەلسەفەی نیتشە بەکارمهێناوە.

**هیچگەرایەتی کلاسیکی** زاراوەیەکە مارتن هایدیگەر بۆ هیچگەرایەتی نێو فەلسەفەی نیتشە بەکاریهێناوە.

**ویستی هێز** ناوەڕۆکی بوونە لە فەلسەفەی نیتشەدا.

**ویستی ژیان** ناوەڕۆکی بوونە لە فەلسەفەی شۆپنهاوەردا.

**یەکانەکی** بۆچوونێکی مێتافیزیکییە باوەڕ بە بوونی یەک جۆر ڕاستەقینە دەهێنێت.

**یۆتۆپیا** زاراوەیەکی یۆنانیەلەدوو بەش پێکهاتووە: (*ou*) **هیچ و** (*topos*) **جێگا**، کەواتای هیچ جێگا یان شوێنێك دەبەخشێت، ئەم زاراوەیەبۆ یەکەمجار تۆماس مور لەساڵی ١٥١٦ بەکاریهێنا. بەگشتی، یۆتۆپیا بۆ ئەو کۆمەڵگایە دادەنرێت، کەهیچ کەمووکورتیەکی نیەو کۆمەڵگایەکی گەش و پەرەسەندووە، کە هێشتا پەیدانەبووەیان لەهیچ شوێنێکدا نیەو دانەمەزرێنراوە.



# ئیندێکس

# ناوەڕۆک